بسم الله الرحمن الرحيم

# میراتی و ڕاسپاردن و مافی گوێزرانەوە
# لە فیقهی بەراوردکاری ئیسلامی و یاسادا

# میراتی و

## ڕاسپاردن و مافی گوێزرانەوە

### لە فیقهی بەراوردکاری ئیسلامی و یاسادا


نووسینی

**دکتۆر مصطفی زەڵمی**

وەرگێڕانی

ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

# کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە شەریعەت و یاسادا

سەرپەرشتیاری پرۆژە
ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد

---

# أحكام الميراث والوصية وحق الإنتقال

# میراتی و راسپاردن و مافی گوێزرانەوە


نووسینی : دکتۆر مصطفی زەڵمی
وەرگێرانی : ڕێدار ڕەئوف ئەحمەد
پێداچوونەوەی : توفیق کەریم
نەخشەسازی : جمعه صدیق کاکه
نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠١٧

نرخی هەر بیست و شەش بەرگ
٢٥٠,٠٠٠ دینار


پرۆژەی وەرگێرانی
کۆبەرهەمی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە
شەریعەت و یاسادا




لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧٤٤ ) ساڵی ٢٠١٦ی پێدراوە

## ناوەرۆک

# بەشی یەکەم

## حوکمەکانی میراتی

﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ
وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ
ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ
نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ۝٧ ﴾

سورة النساء/٧

(من ترك مالاً أو حقا فلورثته)

رواه أبو داود

# پێشەکی

میراتی سیستەمێکی سروشتی بەدەمەوەهاتنی پێویستیەکانی ئەو ویستە مرۆییانەیە کە بەخۆویستی حەز بەوە دەکات لێجێماوە ماددیو مەعنەویەکانی لەپاش خۆی بگوازرێتەوە بۆ نەوەکانی لە کورو کچو وەچەو کەسە نزیکەکانی، لەوانەیە سەرچاوەی ئەمە لەسۆنگەی هەستکردنیەوە بێت کەئەوانە لەپاش خۆی درێژکراوەی ژیانی ئەون، ئەم ئارەزووە سروشتیەش بەدرێژایی مێژوو ئێستاشی لەگەڵدا بێت گەرچی لەشێوازی رێکخستنیدا وەك یەك نەبووبێت بەڵام لەیاساو رێسا جیاوازەکاندا بوونی هەبووە.

لە نێو هەموو ئەو یاسایانەدا شەریعەتی ئیسلامی بەوە جودا دەکرێتەوە کە بەوردی بنەماکانی میراتی رێکخستوەو رەچاوی هۆکارە ویستیەکانو پێویستیە سروشتیە پێکهێنەرەکانی هەردوو رەگەزەکەی کردووە، (نێرو مێ) لەبەر رۆشنایی ئەو ئەرکو مافانەی بۆیان دیاری کراوەو، ئەو بڕە جیاوازیەی تێبینی دەکرێتو، یەکسان نەکردنی.ژمارەیی لەمیراتی نێرو مێدا لەشەریعەتی ئیسلامدا بۆ دانایی هاوسەنگی راستەقینە دەگەڕێتەوە کە تێیدا رەچاوی هەموو ئەو شتانە دەکات کەجێگەی بایەخنو دەبێتە هۆی هێنانە دی دادپەروەری بابەتیانە.

لەبەر گرنگی سیستەمی خێزانو پتەوکردنی بە بنەما شەرعیە بێگەردە پەیوەستەکانی بەتینکردنو هاریکاریو یارمەتیدانی نێوان خۆیان: قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی تێرو تەسەل -بەتایبەتی لەبابەتی میراتی- دواوە، نەك بەشێوەیەکی گشتی وەك ئەوەی زۆرجار لە خستنەرووی قورئانی پیرۆزدا دەبینرێت، لەگەڵ ئەوەی

قورئانی پیرۆزو فەرمودەکانی پێغەمبەر بنەما پێویستەکانی میراتیان رونکردۆتەوە، هاوکات لەو بابەتانەی کە ئیجتیهاد هەڵدەگرێت لەکاروانی ئیجتیهادەکانی زانایانی شەریعەتدا بە پێی تێگەیشتنیان بابەت گەلێکی زۆر کۆبووتەوە کەبەسەر مەزهەبو ئیجتیهادەکاندا دابەش بووە.

ئێمەش ئەرکی سەرشانمانە هێڵە گشتیەکانی ئەم بنەمایەو، روکارە گشتیەکانی ئەو ئیجتیهادە فیقهییانەی کە زانا پایەبەرزەکان بەمەزهەبە جیاوازەکانیانەوە بۆمانیان بەجێ هێشتوە بۆ قوتابیو خوێندکارانی کۆلێژەکانی یاساو شەریعەتو کەسانی دیکەش روون بکەینەوە، بەو ئەندازەیەی کە بتوانن لەیاسای باری کەسیی عێراقی بەرکار کەلە شەریعەتی ئیسلامیەوە سەرچاوەی گرتووە تێ بگەن، لەگەڵ دەرهێنانی بۆچوونی فیقهی لە کتێبە جیاوەزەکان لەو بابەتانەی کە یاسادانەر لەو یاسایەی باسمان کرد بێدەنگ بووە لێی.

بەرنامەمان لەمەدا بەرنامەیەکی تایبەتە، بنەماکەی رەچاوکردنی ریزبەندی ئاسایی گوێزرانەوەی لێجێماوە –ترکە–، بەجۆرێك ئەوەی سەرەتا دەیخەینە روو رێخۆشکار بێت بۆ ئەوەی دوای خۆی، ئەوەی دواتریش تەواوکار بێت بۆ ئەوەی پێش خۆی، بۆ ئەمەش بابەتەکانمان بەسەر سێ دەروازەدا دابەش کردووە:

**دەروازەی یەکەم: پێشەکیەکانی گوێزرانەوەی لێجێماو بۆ میراتگران.**

**دەروازەی دووەم: میراتگرانو چۆنیەتی میراتگرییان.**

**دەروازەی سێیەم: چۆنیەتی دابەشکردنی لێجێماوەکان.**

وەها باشە بەر لەچوونە نێو بابەتەکە بۆ ئاسانکاریو باشتر تێگەیشتن پێناسەی هەندێ زاراوەو هێمای فیقهی بکەین کەتایبەتن بە زانستی میرات.

**زاراوه شەرعیەکانی زانستی میرات:**

مەبەست لەهەریەك لەم زاراوانە ئەو واتایەیە کە بەرانبەری نوسراوە[1]:

میرات (المیراث): جێگرتنەوەیەکی ناچاریی میراتگرە بۆ ماڵی میراتدەرەکەی یان مافێکە دەکرێت شوێنگرەوە (خلافە)ی هەبێت.

میراتگر (الوارث): ئەو کەسەیە کە شایستەی لێجێماوی کۆچکردووەکەیە هەمووی یان هەندێکی، لەرێگەی پەیوەندی خزمایەتی یان هاوسەرگیرێتی یان ویلایەتی گشتی— وەك لە دەوڵەتدا هەیە—.

میراتلێگیراو (المورث): کۆچکردووەکەیە کەماڵ یان مافێکی لێجێماوە کە دەکرێت تێیدا شوێنی بگیرێتەوە.

لێجێماو (الموروث— الترکة): بریتیە لەوەی پاش مردوو لەماڵ یان مافێك بەجێ دەمێنێت کەدەتواندرێت تێیدا شوێنی بگیرێتەوە.

هۆکار (السبب): بوونی دەبێتە هۆی پێویست بوونی حوکمەکەی، بەنەمانیشی حوکمەکەی نامێنێت(هۆکارەکانی میراتیش دوانن— خزمایەتی‌و هاوسەرگیریی دروست).

بەربەست (المانع): لەکاتی بوونیدا حوکمەکە هۆکارەکەی ناگرێتەوە (میراتگر هەستێت بە کوشتنی میرات لێگیراوەکەی‌و، جیاوازی ئاینی نێوانیان لە بەربەستەکانی میرات لێگرتنن).

پشك (الفرض): بریتیە لەو پشکەی لێجێماو بۆ میراتگر دیاری کراوە، کۆیەکەشی (الفروض) پشکەکانە، وەك نیوەو سێ یەك‌و چوار یەك‌و شەش یەك....

خاوەن پشك (صاحب الفرض): بریتیە لەو میراتگرەی کە بەپێی شەرع پشکەکەی لە لێجێماودا دیاری کراوە، کۆیەکەشی (اصحاب الفروض)ە واتە خاوەن

---

[1] ریزبەندی ئەم زاراوانە بە پێی ریزبەندی هاتنیان لەبابەتەکەدا کراوە بەبێ رەچاوکردنی ریزبەندیان بەپێی پیتە ئەبجەدیەکان.

پشکەکان.

پشت (العاصب): بریتیە لەو میراتگرەی لەشەرعدا بڕی پشکەکەی لەلێجێماودا دیاری نەکراوە.

پشت خۆی –خزمی باوك– (العاصب بنفسە): بریتیە لەهەر نێرینەیەك کە لەگەیشتنەوەی بەکۆچکردووەکە مێینەیەك نەبێت لەو نێوانەداو پێویستی بە ڕێی خزمایەتی جگە لەخۆی نەبێت (وەك کوڕو کوڕی کوڕو کوڕی دایكو باوکیو کوڕەکەی).

بەکەسیتر بۆتە پشت (العاصب بالغیر): بریتیە لەهەر مێینەیەکی خاوەن بەشی دیاریکراو کە بۆ خزمایەتیەکەی پێویستی بەکەسی ترە (وەك کچ بەهۆی کوڕەوەو خوشك بەهۆی براوە).

لەگەڵ کەسی تر پشتە (العاصب مع الغیر): بریتیە لەهەر مێینەیەکی خاوەن بەش کەبۆ خزمایەتیەکەی پێویستی بە کەسی تر هەیەو بەشدار نابن لەخزمایەتیەکەدا لەگەڵی (وەك خوشکی باوكو دایکی یان باوکی گەر لەگەڵ کچی کۆچکردودا یان کچی کوڕیدا بەیەکەوە کۆبوونەوە لای زۆرینەی زانایان –جمهور الفقهاء–.

خزمی سکیی (ذو الارحام): بریتیە لەهەموو میراتگرێك کە هۆی خزمایەتیەکەی پشت نیەو خاوەن پشکی دیاری کراویش نیە، کۆیەکەی خزمە سکەکان (ذوو الارحام)ە وەك خاڵ و پور –خوشکی باوك–و منداڵەکانیان.

باپیرەی پشتیی (الجد العصبی)[1]: بریتیە لەو باپیرەی کەلەگەیشتنەوەی بە مردووەکە هیچ مێینەیەك نەکەوێتە نێوانیان، وەك باوکی باوكو بەرەو سەرتر.

---

[1] لە کتێبە فیقهیەکاندا دەستەواژەی باپیرەی ڕاستەقینە –الجد الصحیح– بەکارهێنراوە، پێشنیار دەکەم ئەم دەستەواژە بەلاوە بنرێت، چونکە هەموو باپیرەیەکی شەرعی باپیرەی ڕاستەقینەیە ئیدی لەسەری باوەکەوە بێت یان لە سەری دایکەوە .

باپیرەی سکیی (الجد الرحمی)[1]: بریتیە لەو باپیرەی کە لەگەیشتنەوەی خزمایەتیەکەی بە مردووەکە مێینەیەك دەکەوێتە نێوانیان وەك باوکی دایكو بەرەو سەرتر.

داپیرەی باوکیی (الجدة الابویة)[2]: بریتیە لەو داپیرەی کە لەگەیشتنەوەی خزمایەتیەکەی بە مردووەکە باپیرەیەکی خزمی سکیی–الجد الرحمی– ناکەوێتە نێوانیان، وەك دایکی باوك.

داپیرەی سکیی (الجدة الرحمیة)[3]: بریتیە لەو داپیرەی کە لەگەیشتنەوەی بە مردووەکە باپیرەیەکی سکیی –الجد الرحمی– دەکەوێتە نێوانیان، وەك دایکی باوکی دایك.

خوێش (الکلالة): بریتیە لەخزمانی دەوروبەری–حواشی– و میرات وەرگرتن لە ڕێگەی برایەتیەوە (نەك لە ڕێی باوكو کوڕیەوە) بە شێوەیەکی تایبەت براوو خوشکی دایکی.

خوشکی دایكو باوکیی (اخت الشقیقة): بریتیە لەخوشکی مردووەکە کە دایكو باوکیان یەکە.

خوشکی باوکیی: بریتیە لەو خوشکەی کەلەگەڵ مردووەکە باوکیان یەکەو دایکیان جودایە.

---

[1] لە کتێبە فیقهیەکاندا دەستەواژەی باپیرەی ناڕاستەقینە–الجد الفاسد– بەکار هێنراوە، ئەمەش دەستەواژەیەکی نابەجێ یە پێویستە بەتەولوی بسڕێتەوە.

[2] لەکتێبە فیقهیەکاندا دەستەواژەی داپیرەی ڕاستەقینە –الجدة الصحیحة–ی بۆ بەکارهێراوە، باشتر وایە ئەمە بەکار نەهێنرێت چونکە هەموو داپیرەیەکی شەرعی ڕاستە.

[3] لە کتێبە فیقهیەکاندا بە داپیرەی نا ڕاستەقینە –الجده الفاسده– هاتووە زۆر پێویستە ئەم دەستەواژە پتورکاوە نەمێنێت چونکە ئەم ئاینە پیرۆزە ڕازی نیە بەبەکارهێنانی ئەم جۆرە ناوە ئیدی مەبەستی بەکارهێنەری هەرچی بێت.

خوشکی دایکیی: بریتیه لەو خوشکەی کەلەگەڵ مردووەکە دایکیان یەکەو باوکیان جودایە.

زۆڵ -بیژی- (ولد الزنا): بریتیە لەو منداڵەی بنەچەکەی بۆ دایك و باوکێك نەسەلمێندرێت کە گرێبەستێکی هاوسەرگیری دروست لەنێوانیاندا هەبێت.

منداڵی نەفرین(ولد اللعان): بریتیە لەو منداڵەی کەلەنێو ماڵی هاوسەرێتیدا لەدایك بووە، بەڵام مێردەکە رەتی دەکاتەوە هی ئەو بێت، دادوەرەیش بڕیار بەوە بدات کە لەو باوکە نیە.

بنچینەی بابەتەکە (اصل المسألة): بریتیە لە بچوکترین ژمارە کە بتوانرێت پشکەکانی میراتگرانی لێ وەربگیرێت بەبێ ئەوەی هیچی لێ بمێنێتەوە.

راستکردنەوەی بابەتەکە (تصحیح المسألة): بریتیە لە گۆڕینی بنچینەی بابەتەکە بە ژمارەیەکی دیکە، ئیدی زیاتر بێت یان کەمتر، بەجۆرێك کە بتوانرێت پشکەکانی میراتگرانی پێ دابەش بکرێت بە بێ ئەوەی هیچی لێ بمێنێتەوە.

لقی میراتگر (فرع الوارث): لای زۆرینەی زانایان بریتیە لە کوڕی کۆچکردووەکەو کچیو منداڵەکانی کوڕەکەیو بەرەو خوارتر بەکوڕو کچەوە.

لای زانایانی مەزهەبی ئیمامیش جگە لەوانە منداڵەکانی کچەکەشی و بەرەو خوارتریشو منداڵەکانی کچی کوڕو خوارتریش دەگرێتەوە.

بەرز کردنەوە (العول): بریتیە لە زیادە لە ژمارەی پشکەکانداو کەمهێنان لەبڕەکەیدا (لەکاتی پێویستدا).

گێڕانەوە (الرد): پێچەوانەی بەرزکردنەوە -العول-ە، کەمهێنانە لە ژمارەی پشکەکانو زۆری لە بڕەکەیاندا.

بەشبڕ (الحجب): بریتیە لە رێگریکردنی میراتگرێك لەوەی میراتگرێکی تر میراتی بەر بکەوێت بە هۆی بەهێزی نزیکایەتی ئەمەوە، وەك رێگری برا بکرێت میراتی لە برای بەر کەوێت لەبەر ئەوەی براکەی کوڕی هەیە، یان بەهۆی نغرۆبوونی- استغراق- خاوەن پشکە دیاریکراوەکان لە لێجێماوەکەدا.

بەشبڕی تەواو (حجب الحرمان): بریتیە لەوەی هیچی لە میراتەکە پێ نەبڕێت.

بەشبڕی ناتەواو (حجب النقصان): بریتیە لەوەی میراتگرێك بەربەستی لێ بکرێت کە باشترین بەشی خۆی پێ ببڕێت[1].

بەشبڕان بە نغرۆبوون (الحجب بالاستغراق): بریتیە لە بێ بەشکردنی میراتگری پشت بەهۆی نغرۆبوون لەگەڵ خاوەن پشکە دیاریکراوەکانی لێجێماوەکە.[2]

بەشبڕکراو (المحجوب): بریتیە لەو میراتگرەی کەبەهۆی میراتگرێکی دیکەی بەهێزتر لەم لە رووی خزمایەتیەوە یان بەهۆی نغرۆبوونەوە لەمیراتی بەشی پێ نادرێت.

بێبەریکردن (الحرمان)[3]: بریتیە لە بێ بەریکردنی کەسێك لە بەرکەوتنی میراتی هەرچەندە هۆکاری هاوسەرگیری‌وخزمایەتی بوونی هەبێت، ئەمەش بەهۆی هەبوونی بەربەستێکەوە لە بەربەستەکانی میراتی بەرکەوتن، وەك کوشتنی میرات لێگیراو یان جیاوازی ئاین.

---

[1] وەك ئەوەی رێگری دایك بکرێت لەبری سێ یەك لە میراتەکە شەش یەکی پێ ببڕێت، یان بەر لێ گرتنی مێرد لەوەی لەبری نیوە چوار یەکی پێ ببڕێت، یان رێگری ژن لەبری چوار یەك هەشت یەکی پێ ببڕێت.

[2] گەر ئافرەتێك مرد لەپاش خۆی مێردەکەی‌و خوشکێکی دایك‌و باوکی و برایەکی باوکی لەپاش بەجێما، ئەوا مێردەکە نیوەی میراتیەکە دەبات‌و خوشکە دایك‌و باوکیەکەش نیوەی دەبات‌و برا باوکیەکە بەشبڕ دەکرێت بە نغرۆ بوون، واتە نغرۆبوونی خاوەن پشکەدیاری کراوەکانی لێجێماوەکە.

[3] جیاوازی نێوان بەشبڕاو –المحجوب– و بێ بەری کراو –المحروم– لە میرات بەهۆی رێگرێکەوە ئەوەیە کە دووەمیان وەك نەبوو دادەنرێت‌و هیچ کاریگەریەکی نیە لەسەر میراتگرەکانی دیکە، بەپێچەوانەی بەشبڕ کراو کراوەوە کە سەرەڕای بەشبڕ کردنی ئەوا کاریگەری هەیە لەسەر پشکەکانی میراتگرەکانی دیکە، بۆ نمونە کەسێك مرد لەپاش خۆی دایکی و دوو برای لەدایکەوە باپیرەیەکی پشت –باوکی باوکی– و دوو برای بەشبڕ کراو بە باپیرەیان لەپاش بەجێما، لەگەڵ ئەوەشدا دایکەکە بێ بەش دەکەن لە سێ یەك‌و شەش یەکی پێ دەبڕێت بەشبڕ کرانی ناتەواو، بەڵام ئەگەر دوو برا بوونایە هەردووکیان بەشدار بوونایە لە کوشتنی کۆچکردوودا ئەوا رێیان لە دایکەکە نەدەگرت، بەڵکو سێ یەکی تەواوی پێ دەبرا.

ونبوو (المفقود): بریتیە لەو کەسەی کەهیچ هەواڵێك لەبارەیەوە نازانرێت، دیار نیە کە لە ژیاندایە یان مردووە.

نێرەمووك (الخنثى): بریتیە لەو مرۆڤەی کە نائاساییە، ئەندامی نێرینەو مێینەی هەیە یان بێ بەشە لەهەردووکیان.

دەرچوون لەبەش (التخارج): بریتیە لەرێککەوتنی میراتگرەکان لەسەر ئەوەی یەکێکیان یان زیاتریان لە وەرگرتنی بەش لەلێجێماوەکە دەربچێت بەرانبەر بە شتێك کەلە لێجێماوەکە یان لە شتێکی دیکە پێی بدرێت.

جێگرتنەوە (المناسخة): بریتیە لە گوێزرانەوەی بەشی هەندێك لەمیراتگرەکان بەر لە دابەشکردنی لێجێماوەکە بۆ کەسانێك کە میرات لەمان دەگرن.

**کورتکراوەکان:**

ب= بەشبڕاو (محجوب).

م= ماوە (الباقي).

م پ= ماوە لەپشتەوە (الباقي تعصبا).

م خ= ماوە لە خزمایەتیەوە(الباقي قرابة).

ه= هەموو لێجێماوەکە (کل الترکة).

خوشکی ك= خوشکی دایك و باوکی (اخت الشقیقة).

خوشکی ب= خوشکی باوکی (الاخت للاب).

خوشکی د=خوشکی دایکی (الاخت من الام).

# بەندی یەکەم
# پێشەکیەکانی گوێزرانەوەی لێجێماو

دووبەش لەخۆ دەگرێت:

ئەم دەروازەیە چەند بابەتێکی ڕێگەخۆشکار لەخۆ دەگرێت کەهەیانە پەیوەندداره بە گوێزرانەوەی لێجێماو لە میرات لێگیراوەوە بۆ میراتگرەکانی و، تێیاندایە پەیوەندی هەیە بەمافە پەیوەستەکان بە لێجێماوەوە لە ڕووی سروشت و ریزبەندی کرداریی پێشخستن و دواخستنیان.

بەمەش لە ڕووی ڕوکارەوە بۆ دووباس دابەش دەکرێت:

باسی یەکەم: ئەوەی گوێزرانەوەی لێجێماوی لەسەر وەستاوە.

باسی دووەم: مافە پەیوەستەکان بە لێجێماوەوە.

# باسی یەکەم
# ئەوەی گوێزرانەوەی لێجێماوی بۆ میراتگرەکانی لەسەر دەوەستێت

گوێزرانەوەی خاوەندارێتی لێجێماو لە مردووەوە بۆ میراتگرەکانی دەوەستێتە سەر هۆکارەکانو ، بەدیهاتنی بنەماکانیو، هاتنە دی مەرجەکانیو، نەمانی بەربەستییەکانی، هەروەك لەم چواردەروازەیەدا دەیخەینە روو:

# دەروازەی یەکەم
# هۆکارەکانی میراتی

هۆکاری شەرعی: بریتیە لەوەی کە خوای گەورە کردویەتیە بەڵگە بۆ حوکمێکی شەرعی بە جۆرێك کەلەکاتی هەبوونیدا حوکمە شەرعیەکە دێتە دیو بەنەمانیشی نامێنێت[1].

هۆکارە شەرعیە تایبەتەکانی میراتگرتنی میراتگریش دووانە: هاوسەرگیرێتی دروست، خزمایەتی.

لەکاتی نەبوونی ئەم دوو هۆکارە هەردووکیاندا لە لێجێماوێکدا کە لەبەردەستدا بێت ئەوا هۆکاری سێیەمی میراتگرتن کەمیراتگری گشتی یە جێگەی دەگرێتەوە، ئەویش بریتیە لە سەرپەرشتیارێتی گشتی (الولاية العامة)، لێرەدا دەوڵەت میراتگری ئەو کەسەیە کە میراتگری نیە[2].

زانایانی ئیسلامیش کۆدەنگن لەسەر کارکردن بەم هۆکارانە، یاسا دانراوەکانیش لەجیهانی ئیسلامیدا بەهەمان شێوە بڕیاریان لەسەر داوە[3].

بەڵام خاوەنێتی (الولاء) پاش ئەوەی قورئانی پیرۆز بۆ هەتاهەتایی سیستەمی کۆیلایەتی نەهێشت بە هۆکارێکی میراتگرتن دانانرێت.

---

[1] (شرح النيل وشفاء العليل)ی (العلامة الشيخ محمد بن يوسف اطفيش ٨/٢٨٠).

[2] لە الخرشي (٨/١٧٠)دا هاتووە: (دامەزراوەی دارایی (بيت المال) میراتگری شەرعی یەو ئەو میراتەی پێ دەدرێت کە میراتگری نیەو قەرزی لەسەر نیە.

[3] مادە (٨٦/ب)ی (یاسای باری کەسی ژمارە (١٨٨) ساڵی ١٩٥٩ هەموارکراو):( هۆکاری میراتگرتن دووانە کەئەوانیش خزمایەتی ومارەبڕینی دروست، لە مادە(٨٨/٤): گەنجینەی دارایی لە شایستەکانی لێجێماوە. مادە (٧٠): " نەگونجاوە راسپاردنکردن بەیەك لەسەر سێ زیاتر و، دەوڵەتیش بە میراتگری ئەو کەسە دادەنرێت کە میراتگری نیە". لە مادەی (٢/٢٢٧) (مشروع القانون المدني الجديد) :" دەوڵەت میراتگری ئەو کەسەیە کە میراتگری نیە ".

## هۆکاری یەکەم: هاوسەرگیریێتی دروست:

ئیسلام هاوسەرگیرێتی دروستی کردۆتە هۆکارێك بۆ میرات لەیەك وەرگرتنی ژن‌و مێرد کاتێ کەبەشێوەیەکی دروست مارەبڕێن‌و، با نەشچووبنە پەردە (دخول) یان نەیگواستبێتەوە، بەپێی فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ، وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ، فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ﴾[1].

بنەمای ئوصولی گشتیش وا دەخوازێت رەها (مطلق) بە رەهاییەکەی کاری پێ بکرێت‌و بە بەلگەیەکی شەرعی چەسپاو نەبێت نابێت کۆت بکرێت، زانایانی شەریعەتیش لەسەر ئەوە کۆدەنگن کە ئەم رەهاییە نەبەستراوەتەوە بەچوونە پەردە (دخول)و، گواستنەوەوە.

یاسادانەری عێراقیش کاری بەمە کردووە، ئەوەتا لە مادە (١/٩١)دا هاتووە کە: (مێرد لەگەڵ منداڵی میراتگری ژنەکەیدا شایانی چوار یەکە، شایانی نیوەشە ئەگەر نەبوون، بەڵام ژن هەشت یەك شایانە لەکاتی بوونی منداڵی میراتگرداو چواریەك لەکاتی نەبوونیاندا).

### مەرجەکانی میرات کەوتن بەهاوسەرگیریێتی:

بۆ میرات وەرگرتن لەرێی هاوسەرگیرێتیەوە پێویستە ئەم مەرجانە بێتە دی:

١- پێویستە هاوسەرگیریەکە دروست بێت، گەر هاوسەرگیریەکە بەتاڵ (باطل) یان نادروست (فاسد) بوو بەجۆرێك کە هاوڕا بن لەسەری[2] و یەکێکیان مرد بەر لە

---

[1] سورەتی النساء / ١٢.

[2] بەڵام هاوسەرگیریەکی نادروست(فاسد) کەجیا رابوون تێیدا وەك هاوسەرگیری ژن بەژن (الشغار) زانایانی مالکی بۆ ئەوە چوون کە گەر یەکێکیان بەر لەهەڵوەشاندنەوەکە مرد ئەوا میراتەکەی پێ دەدرێت، هەروەك لە کتێبی (الشرح الصغير للدردير مع بلغة السالك لاقرب المسالك (١/٣٦٦)دا: تێیدا هاتووە کە ئەوەی ڕا جیایی تیابوو لە میرات لێك گرتن لە نێوان ژن‌و مێرداو پێش هەڵوەشاندنەوە یەکێکیان مرد(
←

جیابوونـەوە ئـەوا کەسـەکەی تـر بـەهیچ شـێوەیەك [1] میراتــی لێ ناگرێـت بـە کۆدەنگی هەموو زانایانی شەریعەت.

٢– هەبوونی هاوسەرێتی لەکاتی مردنی راستەقینە یان بڕیاردان بەوەی کە مـردووە، لێـرەدا هاوسـەرێتی حـوکمی بـۆ ژنـە تەڵاقدراوەکـە چەسـپاوە کەیـەك تـەڵاقی گەڕانـەوەیی(رجعی) دراوە، هـەر کـەس هاوسـەرەکەی تـەڵاق بـدات بەتـەڵاقی گەڕانـەوەیی (طـلاق الرجعـي)و، بـەر لـەکۆتایهاتنی مـاوەی چـاوەڕوانی (عیـدە) یەکێکیان مرد ئەوا هاوسەرەکەی میراتی لێ دەگرێت چونکە هاوسەرێتی لـەکاتی ماوەی چاوەڕوانی (عیدە)دا لەرووی حوکمەوە بەردەوامە [2].

بـەڵام تـەڵاقی لـێکترازان (الطـلاق البـائن) کۆتـایی بـە پەیوەنـدی هاوسـەرێتی دەهێنێتو، هۆکاری میرات لەیەك بەرکەوتن لـەنێوان ژنو مێـرددا ناهێڵێـت گـەر یەکێکیان مرد.

ئەوەی لەم بنەمایە جودا دەکرێتەوە: تەڵاقی هەڵاتن (طـلاق الفـار) کـە ئـەمیش بریتیە لە تەڵاقدان لەلایەن نەخۆشێکەوە کە لەنەخۆشینی سـەرەمەرگیدایە، جـا هەر مێردێك ژنەکەی تەڵاقدا لەکاتێکدا مێردەکە لەنەخۆشینی سـەرەمەرگدا بـوو ئـەوا بـە کـۆدەنگی زانایـانی شـەریعەت تەڵاقەکـەی دەکـەوێت، بـەڵام گـەر لـەو

---

هەڵوەشاندنەوەش بەتەڵاقدان دەبێت) ئەمە جگە لەمارەبڕینی نەخۆش چونکە رای جیاوازی لەسـەرەو میراتی تێدا ناگیرێت ئیدی نەخۆشەکە بمرێت یان ساغەکە چونکە هۆی نادروست بوونەکە هاتنـە نـاوی میراتگرێکە هاتبێتە ناو یان نەهاتبێت، بەپێچەوانەی نادروستێتی هاوسەری پێنجـەم) واتـە بـەکۆدەنگی میراتی بەر ناکەوێت.

[1] ئیدی لەپەردەی کرببێت یان نەیکرببێت.

[2] تەڵاقی گێڕانەوەیی (الطلاق الرجعي) : بریتیە لەهەر تەڵاقێك پاش لەپـەردەکردن بـۆ تـەڵاقی یەکـەم یـان دووەم بەبێ بەرانبەر بەمەرجێك بە بڕیاری دادگا جیابوونەوەیان بۆ نەکرابێت.

تەڵاقی لێکترازان (الطلاق البائن)بریتیە لەتەڵاق لەیەکێك لەم حاڵەتانەدا:

بەر لە چوونەپەردە بەرەهایی پاش چوونەپەردە بە بەرانبەر تەڵاقدانی جاری سێیەم.

تەڵاقدان بە پێی بڕیاری جیاکردنەوە لەدادگا بە پێی مادەی چلو پێنج لەیاسای باری کەسیی بەرکار.

نەخۆشیەدا پیاوەکە مرد ئەوا بەم مەرجانەی خوارەوە ژنەکە میراتی بەردەکەوێت[1]:

أ- لەکاتێکدا کەمێردەکە لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بێت تەڵاقی بدات.

ب- لەم نەخۆشیەدا بمرێت.

ت- هۆکاری تەڵاقدانەکە ژنەکە نەبێت یان لەسەر داوای ژنەکە نەبێت.

پ- دەبێت تەڵاقەکە پاش چوونە پەردە (دخول) [2]بێت.

ج- هیچ بەربەستییەك لە بەربەستیەکانی میراتی تێدا نەبێت.

**بەڵام بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بە نەمانی ئەو مافە:**

حەنەفیەکان دەڵێن: میرات وەردەگرێت ئەگەر بەر لەکۆتایی هاتنی ماوەی چاوەڕوانی (عیدە) مێردەکەی مرد، بەڵام ئەگەر کۆتایی هات ئەوا وەرناگرێت چونکە پەیوەندی هاوسەرێتی لەدوای ماوەی چاوەڕوانی (عیدە)ە کە کۆتایی هاتووە[3].

جەعفەریەکانو پێشەوا ئەحمەد لەوتەی بەناوبانگ(مشهور)یدا [4]دەڵێن: میراتی بەر دەکەوێت گەر شووی نەکردەوە، بەڵام ئەگەر شووی کردەوە ئەوا مافەکەی

---

[1] ئەمەش پێچەوانەی ظاهریەکانو (المحلى ١٠ / ٢٤٨)، زیدیەکانو (روض النضير ٣/ ٢١٦)، شافعی لەیەکێك لە بۆچونەکانیدا (المهذب ٢/٢٥) ئەمانەی وای بۆ دەچن کە ژنەکە میراتی پێ نادرێت کاتێ تەڵاقی بائین درلبێت ئیدی مێردەکەی نەخۆش بێت لەسەرەمەرگدا یان نا، یان مەبەستی مێردەکە بێ بەش کردنی ژنەکەی بێ یان نا؟ چونکە تەڵاق کۆتایی بەپەیوەندی هاوسەرێتی دەهێنێتو بەنەمانی هۆکارەکە حوکمەکەشی نامێنێت.

[2] لای ئەبازیەکان(شرح النيل ٨/١٧٦) میرات دەگرێت گەر پێش لەپەردەکردنیش بێت، لەمبارەیەوە هاتووە: ئەی ئەگەر ژنێك لەماوەی مانگێکدا چوار مێرد یان زیاتری کردو میراتی لێ گرتن ؟ ئەو ژنە شوو بەپیاوی نەخۆش دەکاتو پێش لەپەردەکردن دەمرن) واتە پاش تەڵاق وەرگرتن لە هەموویان.

[3] المبسوط للسرخسي ٦/١٥٤. هاوڕان لەگەڵ حەنەفیەکان: سفيان، والليث، والاوزاعي، والإمام احمد لەیەکێك لەگێڕانەوەکانیدا (المغني ٦/٣٣٠) وشافعی لەیەکێك لەراکانیدا (المهذب، المجموع شرح المهذب ١٤/٥٠٥).

[4] المغني سەرچاوەی پێشوو.

لەدەست دەدات چونکە شوکردنەوەکەی بە دەست هەلگرتن لەو مافەی دادەنرێت.

زانایانی جەعفەری مەرجێکی دیکەیان زیاد کردووە کە بریتیە لەوەی نابێت ساڵێکی تەواو بەسەر تەڵاقدانەکەدا تێپەڕیبێت، ئەگەر تێپەڕی ئەوا میراتی بەر ناکەوێت[1].

مالکیەکان[2] و ئەبازیەکان[3] دەڵێن: بە رەهایی میراتی بەر دەکەوێت ئیدی شووی کردبێتەوە یان نا جیاوازی نیە، ماوەکەی درێژ بخایەنێت یان نا، لەبەر ئەوەی پاساو (علە)ی میرات بەرکەوتنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نیاز خراپی مێردەکەی کەدەیەوێت ژنەکەی لە لێجێماوەکەی بێ بەش بکات بۆیە بەپێچەوانەی ئەو نیاز خراپیەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت بەوەی مافەکەی لەدەست نادات بەتێپەڕبوونی کاتو شوکردنەوە.

شافیعیەکانیش رای جیاوازیان هەیە، هەریەك لەو رایانە لەگەڵ بۆچونێك لەوانەی پێشتر باسکرا یەکدەگرنەوە.

بەڵام ئەگەر ژنەکە مرد مێردەکەی کەلەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بووەو تەڵاقی داوە لەم ژنە میراتی پێ نادرێت.

لەوانەشە بابەتەکە پێچەوانەی ئەمە بێت بەوەی ژنێك کە نەخۆشەو لەسەرەمەرگدایەو بەپێی رێگەپێدانی مەرجدار لە گرێبەستی هاوسەرگیریەکەیدا مافی تەڵاقدانی هەیە، ئەگەر هات و ئەم ژنە خۆی تەڵاق بدات ئەم کارەی وا لێك دەدرێتەوە کە ویستویەتی خۆی لە لێجێماوەکە بێ بەش بکات.

---

٢ (الكافي)ی كليني ٦ / ١٢٢.

٣ المنتقى شرح موطأ ٤/.٨٥

٤ شرح النيل وشفاء العليل ٨/.١٧٦

تەڵاقەکـەی لەنەخۆشـینی سـەرەمەرگدا بـەپێی تـەڵاقی مێـرد لەنەخۆشـینی سـەرەمەرگدا دەپێورێـت، چـونکە لـە پاسـاو (عیلـە)ی حوکمەکـەدا هاوبەشـن کەئەویش نیاز خراپیـە، بـەڵام دەتوانرێـت نـەیارێتی ئـەم پێوانـە کردنـە بکرێـت بەوەی حوکمی ئەو شتەی پێوانەی لەسەر کراوە پێچەوانەی بنەما گشتیەکەیەو جیا-استثناء- بوو ئەوا جگە لەخۆی شتی تری پێ ناپێورێت.

بـەڵام دادپـەروەری ئـەوە دەخوازێـت کـە جیـاوازی نـەکرێت لـەنێوان هـەر دوو حاڵەتەکـەدا، لـە بۆچـوونی یاسـا دانـەری عێراقیشـدا: تـەڵاق لەنەخۆشـینی سەرەمەرگدا ناکەوێت[1].

ئەمەش پێچەوانەی کۆڕای زانایانی شەریعەتە.

٣- هەندێك لەزانایان مەرجی ئەوەیان داناوە بۆ ئەوەی هاوسەرێتی بەهۆکاری میرات لێ وەرگرتن دابنرێـت دەبێـت لـەکاتی نەخۆشـینی سـەرەمەرگدا نـەبێت[2]، گـەر وابـوو ئـەوا میراتیـان لەیـەك بەرناکـەوێت ئیـدی نەخۆشـەکە بمرێـت یـان نـا، لەپەردەی کردبێت یا نـا[3]، لەمەشـدا پشـتیان بـەو فەرموودەیـە بەسـتووە کـە لەپێغەمبـەر(ﷺ) گێڕاویانەتـەوە فەرموویـەتی: ((نهـی عـن ادخـال وارث واخـراج وارث)) واتە: ڕێگری کردووە لە میراتگر زیادکردنو میراتگر کەم کردن.

یاسا دانەرو دادگا لەعێراق ئەم مەرجەیان لەبەرچاو نەگرتووە.

---

[1] لە مادە (٣٥) ی (قانون الأحوال الشخصية) هاتووە: (لايقع طلاق المريض مرض الموت) واتـە: تـەڵاقی نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا ناکەوێت.

[2] هەندێکیان جیاوازیان نەکردووە لەوەی ژنەکە لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بێت یان پیاوەکە، بەڵام زۆربەیان وتوویانە: میرات پێ نەبڕان لەیەك باردا دەبێت ئەویش مێردەکە لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بێت.

[3] زانایانی جەعفەری ئەوەیان بەمەرج گرتـووە پیاوەکـە نـەخۆش بـێو مردنەکـەی دوای لەپـەردەکردن بێـت ئەگینا میرات لێك گرتن لەنێوانیاندا ناچەسپێت. ایضاح الفوائد في شرح القواعد ٢٤٠/٤ ئەمەش بۆچـوونی ناسراوە لە مەزهەبی پێشەوا مالیکدا، الشرح الصغیر ٣٦٦/١.

## هۆكاری دووەم: خزمایەتی:

واتە پەیوەندی خزمایەتی لەنێوان میراتگرو میرات لێگیراودا بەلەدایكبوون بێتو بەرهەمی رەچەڵەكێكی شەرعی بێت، ئەمەش بەیەكێك لەم رێگایانە دەسەلمێندرێت:

**١- هەبوونی هاوسەرگیریەكی دروست لەنێوان ئەو كەسەی رەچەڵەكی منداڵەكەی** دەدرێتە پاڵو ئەو كەسەی لێی بووە، ئەم رێگایە پێویستی بە رێو شوێنی رووكاری نیە وەك داننان بەكوڕەكەداو سەلماندنی رەچەڵەكەكەی بەبەڵگە لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) كە دەفەرموێت: (الولد للفراش وللعاهر الحجر)[1]. واتە: منداڵ هیی مێردەكەیەو، ژنەكەش لەماڵەوە بەند دەكرێت.

**بەرهەمی چوونە پەردەی گوماناوی(ثمرة الدخول بالشبهة):**

هەر منداڵێك بەرهەمی رووداوی چوونە پەردەیەكی گوماناوی بوو ئەوا رەچەڵەكی شەرعی دەسەلمێندرێت، ئیدی گومانەكە بەهۆی هاوسەرگیرییەكی نادروست (زواج فاسد) بوویێت كەبەشێوەیەكی رەها جیا رای لەسەر بێت كەزاوا بەو ناتەواویەی زانیبێت یان نا، یان لەناتەواویەكەوە بێت كەهاوڕایی لەسەر ناتەواویەكەی هەبێت بەڵام لەپەردەكردنەكە بەبێ ئاگاداربوون لەو ناتەواویە رویداوە، بەهەمان شێوە گرێبەستی بەتاڵ بێ (العقد الباطل) ئەگەر چوونە پەردە رویدات بەبێ ئەوەی بزانرێت كە بەتاڵە.

**٢- داننان بەرەچەڵەكدا (الاقرار بالنسب):**

ئەوەی دان دەنێت بە رەچەڵەكی خۆیدا (النسب علی نفسه) مەرجە ئەم خاڵانەی تێدا بێتە دی:

أ- ئەو كەسەی بڕیاری بۆ دەدرێت رەچەڵەكی نادیار بێت.

ب- هاوشێوەی ئەوی لێ لەدایك بێت(ان یولد مثله لمثله).

---

[1] واتە بەشی زیناكار بێ ئومێدیو بێ بەش كردنە. فتح الباري شرح صحيح البخاري ٣٢/١٢ لاپەرەكانی دواتری.

ح- ئەو کەسەی بڕیاری بۆ دەدەن گەر هەراش(ممین) بوو ئەوە بەراست دابنێت (یان بەدرۆی نەخاتەوە).

هەروەها مەرجە بۆ بڕیاردان لەبارەی کەسانی دیکەوە (وەك بڕیاردان لەسەر برا بوونو مام بوون ....) ئەو بڕیارە لەلایەن خاوەن ئەو کەسەوە پەسەند بکرێت کە رەچەڵەکەکەی دەدرێتە پاڵی یان بە بەڵگەی روون بسەلمێندرێت، گەر بڕیار دەر مرد ئەوا بڕیار بۆ دراوەکە بە خزمایەتی میرات گری دەبێت: گەر سووربوو لەسەر بڕیاردانەکەیو بڕیاردەر میراتی پێ بڕا بەهۆی خزمایەتیەوە ئەوا بڕیار لەبارەوە دراو لەو میراتەدا لەگەڵی هاوبەش دەبێت بەهۆی خزمایەتیەکە[1].

لەبەر رۆشنایی ئەمەی باسمان کرد هۆکاری میرات وەرگرتنەکە بڕیار بۆدانەکە نیە بەڵکو خزمایەتیەکەیە کەبەهۆی بڕیارلەبارە دانەکەوە چەسپاوە، بۆیە هیچ بیانویەك نیە بۆ ئەوەی لەمیرات وەرگران بە خزمایەتی دانەنرێتو وەك کەسێکی جیاو سەربەخۆ لەوان دابنرێت، وەك ئەوەی یاسا دانەری عێراقی کردوویەتی بەهەمان شێوەی یاسا دانەری میسریو وڵاتانی دیکە[2].

٣- **سەلماندنی رەچەڵەك بەبەڵگەی پەیوەندندار بە فەرمانی دادوەر،** ئەم سەلماندنەش لێکەوتەکەی تەنها لەسەر داوا لەسەرکراو ناوەستێت بەڵکو کەسانی دیکەش دەگرێتەوە.

**میراتی منداڵی هەڵگیراوە:**

هەڵگیراوە(لقیط) ئەو منداڵەیە کە کەسو کارەکەی پاش لەدایکبوونی فرێی دەدەن، ئیدی لەترسی تۆمەتێك بێت، یان نەتوانن بژێوی دابین بکەنو خۆیان لەو

---

[1] الزيلعي ٥ / ٢٨.

[2] مادەی (٨٨): شایستەبووان بەمیرات ئەم پێزانەن: میراتگران بەخزمایەتیو مارەبڕینێکی دروستو، بڕیار لەبارەی رەچەڵەك بۆ دراوەوە.

ئەركە دەرباز دەكەن، یان لەبەر رەوشێكی نالەبار كەلەدەسەڵاتیاندا نیە (قوة قاهرة)، بەبێ ئەوەی شتێكی وای لەگەڵ بەجێ بهێڵن كەبزانرێت كێ یە یاخود كەس و كارەكەی كێن.

ئیسلام پێویستی كردووە لەسەر هەركەس كەمناڵێكی فڕێدراوی بینی لەجێگایەكدا كە گومانی تیاچوونی دەكرا دەبێت هەڵیبگرێتەوە، ئەگەر شوێنەكەش ئاوەدانی بوو بەباش دەزاندرێت هەڵیگرێتەوە وەك رێز گرتنێك لەوەی كە مرۆڤەو بەمەبەستی پاراستنی ژیانی ، رەچەڵەكیشی دەدرێتە پاڵ هەر كەسێك كەبانگەشەی ئەوە بكات منالی خۆیەتی بەبێ ئەوەی پێویست بە بەڵگە بكات لەبەر ئەوەی رەچەڵەكی نادیارە، كاتێك رەچەڵەكی چەسپا ئەوا هەموو مافەكان دەیگرێتەوە لەنێویشیاندا میراتی.

**بەمندالی خۆ كردن (التبني) و میرات:**

جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو كەسەی بەمناڵی خۆ (التبنی) دەكرێت لەگەڵ بڕیاردان بە رەچەڵەك، چونكە بەمناڵی خۆكردن لكاندنی كەسێكی رەچەڵەك ناسراوە بە باوكێكەوە، یان رەچەڵەك نەناسراوێك بۆ كەسێكی دیاریكراو بەجۆرێك ئەو كەسە رایبگەیەنێت كە كردوویەتیە كوڕی لەكاتێكدا كوڕی راستی خۆی نیە.

بەلام بڕیاردان بەرەچەڵەك (الاقرار بالنسب) بریتیە لە داننان بە رەچەڵەكێكی راستەقینەی كەسێكی رەچەڵەك نادیار لەگەڵ دانانی ئەوكەسە بەوەی كە منالی شەرعی ئەوە بەمەش ئەو بڕیاردانە دەبێتە بەڵگەیەكی شەرعی دیارخەری رەچەڵەكی منالەكە كە خۆی نیەتی.

بەمنالی خۆ كردن هەڵس و كەوتێكی یاساییە بۆ رەچەڵەكێكی نا راستەقینە لەبەر ئەوە ئیسلام دانی پێدا نانێت و مافە شەرعیە كەڵەكە بووەكان لەسەر رەچەڵەك وەك بەخێوكردن و میرات نایگرێتەوە بەڵكو بەكەسێكی بێگانە بە خێزانەكە دادەنرێت

لەماف و نەشیاوی تێکەڵاوبوون واتە نامەحرەمە[1].

**میراتی منداڵی زۆڵ (بیژی):**

منداڵی زۆڵ (بیژی) بریتیە لەو لەدایکبووەی بەهۆی هاوسەرگیرییەکی شەرعیەوە نەبووەو ئاگاداربوون لەوەی کە پەیوەندییەکە ناشەرعیە، لەبەر ئەوە داننانی پیاوێك بەوەی منالّی خۆیەتی بەبێ ئامازەدان بەوەی کە منالّی پەیوەندی ناشەرعیەو کەسی وەك ئەم توانای لەدایکبوونی وەك ئەویان هەبێت ئەوا رەچەڵەکی بۆ دەچەسپێت. بەڵام گەر کەس دانی پێدا نەنا یان کەسێکی دانی پێدا ناو وتی: منالّی منە بەڵام بەپەیوەندیەکی ناشەرعی بەمە رەچەڵەکی بۆ ناچەسپێتو، میرات لەیەك وەرگرتن ناکەوێتە نێوان ئەو منالّەو باوکە ناشەرعی(زیناکار)مکەی، هەروەها ناکەوێتە نێوان ئەوو خزمەکانی، لەم حاڵەتەدا بەمنالّی پەیوەندی ناشەرعی (زینا) ناودەبرێت.

بەڵکو ئەو منداڵە دەدرێتە پاڵ دایکیو میراتی لەو بەردەکەوێتو لەخزمەکانیشی میراتی دەکەوێت، دایکیو خزمەکانیشی میراتیان لەوەوە پێدەگات چونکە پەیوەندی ئەو منالّە بەدایکیەوە گومان هەڵناگرێتو ئاشکرایە، دایکایەتیش با بەپەیوەندی ناشەرعیش بێت بەڵام بەشە پەیوەندی نێوان دایكو منالّەکەی پێ دەسەلمێندرێت ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی میراتی لێی بەرکەوێت، زۆرینەی زانایانیش ئەم بۆچوونەیان لا پەسەندە.

هەندێ لەزانایانیش وتویانە[2]: دایکیش وەك باوکە بۆیە میرات لەیەکگرتن لەنێوان

---

[1] لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ، ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ﴾ الأحزاب/٤.

[2] وەك زانایانی جەعفەری لە الروضة البهية (٢/٢٣٦)دا وتویانە: منالّی پەیوەندی ناشەرعی لەهەردوو سەرەوە بوو ئەوا منالّ و ژنەکەی میراتیان لێی بەردەکەوێتو بۆ دایكو باوکی ناچێت، بۆ ئەو کەسانەش ناچێت کەبەهۆی ئەولەوە خزمایەتیان هەیە لەبەر ئەوەی بەپێی شەرع پەیوەندی نیە پێیانەوە لەبەر ئەوە نە میراتی لێ دەگرن، نەمیراتی دەدەنێ.

دایکەکـەو منداڵـە ناشــەرعیەکەی ناچەسـپێت چـونکە مـیرات بەخشش‌ـێکەو بـەهۆی ئەنجامدانی تاوانەوە بەدەست ناهێنرێت، بەڵگەی قسەی یەکەمیش ئەو فەرموودەیەی دوو نەفرینکارەکە (المتلاعنین)یە کـە سـەهلی کـوڕی سـەعد گێڕاویەتیـەوەو دەڵێـت: ژنەکە سکی هەبوو رەچەڵەکی منداڵەکەی دەدرایە پاڵ دایکی لەمەشەوە وا پەیڕەو کرا کەمیراتی لێدەگرێت و ئەمیش میراتی لەو بەردەکەوێت بەو ئەندازەی کە خـوا دیـاری کردووە[1].

یاسا دانەری عێراقی خۆی لەقەرەی ئەم بابەتـە نـەداوە، هەنـدێك لەیاسـای وڵاتـە عەرەبیەکان ئەو بۆچوونەی زۆرینەی زانایانیان وەرگرتووە[2].

**میراتی منداڵی نەفرین (ولد اللعان):**

منداڵی نەفرین بریتیە لەو منداڵەی کە مێردە شـەرعیەکە رەچـەڵەکی لـەخۆی رەت دەکاتەوە و چوارجار لەبەردەم دادوەردا سوێند دەخوات کە راستگۆیە لەو تۆمەتـەی دەیداتە پاڵ ژنەکەی بەوەی پەیوەندی ناشـەرعی (زینـا)ی ئـەنجام داوە، پێنجـەمین سوێندیشی ئەوە دەبێت کە نەفرینی خوای لێ بێـت ئەگـەر درۆ بکـات، ئافرەتەکـەش چوارجار سوێند دەخوات کە ئەوەی مێردەکەی لەبارەیەوە دەیڵێت کە زینای کردووە درۆ دەکاتو، سوێندی پێنجەمیش ئەوە دەبێت کەبەر تووڕەیی خوای گەورە بکـەوێت گەر راستی نەوتبێت[3].

---

[1] نیل الأوطار ٧٥/٦. عەمر کوڕی شعیب گێڕاویەتیەوە لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە کە پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویەتی: (أیما رجل عاهر بحرة أو أمـة فالولـد ولـد زنـا لا یـرث ولا یـورث)، واتـە: هـەرکاتێ پیاوێـك جوتبوو لەگەڵ ئافرەتێکی ئـازاد یـان کۆیلـە ئـەوا منداڵەکـەیان منـاڵی زینـا دەبێـتو میراتـی ناکـەوێتو میراتیان لێی ناکەوێت، رواه الترمذي. سەرچاوەی پێشوو.

[2] لە مادە (٣٠٢) ی (قانون الأحوال الشخصیة السوري) هاتووە: منداڵی پەیوەندی ناشەرعی و منداڵی نـەفرین میراتی دایکیانو خزمایەتیەکانیان بەردەکەوێتو دایکیشیانو خزمەکانی میرات لەو دەگرن.

[3] خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ،
←

کاتێـك ئـەم ڕێو شـوێنانەی دادگـا کۆتـایی هـات کـە بەنـەفرەتکردن (الملاعنـە) ناسـراوە ئـەوا بـەپێی بۆچـوونی زۆرینـەی زانایـان دادوەر فـەرمان بەجیابوونـەوەیان دەدات، هەندێکیش دەڵـێن جیابوونەوەکـە دەسـت بـەجێ ڕوودەدات بـەبێ فـەرمانی دادوەر.

بەپێی هەردوو بۆچوونەکە ئەو منداڵەی مێردەکە ڕەتـی دەکاتـەوە منـاڵی شـەرعی ئـەو بێـت لـەو حوکمانـەی باسمـان کـرد وەك منـاڵی پەیوەنـدی ناشـەرعی (زۆڵ) دادەنرێت.

**هۆکاری گشتی (السبب العام) ((سەرپەرشتکاری گشتی))**:

هەر کەسـێك مـردو لـە ڕێـی هاوسـەرگیریو خزمایەتیـەوە میراتگـری نـەبوو ئـەوا دەوڵـەت میراتگـری ئـەو کەسـانەیە کـە میراتگریـان نیـە، ئەمـەش لەبـەر ڕۆشـنایی فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ): (من ترك مالا فلورثته وانا وارث من لا وارث له اعقل عنـه وأرثُ)[1].

واتە: هەرکەس پاش خۆی سامانێکی بـەجێ هێشـت ئـەوا بـۆ میراتگرەکانیـەتی، هەرکەسیش میراتگری نەبوو ئەوا من میراتگریم)

یاسا دانەری عێراقیش لەمادە (٧٠)و مادە (٨٨)ی یاسای باری کەسێتیدا ئەمەیان پەیڕەو کردووە[2].

---

وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَنْ تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ﴾ سورة النور /٦، ٧، ٨، ٩.

[1] احمد وأبو داود وابن ماجه گێڕاویانەتەوە. نيل الأوطار ٦/٧٠.

[2] لە مادە (٧٠)دا هاتووە: (ڕاسپاردن بەیەك لەسەر سێ زیاتر نابێت، مەگەر ڕەزامەندی میراتگرەکانی لەسەر وەربگیرێت) مادە (٨٨)هاتووە: (شایستەبووان لە لێجێماو ئەم سێ پێڕەن:

میراتگران بەهۆی خزمایەتی یان بەهاوسەرگیرێتی دروست.

ئەوەی ڕەچەڵەکی بۆ بڕیاردراوە.

ئەوەی کەسەی ڕاسپاردن بۆ کراوە بەهەموو سامانەکە.

←

## دەروازەی دووەم

# پایەکانی میرات

مەبەست لەپایەی هەر شتێك ئەوەیە کە دەبێتە هۆی راگرتنی شتەکەو، بەشێکی دانەبڕاوە لەپێکهاتەو راستیەکەی، بەم پێیەش میرات سێ پایەی هەیە: مردوو (میرات لێگیراو)، میراتگرێکی زیندوو،ماڵو سامانی میراتی [1].

**پایەی یەکەم: میراتلێگیراو:**

بریتیە لەمردووە راستەقینەکە، کە مردنەکەی بەبینین یان بیستن یان بەبڕیار سەلمێندرابێت، وەك ئەوکەسەی دیار نەماوەو لەبەر رۆشنایی ئەو پاساوو و بەڵگانەی کەلە رووی شەرعیەوە رێگە بەم بڕیاردانە دەدات، دادوەر بڕیار دەدات بەمردوو دابنرێت، یان بە مردوو مەزەندە بکرێت، وەك ئەو کۆرپەلەی کە بەهۆی دەست درێژیەوە بۆ سەر دایکی لەبار چووە، لێرەدا مردنەکەی مەزەندە کراوە چونکە ژیانەکەشی هەر مەزەندە کراو بوو [2].

**پایەی دووەم: میراتگر:**

بریتیە لەمرۆڤێك کە بەراستی زیندووە، یان بەزیندوو دادەنرێت ، یان بە زیندوو مەزەندە دەکرێت، جا ئەو کەسەی بەراستی زیندووە: بریتیە لەو کەسەی ژیانی بە بینینو بیستنو بەڵگەی روون سەلمێنراو بێت.

---

گەنجینەی دارایی( بيت المال).

[1] شرح النيل ٨/٢٥٩.

[2] لای زۆرینەی زانایان کۆرپەلە تەنها لەبەر قەرەبووەکە(مەبەست ئەو پارەیەیە کەلە دەستدرێژیکار دەسەندرێت) بە زیندوو ئەژمار دەکرێتو کەس لەبری میرات وەرناگرێت. زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کۆرپەلە میراتی پێ نابرێتو میراتی لێ ناگیرێت ئەگەر بە بێ هۆکارێکی تاوانکاری لەبارچوو.

هێشتا بەزیندوو دادەنرێت (استصحابا): وەك دیار نەماو كە بەر لەدیار نەمانی لەژیانی راستەقینەدا گومانی هەڵنەدەگرت، بەڵام پاش دیار نەمانی بوەتە جێی گومان، بنەمای ئوصولیش وا دەخوازێت: (الیقین لا یزول بالشك)[1].

واتە: تەواودڵنیا بوون بەگومان ناسرێتەوە.

هەر بۆیە پاش دیار نەمانیشی بەزیندوو دادەنرێت وەك بەرژەوەند ویستی ژیانی بەر لەوەی بەتەواوی ئایندەی روون بێتەوە كەئایا زیندووە یان مردووە، یان بەرلەوەی دادوەر بڕیار بدات كە مردووە.

ژیانی مەزەندە كراو(الحیاة التقدیریة): وەك ژیانی كۆرپەلە لەسكی دایكیدا كە وەك میراتگر دادەنرێت گەر لەكاتی مردنەكەدا هەبێت.

خۆ ئەگەر ژیانیشی سەقامگیر نەبوو ئەوا هەر بەزیندوو مەزەندە دەكرێت، گەر بە زیندووی لەدایك بووو سەلمێنرا كە كاتی مردنەكە هەبووە ئەوا بەهۆی خزمایەتیەوە میراتی پێ دەدرێت.

---

[1] ئەم بنەمایە وەك ئەوەی هەیە بەهەڵە بڵاویۆتەوە، راست وایە بگۆڕدرێت بەم شێوەیە: (الیقین لا یرتفع إلا بالیقین) واتە: دڵنیابوون تەنها بەدڵنیابوون لادەچێت، چونكە پلەكانی زانین بەمانای رەهای هەست پێكردن ئەم حەوتەیە:

١- الیقین: یەقین ولتە: بیروباوەڕی تەولو چەسپاوی گونجاو لەگەڵ واقیع.

٢- الجهل المركب: نەزانینی تێكەڵ واتە: بیروباوەڕی تەولو چەسپاوی نەگونجاو لەگەڵ واقیع.

٣- التقلید: لاساییكردنەوە واتە: بیروباوەڕی تەولوی نەچەسپاو.

٤- الظن: گومان ئەمەش لایەنی هەڵاوێردراو (راجح) لەلای مرۆڤی ئاگادار لەدوو رووی شتێك.

٥- الوهم: بریتیە لەلایەنی پێشخراو (مرجوح) لای ئەو كەسەی كەبەئاگا بێت لەشتێك كەدوو رووی هەیە..

٦- الشك: بریتیە لەدوودڵ بوون لەنێوان دوو كاردا بەبێ ئەوەی یەكێكیان لەپێشخراو (مرجح) بێت.

٧- التخیل: بریتیە لە تێڕوانینی لایەنی بەرانبەر بۆ تەواو دڵنیا (یەقین).

شایانی باسە كە دڵنیابوو بەگومان لێ بوو لاناچێت، بەیەكێك لەو پلەبەندیانەی خرانە روو لاناچێت بەولتای تێگەیشتنی رەها..

**پایەی سێیەم: لێجێماو (الترکة):**

بریتیە لەوەی کەلە مردووەکە بەجێ دەمێنێت لە شتومەکی گوێزراوەو نەگوێزراوە، ئیدی لەبەر دەستی خۆیدا بێت کاتی مردنی یان بەشێوەیەکی شەرعی لە دەستی یەکێکی دیکەدا بێت وەك بەکرێدراو یان خواستراو، یان بەشێوەیەکی ناشەرعی لەدەستی کەسێکی تردا بێت وەك سامانی دەست بەسەردا گیراو، یان دزراوە...

هەروەها ئەوەی پاش خۆی بەجێی دێڵێت لە مافە تەواو داراییەکان (الحقوق المالیة المحضة) وەك مافەکانی هاوشانی (حقوق الارتفاق) و، قەرزە چەسپاوەکان لەئەستۆی کەسانی دیکەدا.

بەڵام مافە تەواو کەسییەکان وەك مافی فەرمانبەرێتیو، سەرپەرشتیو ئەو مافانەی دیکە کەلەئەنجامدانیاندا کەسەکە خاوەن مافە لەمەدا زانایانی شەریعەت هیچ جیا ڕاییەکیان لەنێواندا نیە کە ناکرێت بۆ میراتگرەکان بگوازرێتەوە.

ئەگەر مافەکانیش هەردوو خەسڵەتی (داراییو کەسیی) لەخۆ گرتبوو ئەوا:

أ- گەر لایەنی دارایی بالآتر بوو بەسەر لایەنی کەسیدا وەك مافی سەرپشکی خەوشدار (خیار العیب) ئەوا بۆ میراتگر دەگوازرێتەوە.

ب- خۆ گەر لایەنی کەسیی زاڵتر بوو؛ وەك مافی سوود وەرگرتن لەماڵێك کە کەسێکی دیکە خاوەنی بێت و لەم سوود وەرگرتنەشدا کەسەکە جێگەی بایەخ بێت، وەك راسپاردنو سوود لێوەرگرتن ئەوا ناگوازرێتەوە بۆ میراتگرانی راسپاردن بۆ کراوەکە، ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر دەقێك یان رێککەوتنێك نەبوو کەپێچەوانەی ئەوە بێت.

## حوكمی موچەی خانەنشینی پاش مردنی خانەنشینكراو:

موچـەی خانەنشـینی بەبەشـێك لـە لێجێمـاوی خانەنشـینە مردووەكـە دانانرێـت، بەمەش بەپێی بنەماكانی میرات ناگوازرێتەوە بۆ میراتگرانی، بەڵكو ئەمە بەیاسـایەكی تایبــەت رێــك دەخرێــت كەتێیــدا رەچــاوی بەرژەوەنــدی دارایــی گشــتی دەوڵــەتو، بەرژەوەندی میراتگرانی خانەنشینەكە دەكرێت.

چەندین هۆكار هەیە بـۆ ئـەوەی كـە موچـەی خانەنشـینی بـە بەشـێك لـەلێجێماو دانەنرێت، گرنگترینیان:

أ.موچــەی خانەنشــینی بیمەیەكــە لــە گەنجینــەی دەوڵــەت بــۆ ئــەو مرۆڤــەی گەیشتۆتە قۆناغێك توانای كاركردنی نیە پاش ئەوەی بەشێكی زۆری ژیـانو چالاكیو وزەی لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا بەسەر بردووە.

ب. موچەی خانەنشینی بەر لەوەرگرتنیو پـێش وادەی دابەشـكردنیو شایسـتە بوونی بەبەشێك لەدارایی گشتی وڵات دادەنرێت.

ج. بڕی موچەی خانەنشینی لەبـەر رۆشـنایی بنچینە كەسـیەكاندا دادەنرێـت، هەر بۆیە لایەنی كەسیی خانەنشـینكراو زاڵـترە بەسـەر لایـەنی داراییـدا، بـۆ نمونە گەر كەسێك مردوو كچێكی شـوو كـردووی هـەبوو ئـەوا موچـەكە یـان بەشێك لێی نادرێت بەو كچە چونكە بژێوی لەسەر ئەم نەبووە كـاتی مردنـی، هەروەها لەبەر ئەوەی مێردی هەیەو بژێوی ژیانی لەسەر ئەوە.

د. سەرچاوەی موچـەی خانەنشـینیەكە دارایـیـەكی گـوێزراوە یـان خانووبـەرە (عقــار) نیــە كەخاوەندارێتیەكــەی بــەر لــەمردنی هــی ئــەو بووبێــت تــا بەروبومەكەی وەك بنچینەكەی بگوازرێتەوە بۆ میراتگرەكانی.

ه. پێدانی موچەی خانەشینی: لەسەر بنـەمای پێویسـتی دانـراوە، لەبـەر ئـەوە بەردەوامی بیمەیە لە دەوڵەتەوەو پێویستی پێ بوونیەتی لەلایـەن هـاووڵاتی

یەوە، جا پێویست بوون‌و پێویست نەبوون‌و بڕو چۆنیەتیەکەی لەگەڵ پێویستی پێبوونی میراتگرەکاندا دەسوڕێتەوە.

و. دواینیان کە کۆتاش نیە چۆن دەبێت ئەم موچەیە بەسەر نەوەکانی داهاتوو لە خزمە نزیکەکانی خانەنشینکراوەکەو منداڵەکانیان‌و منداڵی منداڵەکانیان‌و بەرەو خوارتر دابەش بکرێت؟ چونکە گەر وامان دانا کە لێجێماوە ئەوا پێویست دەکات تا کاتی نەمانی میراتگرەکانی موچەکە بەردەوام بێت، وەك هەر داراییەکی سەلمێنراوی دیکە کە بەسەر ناچێت، وەك خانووبەرە کەلەنەوەیەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەیەکی دیکە بەبێ کۆتاییهاتن، ئەمەش لە عەقڵی هیچ کەسێکی هۆشیاردا جێی نابێتەوە.

## پایەکانی میرات لە یاسادا:

لە مادە (٨٦)ی یاسای باری کەسێتیدا هاتووە کە: (پایەکانی میرات سیانن):

١- میراتلێگیراو: مردووەکەیە.

٢- میراتگر: ئەو زیندووانەیە کە شایستەی میراتیەکەن.

٣- میراتیی: ئەمیش ماڵ‌و سامانی مردووەکەیە کە میراتگرەکانی دەیبەن.

## دەروازەی سێیەم
## مەرجەکانی میراتی

مەرجی هەرشتێك بریتیە لەوەی کەلەسەری راوەستاوە، بەشێك نیە لە ناوەرۆكو بوونەکەی.

میراتیش لەسەر چوار مەرج راوەستاوە کە ئەمانەن: مردنی میراتلێگیراو، لەژیاندابوونی میراتگر، هەبوونی پەیوەندی لەنێوان میرات لێگیراوو میراتگردا بە خزمایەتی یان هاوسەرێتی، نەبوونی بەربەستی میرات وەرگرتن لە میراتگردا.

**مەرجی یەکەم: مردنی میراتلێگیراو بەراستی، یان بەحوکمی، یاخود بەمەزندەکردن.**

أ. مردنی راستەقینە (الموت الحقيقي): بریتیە لەو مردنەی بەبینین، یان بیستن، یان بەلگەی روون دەسەلمێندرێت...

ب. مردن بەبڕیار (الموت الحكمي): ئەمەش بەفەرمانی دادوەر دەبێت، وەك فەرمان دەرکردنی بەمردنی دیار نەماوێك پاش ئەوەی مەرجە پێویستەکانی ئەو فەرمانەی تێدا هاتە جێ[1]، چونکە سامانی کەسە دیار نەماوەکە بەسەر میراتگرەکانیدا دابەش ناکرێت تا دادوەر بڕیار نەدات کە مردووە، کە فەرمانیدا

---

[1] مادة (٩٣) ی یاسای (رعاية القاصرين رقم (٧٨) لسنة ١٩٨٠ ) تێیدا هاتووە:-
بۆ دادگا هەیە بڕیار بەمردنی ونبوو بدات لەیەکێك لەم حاڵەتانەدا:
یەکەم: ئەگەر بەڵگەیەکی بنبڕ هەبوو لەسەر مردنی.
دووەم: ئەگەر چوارساڵ تێپەڕی بەسەر راگەیاندنی دیارنەمانیدا.
سێیەم: ئەگەر لەرەوشێکدا دیار نەما کە گریمانی تیاچوونی زیاتر بێتو دووساڵ بەسەر راگەیاندنی دیارنەمانیدا تێپەڕیبێت.

ئەو کاتە بەسەر زیندوەکاندا دابەش دەکرێت، هەر کەسێك پێش ئەوە مردبێت ئەوا میراتی پێ نابڕێت مەگەر فەرمانەکەی دادوەر پشتی بەگەڕانەوە بۆ کاتی پێشتر بەستبێت، لەم بارەشدا ئەوانەی ئەو کاتە زیندوو بوون میراتەکە دەیانگرێتەوە.

ج. مردنی مەزەندەکراو (الموت التقدیری): وەك بەمردوو دانانی ئەو کۆرپەلەیەی بەهۆی دەستدرێژی کرانە سەر دایکەکەوە لێی جیا دەبێتەوە، هەر کەسێك لە ئافرەتێکی دوو گیان بداتو بەو هۆیەوە کۆرپەلەکەی لەبار بچێتو بمرێت ئەوا بەپێی شەریعەتی ئیسلام پێویستە دەستدرێژیکار سزای مادی بدرێت کە پێی دەوترێت قەرەبوو (الغرة) ، کەبریتیە لەنیوەی دەیەکی قەرەبووی خوێنیکی تەواو[1]. لەم حاڵەتەدا ژیانی کۆرپەلەکە بەر لە دەستدرێژیەکە بە زیندوو مەزەندە دەکرێت، جا بەهۆی ئەوەی ژیانی مەزەندە کراوە، بەهەمان شێوە مردنەکەشی هەر بەمەزەندەیی یە.

**مەرجی دووەم - لەژیاندابوونی میراتگر:**

بۆ ئەوەی میراتگر میراتی لە میرات لێگیراوەکەیەوە پێ ببڕێت مەرجە ئەم لەژیاندا بێت کە ئەو مرد با بۆ چرکەساتێکیش بێت، دەبێت ئەم مانە پاش ئەو بسەلمێندرێت، خۆ گەر لەڕووداوێکی کەوتنەخوارەی فڕۆکەدا، یان پێکدادانی ئۆتۆمبێلدا، یاخود نغرۆ بوونی کەشتیدا، یان ئاگرکەوتنەوە، یان زەمین لەرزە، یاخود لافاو یان هەرشتێکی هاوشێوەی ئەوانەدا بەیەکەوە مردن، یان کەسێکیان پێش ئەوی تر لە ڕووداوەکەدا

---

[1] واتە ٥٪ ی قەرەبووی خوێنی تەواو، بەڵگەش لەسەر مردنەکەی هەر بەمەزەندە کردنە: خوای گەورە قەرەبوویەکی مادی لەسەر تاوانبارەکە پێویست کردووە بەهۆی ئەو تاوانەی کردوویەتی، قەرەبووەکەش هەروەك تاوانی دژ بە زیندووە هەربۆیە خوای گەورە ژیانی مەزەندە کردووە لەکاتی ڕوودانی تاوانەکەدا و مردنەکەشی بەهۆیەوە مەزەندە کردووە، لەبەر ئەوە ژیانی کۆرپەلەکە مەزەندە کراوە و بەشی خۆی لە لێجێماوی میرات لێگیراوەکەی بەر دەکەوێت کە بۆی ڕاگیراوە و شایانی هەر شتێکیشە کە بەراسپاردن بۆی دانرابێت.

مرد بەڵام نەسەلمێندرا کەکامیان بەر لەویتریان مردووە ئەوا میراتی لێ ناگرێت، بەڵکو بەپێی بۆچوونی زۆرینەی زانایان [1] میراتەکە بۆ میراتگرەکانی دیکە دەچێت، بەڵام زانایانی جەعفەری درێژتری دەکەنەوەو دەڵێن:

أ- گەر مردنەکە بەهۆی نغرۆ بوون یان رووخانەوە بوو، نەدەزانرا کامیان بەر لەوی دیکەیان گیانی دەرچووە، وا دادەنرێت هەریەکەیان کاتی مردنی ئەویتریان لە ژیاندا بووبێت، هەربۆیە لەو ماڵەی کەئەوی دیکە هەیبووە لەکاتی مردنەکەدا میراتی پێ دەبرێت نەك ئەوەی بەهۆی مردنی ئەمەوە بە میرات بەو دەگات، ئەم بۆچوونەش لای ئەوان کۆدەنگی لەسەرە.

ب- گەر بەهۆی رووداوێکی دیکەوە بوو جگە لە نغرۆبوونو رووخان وەك سوتانو رووداوەکانی فڕۆکەو ئۆتۆمبێل، لەمەشدا دوو بۆچوونیان هەیە: یەکێکیان ئەوەیە میراتیان لەیەك پێ نابرێت (هەروەك بۆچوونی زۆرینەی زانایان)، بۆچوونی دووەمیش ئەوەیە بڕیارەکە گشتگیر دەکەن بەجۆرێك کە هەر رووداوێکی پێشبینی نەکراو وەك ئەوانەی لەبڕگەی ئەلفدا باسکران دەگرێتەوە.

ت- خۆ گەر رووداوەکە نەمانی کتوپڕ (حتف الانف) بوو بەبێ رووداوێکی پێشبینی نەکراو وادەردەکەوێت لایان کە میرات لەیەك وەرناگرن [2].

---

[1] لە الأنوار (٢/٩)دا هاتووە: (خۆ گەر براو خوشك نغرۆ بوون، براکە ژنەکەیو کچێکی لەپاش بەجێما، خوشکەکەش مێردەکەیو کچێکی لەپاش بەجێما وای لێدەکرێت کەبراکە تەنها ژنو کچەکەی پاش مردنی هەیە، خوشکەکەش تەنها مێردو کچەکەی).

لە الخرشي (٨/٢٢٣)دا هاتووە: (لەبەربەستەکانی میرات بەرکەوتن نەزانینی ئەوەی کامیان پێش ئەوی دیکەیان مردووە، وەك ئەوەی خزمانێك لەگەشتێکدا بەیەکەوە مردن، یان شتیان بەسەردا رووخا، یاخود هەر رووداوێکی لەوجۆرە، ئەوا ئێمە وای دادەنێین بۆ هەریەك لەولە وەك ئەوەی کەس لەولەی لەپاش بەجێ نەماوە، بەڵکو کەسە زیندووەکانی لەمیراتگران لەپاش خۆی لێ بەجێماوە).

[2] (ایضاح الفوائد شرح اشکالات القواعد)ی حلي ٤/٢٧٦و لاپەڕەکانی دواتر. الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية ٢/ ٢٣٧.

**مەرجی سێیەم - هەبوونی پەیوەندی خزمایەتی یان هاوسەریتی لەنێوان میراتلێگیراو و میراتگردا:**

لەراستیدا هەبوونی ئەو پەیوەندییە بەسە بۆ ئەوەی لەسنووری رادەی خۆیدا لێجیماوەکە بگوازرێتەوە بۆی، بەلآم بۆ دادوەر نیە فەرمان بەوە بکات مەگەر پاش ئەوەی ئەو پەیوەندیە لەبەردەمیدا دەسەلمێندرێت، هەر بۆیە سەلماندن مەرجە بۆ دەرکردنی فەرمانەکە.

لەکاتی نەبوونی ئەو دوو هۆکارەدا (خزمایەتی و هاوسەریتی) هۆکاری سێیەم جێگایان دەگرێتەوە کە ئەویش سەرپەرشتیاریتی گشتی یە لەنێوان دەولەت و مردووەکەدا.

**مەرجی چوارەم - میراتگرەکە هیچ بەربەستێک لەو بەربەستانەی میرات بەرکەوتنی تێدا نەبێت**

کە لەدەروازەی چوارەمدا باسیان دەکەین، نەبوونی ئەو بەربەستانە لەگرنگترین مەرجەکانی گوێزرانەوەی خاوەندارێتی لێجێماوە بۆ میراتگرەکان، بەداخەوە زۆرێك لە نووسەران فەرامۆشیان کردووە، ئەمە لەکاتێکدا کەهەموو شتێك کەبوونی بەربەست بێت لە بەدیهاتنی فەرمانێکدا ئەوا نەمانیشی مەرجە بۆی.

یاسادانەری عێراقیش لە مادە (٨٦/ج) باسی ئەم مەرجانەی کردووە، تەنها کۆتا مەرجیان نەبێت کەباسی نەکردووە:

**مەرجەکانی میرات سیانن کەئەمانەن:**

١- مردنی میرات لێگیراوەکە بەمەرگی راستەقینەیی یان بەفەرمان لەسەردانی دادوەر.

٢- لەژیاندابوونی میراتگر پاش مردنی میرات لێگیراو.

٣- لایەنی میراتیەکە بزانرێت.

# دەروازەی چوارەم
# بەربەستەکانی میرات

بەربەست بریتیە لەوەی کە بەهۆی بوونیەوە حوکمەکە نایەتە جێ یان بەهۆیەوە بەتاڵ دەبێتەوە[1]، لێرەدا مەبەست لێی هەبوونی خەسڵەتێکە لەمیراتگردا کە دبێتە هۆی بێ بەریکردنی لەوەرگرتنی میرات، هەرچەندە ئەو میراتگرە هۆکارەکانی میراتی بەرکەوتنی تێدا بێت، ئەو بەربەستانەشی کە یەکدەنگیان لەسەرە: کوشتن و، جیاوازی ئاینە.

## ١- کوشتن:

زانایانی شەریعەت –جگە لە زاهریەکان– یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە بە پێی (دەق و ژیری) بکوژ میراتی لەو کەسە بەر ناکەوێت کە کوشتویەتی: لە رووی (دەق)ەوە لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): (لا یرث القاتل)[2]، واتە: بکوژ میراتی نادرێتێ، بەڵگەی عەقڵیش هۆکەی ئەوەیە تاوانبار ناکرێت رێگەی پێ بدرێت سودمەند بێت لەو تاوانەی ئەنجامی داوە، هەروەها بەهۆی بێ بەشکردنی تاوانبارەوە گیانی بێ تاوانان دەپارێزرێت و، رووداوەکانی کوشتن کەم دەبێتەوە، سەرەڕای ئەوەی کە (من استعجل شیئا قبل اوانه عوقب بحرمانه). واتە: هەرکەس کارێك پێش بخات لەوادەی خۆی بە بێ بەشکرانی لێی سزا دەدرێت.

بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو کوشتنە بەمەبەستی دەرکردنی گیانیەتی، لەرووی

---

[1] (مختصر المنتهى لابن الحاجب وشرحه)ی قاضي عضد الدين ٧/٢.

[2] (النسائي والترمذي وابن ماجه) گێڕاویانەتەوە. لەگێڕانەوەیەکی تردا (القاتل لا يرث) لەگێڕانەوەیەکی دیکەشدا (لايرث القاتل شيئا) واتە، بکوژ میراتی نادرێتێ. لەگێڕانەوەی مالیکدا:(ليس لقاتل شيء)، واتە: بکوژ هیچی بۆ نیە.

مەعنەویەوە لەگەڵ هەموو جۆرەکانی کوشتن هاوپشە، زانایـان لـەدیاریکردنی جـۆری بەربەستەکەدا را جیان:

حەنەفیـەکان دەڵـێن [1]: بەربەسـتەکە بکـوژە راسـتەوخۆکە دەگرێتـەوە کـە کوشتنەکە تۆڵە کردنەوە یان کەفارەتی تێدا پێویستە، بەڵام بوون بەهۆکاری کوشتن یان ئەو کوشتنەی تۆڵە کردنەوە یان کەفارەتی لەسەر نیە ئەوا نابێتە بەربەست.

ئەبازیەکان [2] و هەندێك لەشافیعیەکان[3] دەڵێن: بەربەستە رەهاکـە کوشـتنەکەیە بەهۆی رەهایی دەقەکەوە (لا يرث القاتل).

مالکیـــەکان [4] و جەعفەریـــەکان [5] وتویانـــە: بەربەســـتەکە دەســـتدرێژییە بەئەنقەستەکەیە، بەڵام بکوژی بەهەڵـە میراتـی لەخوێنەکـە پـێ نابرێـت لەسـەر ئـەم بنچینەیە میراتـی لـەو قـەرەبووە پـێ نادرێـت کـە کۆمپانیـای بیمـە بـەمیراتگرانی کوژراوەکـەی دەدات ئەگـەر هـاتوو یـەکێك لـە میراتگرەکـانی بکوژەکـە بـوو رووداوی کوشتنەکەش بەهۆی ئۆتۆمبێلەوە بوو.

زەیدیەکان [6] دەڵێن: بەربەستەکە کوشتنی دوژمنکارانەی بەئەنقەستە، جگە لەوە هیچی دیکە نابێتە بەربەستو یاسای وڵاتە عەرەبیەکانیش[7] هەمان شت دەڵێن.

---

[1] ابن عابدين (رد المحتار ٧٦٧/٦).

[2] شرح النيل وشفاء العليل ٢٦٩/٨.

[3] الانوار ٩/٢. له (مغني المحتاج ٣/) ٢٥ هـاتووه: (بكـوژ بـەرەهایی میراتـی لـەو كەسـەوە پـێ نادرێـت كـە كوشتویەتی ئیدی كوشتنەكە بەئەنقەست بێت یان نا، مسۆگەر بێـت یـان نـا، راسـتەخۆ بێـت یـان نـا، بەمەبەستی بەرژەوەندی بێت وەك باوك یان مامۆستا یـان مێـرد هەڵدەسـتێت بەلێـدان یـان وا نـەبێت، بەزۆربێت یان نا).

[4] الشرح الصغير ٢ / ٤٧٥.

[5] (الخلاف في الفقه)ی طوسي ٢ / ٣٩.

[6] البحر الزخار ٣٦٧/٥.

[7] وەك یاسای میسری مادە (٥) هاتووە: (لەبەربەستەكانی میرات كوشتنی میرات لێگیراوەكە بەئەنقەسـت، ئیدی بكوژەكە ئەنجامدەری راستەوخۆ بوو یان هاوبەش تێیدا، یاخود شاهێدی دەرێكـی درۆ بـوو، ئـەم شاهێدیەی بووە هۆی لەسێدارەدانو جێ بەجێكردنی لەسێدارەدانەكە ئەگـەر كوشـتنەكە ناحـەق بـوو، ←

یاسا دانەری عێراقی بەربەستەکانی میراتی باس نەکردووە، هەرچەندە پایەو مەرجەکانی لەمادە (٨٦)دا خستۆتە روو، هەروەها جۆری ئەو کوشتنەی کە دەبێتە بەربەست لە راسپاردن دیاری نەکردووە، لە مادەی (٢/٦٨) دا هاتووە: (ان لا یکون قاتلا للموصی)، واتە: نابێت بکوژی راسپاردنکارەکە بێت.

واتە: نابێت بکوژی راسپاردنکارەکەی بێت.

ئەمەش بەکەمو کورتی یاسایی دادەنرێت، زۆر پێویستە لەدەقەکەدا جۆری بەربەست لە راسپاردن و میرات دیاری بکرێت تا فەرمانەکانی دادگای عێراقی روون بێت لەبابەتەکانی کوشتنی میرات لێگیراو لەلایەن میرات گرەکەیەوەو کوژرانی راسپاردنکار لەلایەن راسپاردن بۆ کراوەوە.

رای پەسەندیش کەوەربگیرێت بریتیە لەبۆچوونی مالکیەکانو جەعفەریەکانو زەیدیەکان بەوەی کە بەربەستەکە بریتیە لە کوشتنی دوژمنکارانەی بەئەنقەست.

**ب- جیاوازی ئاین:**

لەپێناو رووەو یەکخستنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیو، ملکەچبوونی بۆ تاکە دەستورێك کەئەویش بریتیە لەدوایین دەستوور کەخوای گەورە ناردویەتیو قورئانی

---

هیچ پاساوێکی نەبوو، بکوژەکەش عاقڵ بوو تەمەنی گەیشتبووە پازدە ساڵ. تێپەڕاندنی مافی بەرگری رەوا (حق الدفاع الشرعی) بەپاساو ئەژمار دەکرێت)، یاسای سوریش مادە (٢٦٤) هاتووە: ئەمانە لەمیرات بێ بەش دەکرێن: بەربەستەکانی راسپاردن کەباسکران لە مادە (٢٢٣): ( رێگە نادرێت بەشی بدرێت لە راسپاردن ئارەزوومەندانە یان پێویست:

راسپاردن بۆ کراوێك کە راسپاردنکارەکەی خۆی بەئەنقەست کوشتبێت ئیدی بکوژی راستەوخۆ بووبێت یان هاوبەشی تێدا کردبێت گەر کوشتنەکە بەناحەق بوو، هیچ پاساوێکی نەبوو، ئەگەر کوشتنەکە ناحەق بوو، هیچ پاساوێکی نەبوو، بکوژەکەش عاقڵ بوو تەمەنی گەیشتبووە پازدە ساڵ.

بەشداربوونی بەئەنقەست لەکوشتنی راسپاردنکارەکەدا، شاهێدی دانی لەسەری بە درۆ کەبووبێتە هۆی کوشتنی بەهۆکار دادەنرێت). لەیاسای تونسیشدا بەشی (٨٨)...لە (مدونة الأحوال الشخصیة)ی مەغریبی بەشی (٢٢٩).

پیرۆزە[1] و هەموارکاری هەموو دەستوورە ئاسمانیەکانی دیکەیەو، بەمەبەستی دانان بە بوونی یەك بەدیهێنەرو یەك باوك بۆ مرۆڤایەتی، ئیسلام بڕیاری داوە: جیاوازی ئاین بەربەست بێت لە وەرگرتنی میراتی، ئەمەش لەفەرمودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە: (لا يتوارث أهل الملتين). واتە: پەیڕەوانی دوو ئاینی جیا میراتی لەیەك ناگرن.

بەڵام لەلایەکی دیکەوە دانی ناوە بە دروستی راسپاردن بۆ کەسێك کە ئاینیشی جیا بێت ئەمەش لەچوارچێوەی ئەو لێبوردنە فراوانەدایە کەلەئیسلامدا هەیە، قەرەبووکردنەوەی بەشێك لەو لێجێماوەی کەمیراتگر بەهۆی جیاوازی ئاینەوە لەدەستی دەدات، هەروەها لەبەر ئەوەی راسپاردن جۆرێکە لەدەستبار(التكافل)ی ئابووری کە ئیسلام فەرمانی پێ کردووە.

**میراتی هەڵگەڕاوە:**

هەڵگەڕاوە: مەبەست لێی هەر کەسێکی باڵغی عاقڵە کەلەئاینی ئیسلام پاشگەز بوبێتەوە، حوکمەکەشی بەم جۆرەیە:

أ- میراتی پێ برانی لەکەسانی دیکە: زانایانی شەریعەت کۆدەنگن کەمیراتی لەکەسانی دیکەوە پێ نابڕێت ئیدی ئەو کەسەی دیکە موسڵمان بێت یان نا، میراتی لەموسڵمان پێ نابڕێت چونکە بەهۆی هەڵگەڕانەوەیەوە پەیوەندیان بەیەکەوە پچڕاوە، لە ناموسڵمانیش میراتی پێ نابڕێت چونکە ئەو کەسەی دیکە لەسەر دینەکەی خۆی ماوەتەوە بەپێچەوانەی ئەمەوە کەهەڵگەڕاوەتەوە.

ب- کەسانی دیکە میراتی لێ بگرن: لەمەدا زانایان بۆچوونیان جیاوازە، بەمجۆرە:

١-هەندێك وتویانە: ئەوەی کاتێ موسڵمان بووەو بەدەستی هێناوە بۆ میراتگرەکانی دەبێت، ئەوەشی پاش هەڵگەڕانەوە بەدەستی هێناوە

---

[1] خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ﴾ سورة الشورى /١٣.

دەستکەوت دەبێت بۆ موسڵمانانو دەدرێت بەدارایی گشتی[1]..

٢-هەندێکی دیکە وتویانە: هەمووی بۆ دارایی گشتی دەبێت[2].

٣-هەندێکی دیکەش دەڵێن: هەمووی بۆ میراتگرەکانیەتی چونکە هەردوو هۆکاری ئیسلامبوونو خزمایەتیان تێدایە[3]..

**جیاوازی وڵات (اختلاف الدارین):**

خاکی ئیسلام یەکەو جیاوازی لەنێوانیاندا نیە، چونکە بۆ هیچ حکومەتێکی جیهانی ئیسلامی ڕەوا نیە شەڕ لەدژی وڵاتێکی تری ئیسلامی بکات، بەهەمان شێوە لەنێوان وڵاتێکی ئیسلامیو وڵاتێکی نا ئیسلامیدا گەر ئەو دەوڵەتانە هەریەکەیان جەنگی دژی ئەوی تریان ڕانەگەیاندبێت.

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا: موسڵمان میراتی موسڵمانی پێ دەدرێت با وڵاتورەگەزنامەشیان جیاواز بێت، چونکە یاسای باری کەسیی موسڵمانان کەسییەو لەهەر کوێ بنو بۆ هەر کوێ بڕۆن لەگەڵیاندایە، لەبەر ئەوە موسڵمانێکی عێراقی میراتی لەموسڵمانێکی تورکیا پێ دەبڕێت و بەوجۆرە بۆ شوێنانی دیکەش، بەڵام جیاوازی وڵات بەسەر ناموسڵماندا جێ بەجێ دەکرێت، بۆ نمونە: جولەکەیەکی عێراقی لەگەڵ جولەکەیەکی نیشتە جێی ئیسرائیل لەفەڵەستینی داگیرکراو میراتیان لەیەك پێ نابڕێت مادام لەباری جەنگدا بین لەگەڵ ئەو ڕژێمە.

---

[1] ( أبو حنيفة وسفيان الثوري) هەمان شتیان وتوە.

[2] (مالك وشافعي وئیمام احمد في قوله المعتمد) ئەمەیان وەرگرتووە.

[3] ئەمەشیان گێڕاوەتەوە لەگەورەمان (أبي بكر الصديق ﷺ و علي بن أبي طالب ﷺ وابن مسعود ﷺ) و هەردوو هاوەڵەکەی ئەبو حەنیفە (محمد وأبو يوسف) بەمە کاریان کردووە، لە (شرح النيل (٢٦٣/٨) هاتووە: (سامانی هەڵگەڕاوە لە ئاین ئەگەر لای زۆرینەی موسڵمانان لەحیجاز مرد، لەبەر خزمایەتیشی لەگەڵ خەڵکی موسڵمانی عێراق لەبەر ئەوەی دوو هۆکاری تێدایە: خزمایەتیو ئیسلام، جیاوازیش نیە لەنێوان ئەوەی لەکاتی ئیسلامبوونیدا بەدەستی هێناوە یان کاتی هەڵگەڕانەوەی بەپێچەوانەی حەنەفیەکانەوە) لەوانەیە مەبەستی ئەبو حەنیفەو ئەو زانایانە بێت کەشوێن ڕای ئەو کەوتوون.

لەسەر ئەو بنەمایە جیاوازی وڵات لەحاڵەتی جەنگداو تەنها بۆ ناموسڵمان دەبێتە بەربەست.

**جیاوازی رەگەزنامە و میرات:**

لەئیسلامدا رەگەزنامەی موسڵمان یەکە، ئەویش ئیسلامە، ئیدی لەهەر کوێ بێت و بۆ هەرکوێ بڕوات، یاسای کەسیی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت، بەڵام گۆڕانکاریەکانی ژیان و دابەشبوونی جوگرافی نوێ و هاتنە ئارای سنوورە نێو دەوڵەتیەکان بونەتە هۆی ئەوەی هەندێك لەیاساکان لەبەر کاریگەری جیاوازی رەگەزنامە لەسەر پەیوەندیە دارایی و نا داراییەکان لەنێوان ئەو گەلانەی رەگەزنامەیان جیاوازە ئەرزشی بۆ دابنێن، لەنێویشیاندا راسپاردن و میرات، لەو یاسایانەش یاسای عێراقی یە کە رێگە نادات بە گوێزرانەوەی موڵکیەتی خانوبەرە لە راسپاردنکارەوە بۆ راسپاردن بۆ کراوێك کە رەگەزنامەیان جیاواز بێت، لەمەدا تەنها راسپاردن لە شتی گوێزراوەدا رێگە پێدراوە بەو مەرجەی وڵاتەکەی دیکەش ئەمە بۆ عێراقی رێگە پێ بدات، هەروەك لەمادە (٧١)[1]: (وتصح الوصية بالمنقول فقط مع اختلاف الدين، وتصح به مع اختلاف الجنسية بشرط المقابلة بالمثل). واتە: راسپاردن تەنها لەشتی گوازراوەدا رێگە پێدراوە بۆ کەسی ئاین جیاوازو، دروستیشە بۆ جیاوازی رەگەزنامە بەو مەرجەی وڵاتەکەی تر مامەڵەی هاوشێوە بکات.

جیاوازی رەگەزنامە بە بەربەست لەمیرات وەرگرتن دانانرێت لەشتی گوێزراوەو خانوبەرەدا بەمەرجی مامەڵەی هاوشێوە، لەحاڵەتی نەبوونی مامەڵەی هاوشێوەدا یان ئەو بیانیەی کەلەعێراق دەمرێت و هیچ میراتگرێکی نیە ئەوا لێجێماوەکەی دەبێتە هی دەوڵەت هەرچەندە یاسای وڵاتەکەی پێچەوانەی ئەمە بێت[2].

---

[1] لەیاسای باری کەسیی عێراقی بەرکاردا.

[2] لە مادە (٢٢)ی یاسای مەدەنی عێراقی بەرکاردا هاتووە: (بابەتەکانی میرات یاسای میراتی لەسەر پەیرەو دەکرێت لەکاتی مردنیدا لەگەڵ رەچاوکردنی ئەمەی خوارەوە: جیاوازی رەگەزنامە بەربەست نیە بۆ میرات وەرگرتن لە سامانی گوێزراوەو خانوبەرەدا، بەڵام عێراقی بیانی میراتی لێ وەرناگرێت مەگەر ←

# باسی دووەم
# مافە پەیوەندارەکان بە لێجێماوەوە

زانایانی شەریعەت کۆدەنگن کە مافە پەیوەندارەکان بە لێجێماوەوە پاش کۆچی دوایی کەسەکە وەك یەك نین، بەڵکو هەندێکیان بەهێزو گرنگترن لەوانی دیکەیان، لەبەر ئەوە گرنگتر پێش دەخرێت بەسەر گرنگدا، سەرەتا تەدارەکی کفنودفن دەکرێت، ئەوجا نەفەقەی ئەوانەی کەنەفەقەی کێشابوون پێش مردنی، دوای ئەوە دانەوەی قەرزەکانی، پاشان جێبەجێکردنی راسپاردنەکانی، پاشتر دابەشکردنی میراتیەکەی بەسەر میراتگرەکانیدا، ئەم مافانەش لەچوار دەروازەدا روون دەکەینەوە:

---

یاسای وڵاتەکەی رێگە بدات عێراقی میراتی لێی بەریکەوێت. ئەو بیانیەی کە کەسی نیەو سامانەکەی لەعێراقدایە دەدرێتە دەوڵەتی عێراق با یاسای وڵاتەکەیشی پێچەوانەی ئەمە بێت.

مادەی (٢٦)ی پرۆژەی یاسای مەدەنی نوێش هەروەك ئەوە بەڵام جیاوازیەکی بچوك هەیە لەدەربڕینیدا.

# دەروازەی یەکەم
# خەرجیەکانی بەڕێکردنی کۆچکردوو بەرەو ئارامگاکەی

یەکەمجار بەخەرجیەکانی شۆردنو کفنکردنو گواستنەوەی تەرمی کۆچکردووو ئەو کەسەشی لەگەڵ ئەمدا مردووەو خەرجی لەسەر ئەم بووە بۆ گۆڕستان دەست پێدەکات.

خەرجیەکانی پرسەو تازیۆ، ئامادەکردنی خواردن بۆ ئامادەبووانی پرسەکە لەنێو ئەو خەرجیانەدا نیە، چونکە هەموو ئەوەی لەو بوارەدا خەرج دەکرێت داهێنراو (بدعة)ێکی نابەجێ یەو، ئیسلام داوا دەکات خزمو کەسو کارو دەرو دراوسێو هاوڕێکانی سێ ڕۆژ خواردن بۆ کەسو کاری مردووەکە ئامادە بکەنو، هاوکارو بەشدار بن لە دڵتەنگیو ناڕەحەتیانداو هانیان بدەن لەسەر ئارامگریو ڕازیبون بەقەزاو قەدەری خوای گەورە.

پێویستیشە خەرجی گواستنەوەی کۆچکردوو بۆ گۆڕستان دوور بێت لەزیادە ڕۆییو دەست بڵاویو، باری دارایی مردووەکە ئەو کاتەی لەژیاندا بووە ڕەچاو بکرێت کە هەبوو بووە یان نەبوو.

پێشخستنی خەرجیەکانی کفنو دفن لای زۆرینەی زانایان بەو مەرجەیە کە مافی کەسی دیکەی پەیوەندار لە میراتیەکەدا نەبێت.

هەندێکی دیکە وای دەبینن دانەوەی قەرزەکان بەرەهایی بخرێتە پێش خەرجی کفنو ناشتنیش(1).

---

[1] (ابن حزم) لە(المحلی ٩/٢٥٣) دەڵێت: (یەکەمجار قەرزەکانی خوای گەورە لە لێجێماوەکە دەردەکرێت، ئەگەر شتێ مایەوە ئەوا قەرزی کەسانی تری پێ دەدرێتەوە، لەوەش زیاتر بوو کفنی مردووەکەی پێ دەکرێت، خۆ ئەگەر نەمایەوە ئەوا کفنو شاردنەوەکەی لەسەر ئەوانە دەبێت کەئامادەبون لەخزمانو ←

پێشەوا ئەحمەد (رەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت مافی ئامادەسازی کفن‌و ناشتن پێش هەموو مافەکانی دیکە بخرێت وەك پێوانە کردنێك بەو کاتەی لەژیاندا بووە، خۆ گەر ماڵ‌و سامانەکەی دەستی بەسەردا گیرا یان بەفەرمانی دادگا فرۆشرا ئەوا ئەو ماڵ‌و سامانەی ناگرێتەوە کە لەچوارچێوەی پێویستیەکانی ژیاندایە وەك خانووو جل‌و بەرگ‌و خواردن..

یاسادانەری عێراقیش باشی کردووە کە ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووەو لەمادە (٧٨) دا هاتووە:

واتە: ئەو مافانەی پەیوەندداری بە لێجێماوەکەوە پاش مردنی میرات لێگیراو چوارن هەندێکیان پێش ئەوانی دیکەیانە بەمجۆرە:

١- کفن‌ودفنکردنی مردوو بەشێوەیەکی شەرعی.

٢- دانەوەی قەرزەکانی، لەهەموو ماڵەکەی دەردەکرێت.

٣- جێبەجێکردنی راسپاردنەکانی‌و، لە سێیەکی ماوەوەی ماڵەکەی دەردەکرێت، لەگەڵ ئەوەدا راسپاردنی پێویست (الوصیە الواجبە) دەخرێتە پێش راسپاردنی ئاسایی.

٤- ئەوەی دەمێنێتەوە دەدرێتە میراتگران، جا ئەگەر میراتگری خاوەن بەش‌و خزمی پشتی نەبوو ئەوا میراتیەکە دەدرێتە خزمی سکی، ئەگەر ئەوانیشی نەبوو ئەوا دەدرێتە دەوڵەت‌و دەوڵەت میراتگری ئەوانەیە کە میراتگریان نیە.

---

کەسانی تر، بەڵام گومان لەوەدا نیە کە قەرزێك پەیوەندار بوو بەماڵێکی دیاریکراوەوە لە لێجێماوەکەدا ئەوا پێش تەدارەکی مردووەکە دەخرێت، لەبەر ئەوە پێویستە مافی خاوەن قەرزی رەهن بخرێتە پێش خەرجیەکانی کفن‌و ناشتنی).

# دەروازەی دووەم
# مافی خاوەن قەرزەکان
# کە پەیوەندداره بە لێچێماوەوە

قەرز: بەمانا تایبەتەکەی بریتیە لە هەموو مافێکی دارایی کە لەبنەرەتدا پەیوەستە بەئەستۆی کەسێکی تر، ئیدی پەیوەندی بەسامانەکەیەوە بێت یان نا، هاو واتای مافی کەسییە (الحق الشخصی) یە لەیاساداو، جگە لەمە بە مالّینەو هاو واتای مافی مالّینەیە (حق العینی)یە بەپێچەوانەی ئەوانەی واگومان دەبەن کەقەرز چوارچێوەکەی تەسکترە لەمافی کەسییو مالّینە فراوانترە لە مافی مالّینە (الحق العینی) [1].

لەسەر ئەو بنەمایەی کەقەرزەکە ئەگەر پەیوەستبوو بەسامانی قەرزارەکەوە دەگوڕێت بۆ مالّینە هەروەك لەحالّەتی مایەپوچ (ئیفلاس)ی‌و گلدانەوە (حجز) خستنە سەر مایەپوچ بوو، هەروەها وەك حالّەتی مردنی قەرزار، ئەم گومانەش وەك واقیع نیە چونکە ئەگەر پەیوەستبوو بەسامانی قەرزارەکەوە ئەوا لەبەر بەرژەوەندی خاوەن قەرزەکە خەسلّەتی قەرز لەدەست نادات وەك حالّەتی بەبارمتەدانان(رەهن)، هەروەها پێناسەی مافی مالّینە نایگرێتەوە کە بریتیە لە دەسەلآتێکی راستەوخۆی کەسێکی دیاریکراو بەسەر شتێکی دیاریکراوەوە کەمافی بەکارهێنانو مامەلّە پێکردنو قۆستنەوەی هەیە.

---

[1] وەك مامۆستا (السنهوري) لە (مصادر الحق ١٨/١ ) دەلّێت: (جیاوازی قەرزو مالّینە لەفیقهی ئیسلامیدا جیایە لەجیاوازی نێوان مافی کەسییو مافی مالّینە لەفیقهی رۆژئاوادا چونکە قەرز هەموو مافێکی کەسی نیە بەلّکو جۆرێکە لەجۆرەکانی، مالّیش مافی مالّینەو هەندێ لەمافی کەسیش دەگرێتەوە کە بریتیە لە پابەندبوون بەمالّینەکەوە پاشان قەرز بچوکترە لەمافی کەسییو مالّ فراوانترە لەمافی مالّینە).

ئەستۆگری (الذمة): زانایانی ئوصول[1] بەچەندین شێوە کە پڕ بەپێستی نیە پێناسەیان کردووە، لەوانە هەیانە پێناسەیەکی شەرعی بۆ کردووە کەبەهۆیەوە دەبێتە خاوەنی ماڵەکەی‌و ئەوەی لەسەریەتی، ئەمەش تێکەڵکردنە لەنێوان شایستەیی مافبوونی تەواو (أهلية الوجوب الكاملة)و ئەستۆگری دارایی (الذمة المالية).

زانایانی یاساناسیش وا پێناسەیان کردووە کە کۆی ئەو مافو پابەندییانەیە کەلەئەستۆی مرۆڤدایە یان بریتیە لە چوارچێوەیەك بۆ ئەو مافو پابەندییانە. دیسان ئەم پێناسەیەش نا لۆژیکیە چونکە لەزەوتکردنی لەسەر داواکراو (المصادرة على المطلوب) (یان مەحاڵبوونی لۆژیکی) تێدایە، لەبەر ئەوەی بوونی ئەستۆگری دەوەستێتە سەر بوونی مافو پابەندییەکان، بوونی ئەم مافو پابەندیانەش دەوەستێتە سەر ئەستۆگری دارایی چونکە پێش بوونی ئەو ئەستۆگریە نایەتە دی.

قورئانی پیرۆزیش ئەستۆگری بەوە داناوە کە گەردن (عنق)ی مرۆڤە، لەمبارەیەشەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ﴾[2]. باڵندەش کاری چاکەو خراپەیە، نهێنیش لەهەڵبژاردنی ئەم بەشەی مرۆڤدا بۆ ئەوەی ئەستۆگیری ئەوەیە کە ئەڵقەی بەیەك گەیاندنی دەزگای بیرکردنەوە (دەماغ)و دەزگای کارکردن (دەستو قاچەکان)ە.

## کەڵەکەبوونی قەرز (تزاحم الديون):

ئەو قەرزانە پێش دەخرێت کەپەیوەستن بە ماڵێنە میراتیەکەوە، هەروەك لەبارمتەدانان (رەهن)دا هەیە لەسەر قەرزە رەهاکان (ئاساییەکان)، گەر میراتیەکە بەشی دانەوەی هەموویانی نەدەکرد:

---

[1] لەوانەش (صدر الشريعة) هەروەك لە ( التوضيح والتنقيح ٣/ ١٥٢).

[2] سورەتی الإسراء /١٣.

أ- قەرزی ساغیو نەخۆشین:

١- زۆرینەی زانایان جیاوازیان نەکردووە لەنێوان قەرزی حاڵەتی ساغیو قەرزەکانی حاڵەتی نەخۆشینی سەرەمەرگ لە رووی دانەوەیانەوە لە میراتیەکە.

٢- حەنەفیەکانو حەنبەلیەکان وتوویانە قەرزی حاڵەتی ساغی دەخرێتە پێش حاڵی نەخۆشیەوە.

ب- قەرزی خوداو قەرزی خەڵك:

١. زاهریەکان [1] و شافعیەکان وتوویانە ئەوەی قەرزی خوایە لەسەر ئەو کەسە دەخرێتە پێش قەرزی خەڵك بەپێی ئەو فەرموودەیەی کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: (ودين الله احق ان يُقضى)[2]. واتە: قەرزی خوا لەپێشترە کە بدرێتەوە.

٢. حەنەفیەکان[3] وتوویانە بەمردنی قەرزەکانی خوا لەسەری نامێنێت چونکە مردن لەکارکەوتنی تەواوە و ئەوەش پێچەوانەیە لەگەڵ مانەوەی لەئەستۆبوون (التكليف)و لەبەر ئەوەی میراتگرەکانی پابەندنابن پێوەی لەبەر ئەو فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾[4].

٣. مالیکیەکان [5]و جەعفەریەکان [6]وتوویانە قەرزی خەڵکی دەخرێتە پێش قەرزەکانی خودا لەبەر ئەوەی خەڵك پێویستی پێیەتیو خوا گەورە پێویستی پێی نیە.

---

[1] المحلى ٩/٢٥٣، ٢٥٤.

[2] أخرجه البخاري (الفتح ٤/١٩٢) ط. السلفية، ومسلم (٢/٨٠٤) ط. الحلبي.

[3] تبيين الحقائق للزيلعي ٦ / ٢٣٠.

[4] الأنعام : ١٦٤

[5] مختصر سيدي خليل وشرحه للخرشي ٨/١٩٧.

[6] اللمعة الدمشقية وشرحها الروضة البهية ٢ / ١١٥.

**میراتیەکی نغرۆبوو لەقەرزدا و چارەنووسی ئەستۆگری (التركة المستغرقة بالديون ومصير الذمة):**

أ- هەندێك لەزانایان وتوویانە: میراتی نغرۆ بوو لەقەرزدا دەبێتە بەربەست لە گوێزرانەوەی خاوەندارێتیەکەی بۆ میراتگرەکانی لەپاش مردنی میراتلێگیراوو پێش دانەوەی قەرزەکان [1].

ب- هەندێکی دیکەیان جیاوازیان کردووە لەنێوان نغرۆبوو لەگەڵ نغرۆ نەبوودا بەوەی کە دووەمیان تەنها لەوەندەی کە بگاتە رادەی قەرزەکە بەربەستە [2].

ت- هەندێکی دیکەیان وتوویانە بەرەهایی نابێتە بەربەست چونکە میراتگر دەبێتە جێگرەوەی میراتلێگیراو لە ساماندا، جا هەروەك چۆن قەرزەکە نەبوو بووە هۆی بەربەستی خاوەندارێتی میراتلێگیراوەکە بەسەر ماڵەکەیەوە کە نغرۆبوو بوو بەهەمان شێوە بۆ ئەوانەشی جێی دەگرنەوە بە جێگرتنەوەیەکی ناچاری (خلافة اجبارية) نابێتە بەربەست [3].

پەسەندترین و لەپێشترینیان بۆ ئەوەی کاری پێ بکرێت رای سێیەمە کەدەڵێت قەرز نابێتە بەربەست لەگوێزرانەوەی خاوەندارێتی رەها بەپێی ئەم بەڵگانە:

١- گشتگیری ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((من ترك حقا أو مالا فلورثته)) [4]، واتە: ئەو کەسەی مافێك یان ماڵێکی لەپاش بەجێما ئەوا بۆ میراتگرەکەیەتی.

جا تێگەیشتنی گشتی لەم دەقە ئەوەیە: هەر کەس بمرێت، ئیدی قەرزار بێت

---

[1] ئەمەش بۆچوونی مالیکیەکان و زۆرینەی حەنەفی و زاهریەکان و قسەی شافیعیەکان و رای جەعفەریەکان و حەنبەلیەکانە.

[2] ئەمەش بۆچوونی حەنەفیەکانە.

[3] ئەمەش بۆچوونی پەسەندە لای شافیعیەکان و بۆچوونی زانایانێکی حەنەفی و حەنبەلی و جەعفەری و یەکێکە لەدوو بۆچوونەکەی ئەبو حەنیفە.

[4] رواه البخاري، الفتح ٩/١٢، ط. السلفية.

یان قەرزار نەبێت و، لەپاش خۆی مافێك یاخودماڵێکی بەجێ هێشتبێت ئەوا بۆ میراتگرەکانیەتی، قەرزیش نابێتە بەربەست مەگەر بۆ مامەڵەپێکردن و دابەشکردن نەبێت.

٢- میراتگر جێگرەوەی میراتلێگیراوە، جێگرەوەیەکی ناچارییە، هەروەك چۆن قەرزەکە بۆ میراتلێگیراوەکە نەبوو بووە بەربەستی بۆ میراتگرەکانیشی بەهەمان شێوەیە.

٣- گەر قەرزەکان درانەوە یاخود خاوەن قەرزەکان دەستیان لەقەرزەکەیان هەڵگرت ئەوا میراتیەکە دەبێتە موڵکی میراتگرەکانی بەپێی کاریگەری پێشخۆیی(الأثر الرجعي) لەچرکەساتی مردنی میراتلێگیراوەکەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەندارێتی لەکاتی مردنەکەوە دەگوازرێتەوە بۆیان، بەڵام قەرزەکان دەبنە بەربەست لە هەڵسوکەوت پێکردنو دابەشکردنی لە نێوان میراتگرەکاندا پێش دانەوەی قەرزەکان.

**بەرهەمی راجیاییەکە:**

ئەم راجیاییە دەبێتە هۆی جیاوازی لەم ئەحوکمانەدا:

١. گەشەکردنی میراتیەکە بۆ میراتگرەکانیەتی، بەپێی بۆچوونی ئەوەیان کەدەڵێت خاوەندارێتیەکە دەگوێزرێتەوە لەکاتی مردنیەوە و دڵنیاییە (ضمان) بۆ خاوەن قەرزەکان بەپێی ئەو بۆچوونەی کەدەڵێت دەبێتە بەربەستی.

٢. خەرجیەکانی پارێزگاریکردن لە میراتیەکە لەسەر میراتگرەکانە، بەپێی بۆچوونی ئەوەیان کەدەڵێت دەگوازرێتەوەو، لەسەر خودی میراتیەکە دەبێت بەپێی بۆچوونی ئەوەیان کە دەڵێت ناگوازرێتەوە.

٣. ئەگەر هاوبەشی مردووەکە پشکەکەی خۆی فرۆشت لەو ماڵەی کە هاوبەش بوو لەنێوانیاندا، ئەوا میراتگرەکانی مافی هەڵگرتنەوە (حق الشفعه)یان هەیە بەپێی بۆچوونی ئەوەیان کەدەڵێت خاوەندارێتیەکەی دەگوازرێتەوە بۆ

میراتگرەکانی، بەپێی ئەو بۆچوونەکەی کەپێچەوانەی ئەمەیە ئەوەیان بۆ نیە.

٤. هەڵس و کەوت پێکردن دەبێت بەڵام جێ بەجێ ناکرێت تا ئەو کاتەی قەرزەکان دەدەنەوە یان خاوەن قەرزەکان دەستی لێ هەڵدەگرن بەپێی بۆچوونی ئەوانەی دەڵێن دەگوێزرێتەوە، بەتاڵیشە بەپێی بۆچوونی ئەوانەی بۆچوونیان پێچەوانەیە.

**چارەنووسی ئەستۆگریەکە (مصیر الذمة):**

فیقهی ئیسلامی جیاوازە لە فیقهی رۆژئاوایی چونکە ئەو رای وایە ئەستۆگیری میراتگر بەدرێژەپێدەری ئەستۆگیری میراتلێگیراو دابنێت و، میراتگرەکان پابەندن بەدانەوەی هەموو قەرزەکان با لە میراتیەکەش زیاتر بێت، مەگەر میراتیەکەیان لەسنووری قەرزەکەدا قبول نەبێت، یاخود گەر دەست هەڵنەگرن لە میراتیەکە.

رای زۆرینەی زانایانی شەریعەت ئەوەیە: ئەستۆگیری مرۆڤ بریتیە لەوەی لەژێر رکێفیدایە و واتە لەو مافانەی هەیەتی و لەو ئەرک و پابەندیانەی لەسەریەتی، ئەمەش بە مردنی دەمرێت و میراتگرەکانی ناچار نین لەهیچ بارێکدا ئەو قەرزانەی میراتلێگیراوەکەیان بدەنەوە لەسنووری لێجێماوەکەدا نەبێت، بەڵام هەندێکیان وتوویانە: ئەستۆگیریە گریمانەکراوەکە خراپبووەکە لەپێناوی پاراستنی مافی خاوەن قەرزەکان دەمێنێتەوە.

## دەروازەی سێیەم
## مافی راسپاردن بۆ کراو لە میراتیدا

زانایانی شەریعەتی ئیسلام کۆدەنگن لەسەر ئەوەی مافی راسپاردن بۆ کراو دەکەوێتە پاش مافی خاوەن قەرزەکان کەپەیوەستن بە میراتیەکەوە، ئەمەش بەهۆی بوونی دەقی روونی قورئانی پیرۆز لەمبارەیەوە.

راسپاردن بۆ کراو لەکاتی بوونی پایەو مەرجەکانو دەرباز بوون لە بەربەستەکانی راسپاردن، ئەو کاتە شایستەی راسپاردنەکە دەبێت، مەرجە ئەوەی راسپاردن کراوە بۆی لە سێ یەکی میراتیەکە زیاتر نەبێت، پاش دەرکردنی خەرجیەکانی کفنو ناشتنی مردووەکەو دوای دانەوەی قەرزەکانی، گەر لەسێ یەك زیاتر بوو ئەوا پێویستی بەڕەزامەندی میراتگرەکانە، مافی راسپاردن بۆ کراویش دەخرێتە پێش مافی میراتگرەکانی، لەبەر رۆشنایی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەدا: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾.

بەلام پێشخستنی راسپاردن بەسەر مافەکانی میراتگرەکاندا جیاوازە لە پێشخستنی قەرز بەسەر راسپاردن و بەسەر مافی میراتگردا:

أ- ئەوەی راسپاردن کراوە بۆی گەر ماڵینەیەکی دیاریکراو بوو وەك خانوو یان باخ و مافی راسپاردن بۆ کراوەکە پەیوەستبوو بەخودی ئەو ماڵینەوەو پاشگەز بوونەوەی تێدا نەبوو بۆ ماڵینەیەکی دیکە یان بەرانبەر نرخەکەی بەڕەزامەندی راسپاردن بۆ کراوەکە نەبێت بەویستو ئارەزووی خۆی لەکاتێکدا باڵغو عاقڵ بێت، ئەوا پێش دابەشکردنی لێجێماوەکە دەدرێتە دەستی یان لەکاتی دابەشکردنەکەدا پێی دەدرێت ئەمە ئەگەر لە سێ یەك

زیاتر نەبوو، خۆ گەر زیاتر بوو میراتگرەکانیشی ڕێگەیان بەو زیادەیە نەدا ئەوا ماڵینەکە یان بەهاکەی لەسنووری سێ یەکدا پێی دەدرێت.

خۆ ئەگەر ئەو ماڵینەیە کە راسپاردن کراوە بۆی وەریگرت یاخود ئەوەی راسپاردن کراوە پێی بدرێت تیاچوو ئەوا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەو تیاچوونە گەر بەهۆی هەڵەی کەسی تر یاخود کەمتەرخەمی میراتگرەکانەوە بوو ئەوا لەبری ئەوە قەرەبوو دەکرێت.

ب- خۆ ئەگەر ئەوەی راسپاردن کراوە پێی بدرێت بەشێکی باو (حصه شائعه)ی لێجێماوەکە بوو وەك سێ یەکی یاخود چوار یەکی یان پێنج یەکی، لێرەدا راسپاردن بۆ کراو بەهاوبەشی میراتگرەکان دادەنرێت لە ئەوەی ماوەتەوە لە لێجێماوەکە دوای دەرکردنی دوومافەکەی یەکەم، وەك یەکێك لەوان دەبێت جا لێرەدا پێشخستنی راسپاردن تەنها لە رووی رواڵەتیەوەیە، دەنا لە رووی کرداریەوە هیچ پێشخستن‌و دوا خستنێك لەئارادا نیەو، راسپاردن بۆ کراو شایستەی هەر شتێك بێت زیاد یان کەم ئەوا میراتگرەکانیش دوو لەسەر سێ یەکەی دیکەیان پێ دەبرێت ئەگەر هاتوو پشکە باوەکە یەك لەسەر سێی لێجێماوەکە بوو.

خۆ ئەگەر شتێك لە لێجێماوەکە پێش دابەشکردن فەوتا ئەوا بۆ هەموویان وەك یەکەو لەسەر هەموویانەو راسپاردن بۆ کراوەکەش سێیەکی ئەوەی پێ دەدرێت کەپاش تیاچوونەکە ماوەتەوە، بەپێچەوانەی قەرزەوە کە ئەگەر بەشێك لە لێجێماوەکە پێش دانەوەی قەرزەکە فەوتاو هەندێکی تری لێ مایەوە، ئەوا قەرزارەکە لەوەی ماوەتەوە مافی تەواوی خۆی دەبات[1].

---

[1] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە: بدائع الصنائع ١٠ / ٤٨٥٠ التاج المذهب ٣٦٥/٤.

# دەروازەی چوارەم
# مافی میراتگران لە میراتیدا

مافی میراتگران دوای مافی راسپاردن بۆ کراو دێتو لەریزبەندی کۆتایدان، جا چونکە میراتگران لە رێی خزمایەتی یان هاوسەرگیریەوە شایستەی میراتن، لای زۆرینەی زانایان میراتگر سێ جۆرن:

## جۆری یەکەم - خاوەن پشکە دیاریکراوەکان (أصحاب الفروض):

(ئەوانەن کەپشکێکی دیاریکراویان هەیە لە میراتیەکەدا)

ئەمانەش دوازدە پێرن:

١- مێرد.

٢- ژن.

٣- باوك.

٤- دایك.

٥- کچ.

٦- کچی کوڕ (بەرەو خوارتر)

٧- خوشکی دایكو باوکی.

٨- خوشکی باوکی.

٩- خوشکی دایکی.

١٠- برای دایکی.

١١- باپیرەی پشت (باوکی باوكو بەرەو سەرتر).

١٢- داپیرە (دایکی باوكو بەرەوسەترو دایکی دایكو بەرەوسەرتر).

## جۆری دووەم - خزمانی پشت (العصبات)[1]:

(ئەو نێرینانەی کە پشکەکانیان بەدەق دیاری نەکراوە) ئەمانەش چوار پێڕن:

١- کوڕیەتی-البنوة- (کوڕی کوڕو بەرەو خوارتر).

٢- باوکیەتی-الابوة- (باوکو باوکی باوکو بەرەوسەرتر).

٣- برایەتی-الاخوة- (برای دایکو باوکیو، برای باوکیو، کوڕی برای دایکو باوکیو بەرەوخوارتریشو، کوڕی برای باوکیو بەرەو خوارتریش).

٤- مامیەتی -العمومة- (مامی دایکو باوکیو، مامی باوکیو، کوڕی مامی دایکو باوکیو بەرەو خوارتریشو، کوڕی مامی باوکیو بەروە خوارتریش).

## جۆری سێیەم - خزمانی سک (ذوو الأرحام):

بریتیە لەو خزمانەی کەلە خاوەن پشکە دیاریکراوەکانو خزمانی پشت نین، لای جەعفەریەکانیش ئەمانە دابەش دەبن بۆ سێ پلە:

پلەی یەکەم- باوکو دایکی راستەوخۆیو، مناڵەکانیو، مناڵی مناڵەکانیو بەرەو خوارتر ئیدی نێر بن یان مێ جیاوازی نیە.

پلەی دووەم- باپیرەکانو داپیرەکانو براوو برازاکانو بەرەو خوارتر ئیدی نێر بن یان مێ جیاوازیان نیە، خوشکەکانو مناڵەکانیان و بەرەوخوارتر ئیدی نێر بن یان مێ جیاوازیان نیە.

پلەی سێیەم- مام و پورەکان (خوشکی باوك)و، خاڵو پورەکان (خوشکی دایکی)و، مناڵەکانیانو مناڵی مناڵەکانیانو بەرەو خوارتر نێرو مێ جیاوازیان نیە.

---

[1] واتە: ئەوانەی خۆیان خزمی پشتن، دوو جۆری دیکەی خزمی پشت هەیە کە بریتین لە:

أ- بەهۆی کەسی ترەوە خزمی پشتن (کچ بەهۆی کوڕ، کچی کوڕ بەهۆی کوڕی کوڕ، خوشکی دایکو باوکی بەهۆی برای دایکو باوکی، خوشك لەسەری باوکەوە بەهۆی برا لەسەری باوکەوە).

ب- لەگەڵ کەسی تردا دەبێت بەپشت (خوشکی دایکو باوکی یان لەسەری باوکەوە ئەگەر لەگەڵ کچدا یان کچی کوڕدا بەیەکەوە هات).

ئەوەشیان وتووە کە هەر پلەیەك پلەی دوای خۆی بێ بەش دەکات، ئەگەر یەك لەوانەی لە پلەی یەکەمدان هەبوو، ئیدی نێر بێت یان مێ، بەهۆیەوە هیچ کەسی تر لە پلەی دووەمو سێ یەم میراتی پێ نادرێت، گەر لەپلەی دووەمیش میراتگرێك هەبوو ئەوا ئەوانەی پلەی سێ یەم میراتیان پێ نادرێت.

## پشکە بڕیار دراوەکان بۆ میراتگرەکان:

### یەکەم: نیوەی میراتیەکە (نصف الترکة):

ئەمەش بۆ پێنج پێڕ دەبێت:

١- مێرد کاتێ ژنە کۆچکردووەکەی منالّی لەمو لەهیچ کەسێکی تر نەبێت، کە ئەویش کوڕو کوڕی کوڕو، کوڕی کوڕی کوڕو بەرەوخوارتر.

٢- کچ کاتێك کە خزمی پشتی لەگەڵ نەبێت.

٣- کچی کوڕ کە تاقانە بێتو هیچ خزمی پشتی نەبێتو بەشبڕان(حجب)ی لەسەر نەبێت.

٤- خوشکی دایكو باوکی کەتاقانە بێتو خزمی پشتی نەبێتو بەشبڕان (حجب)ی لەسەر نەبێت.

٥- خوشك لەسەری باوکەوە کە تەنیا بێت و خزمی پشتی نەبێتو بەشبڕان (حجب)ی لەسەر نەبێت.

### دووەم - دوو لەسەر سێی میراتیەکە (ثلثا الترکة):

ئەمەشیان بۆ چوار پێڕ دەبێت:

١- دوو کچ یان زیاتر کە خزمی پشتیان لەگەڵدا نەبێت.

٢- بۆ دوو کچی کوڕ یان زیاتر کە خزمی پشتیان نەبێتو بەشبڕان (حجب)یان لەسەر نەبێت.

٣–دوو خوشکی دایکو باوکی یان زیاتر کە خزمی پشتیان نەبێتو بەشبڕان(حجب)یان لەسەر نەبێت.

٤– دوو خوشکی باوکی یان زیاتر کە خزمی پشتیان نەبێتو بەشبڕان (حجب)یان لەسەر نەبێت.

**سێیەم - یەک لەسەر سێی میراتیەکە (ثلث الترکة):**

ئەمەشیان سێ پێڕە:

١– دایکی مردووەکە بەهەندێ مەرجی تایبەت کە دواتر باسی دەکەین.

٢–برای دایکی مردووەکە گەر لەیەکێك زیاتر بوو، واتە (دووبرای دایکی یان زیاتر کە بەشبڕان (حجب)یان لەسەر نەبوو).

٣–خوشکی مردووەکە لەسەری دایکەوە ئەگەر لەیەکێك زیاتر بوو، واتە (دوو خوشکی یان زیاتری هەبوو لەدایکەوەو کە بەشبڕان (حجب)یان لەسەر نەبوو).

**چوارەم - چوار یەکی میراتیەکە (ربع الترکة):**

ئەمەش بۆ دوو پێڕە:

١– بۆ مێرد کاتێك ژنە کۆچکردووەکەی منالی هەبێت.

٢– بۆ ژن کە مێرە کۆچکردووەکەی منالی نەبێت.

**پێنجەم - شەش یەکی میراتیەکە (سدس الترکة):**

ئەمەش بۆ هەشت پێڕ دەبێت:

١–بۆ باوکی کۆچکردووەکە کاتێ کە کۆچکردووەکە لقی میراتگری هەیە.

٢–بۆ دایکی کۆچکردووەکە کاتێ کە کۆچکردووەکە لقی میراتگری هەیە، یاخود لەکاتی بوونی براو خوشکی کۆچکردوو.

٣–بۆ باپیرە (باوکی باوکی) لەکاتی بوونی لقی میراتگردا.

٤–بۆ داپیرە (دایکی دایکی) یاخود دایکی باوکی بەرەهایی (ئیدی لقی میراتگر هەبێت یان نا).

٥–بۆ برا لەسەری دایکەوە کاتیٚ یەك برا بێتو بەشبڕاو نەکرابێت.

٦– بۆ خوشك لەسەری دایکەوە کاتیٚ یەك خوشك بێتو بەشبڕاو نەکرابێت.

٧– بۆ خوشك لەسەری باوکەوە کاتیٚ لەگەڵ تەنها یەك خوشکی دایكو باوکیدا کۆ بووبێتەوە [1] و نەبووبێتە پشت.

٨– بۆ کچی کوڕ گەر لەگەڵ تەنها کچێکدا [2] بەیەکەوە بێتو نەبووبێتە پشت.

**شەشەم - هەشت یەك (الثمن):**

ئەمەش تەنها بۆ ژنێکە کە مێردە کۆچکردووەکەی لقی میراتگری هەیە، ئیدی یەکێك بێت یان زیاتر.

---

[1] ئەمە لای زۆرینەی زانایان. بەڵام لای جەعفەریەکان بەهۆی خوشکە دایكو باوکیەکەوە بیٚ بەش دەکرێت.

[2] ئەمە لای زۆرینەی زانایان. بەڵام لەیاسای عێراقی و فیقهی جەعفەریدا بەهۆی کچەکەوە بیٚ بەش دەکرێت.

# بەندی دووەم

## میراتگران و چۆنیەتی میراتگرییان

## ( الورثة وكيفية توريثهم )

ئەمەش سێ باس لەخۆ دەگرێت:

باسی یەکەم- خاوەن پشکە دیاریکراوەکان و چۆنیەتی میراتگرییان.

باسی دووەم- خزمانی پشت و چۆنیەتی میراتگرییان.

باسی سێ یەم- خزمانی سك و چۆنیەتی میراتگرییان.

# باسی یەکەم
# خاوەن پشکە دیاریکراوەکان و چۆنیەتی میرات گرتنیان [1]

پێشتر ئەوەمان روون کردەوە کەخاوەن پشکە دیاریکراوەکان دوازدە پێرن، بەلاَم لەرووی پلەی پەیوەندی خزمایەتیەکەیان لەگەلْ مردووەکە دەتوانین بیانکەین بەشەش، لەسەر ئەو بنەمایە بابەتی چۆنیەتی میرات بەرکەوتنیان دابەش دەکەین بۆ شەش دەروازە، دواتر دروازەیەکی سەربەخۆ زیاد دەکەین تایبەت بە روونکردنەوەی مەرج و حوکمەکانی راسپاردنی پێویست (الوصية الواجبة)ی بۆ منالّی منالّەکانی.

[1] پێشخستنی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ : (الحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فلأولى رجل ذكر).

# دەروازەی یەكەم

# بەركەوتەی ژن و مێرد لە میراتیدا

## ( استحقاق الزوجين من التركة )

ژنو مێرد لە میراتیدا بەركەوتەی هاوسەرێتیان دەكەوێت كاتێ یەكێكیان كۆچی دوایی بكات، بۆ هەر یەكەشیان دوو شێوە هەیە:

## بەركەوتەی مێرد (استحقاق الزوج):

مێرد لەبەركەوتنی میراتی ژنەكەیدا دوو شێوەی هەیە:

**شێوەی یەكەم–** نیوەی میراتی ژنە كۆچكردووەكەی بەر دەكەوێت، ئەگەر ژنەكەی هیچ منالێكی نەبوو میراتی لێ بگرێت، ئیدی لەم مێردەی بێت یان لە مێردی پێشتری، ئەگەر بەر لەم مێردە شووی تری كردبێت [1].

| **میراتگرەكان:** | مێرد | برای دایكو باوكی |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٢/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ١ |

**شێوەی دووەم:** چوار یەكی لێجێماوی ژنە كۆچكردووەكەی بەر دەكەوێت ئەگەر لقی میراتگری هەبوو، ئیدی منالی ئەم مێردەی بێت یان مێردی پێشتری.

| **میراتگرەكان:** | مێرد | كوڕ |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٣ |

---

[1] مەبەست لە لقی میراتگر لای زۆرینەی زانایان بریتیە لە: كوڕو، كچ، منالی كوڕەكەیو، منالی كوڕی كوڕیو بەرەو خوارتر كوڕ بن یان كچ. لای جەعفەریەكانیش سەرە ڕای ئەوانە منالی كچو منالی كچی كوڕیو كچی كوڕی كوڕی و بەرەو خوارتریش بەلقی میراتگر دادەنرێت. إيضاح الفوائد ٣/٢٣٦

بەڵگەش لەسەر ئەم دوو شێوەیە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە کە دەفەرموویێت: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ [(١)].

لەوانەیە لە مێرددا دوو هۆکار کۆ ببێتەوە: کوڕی مامی ژنەکەی بێتو، لە رووی خزمایەتیشەوە میراتگری لەم لە پێشتری نەبێت، لێرەدا ئەوەی ماوەتەوە بەر ئەم دەکەوێت لە رێی پشتو خزمایەتیەوە.

لای هەندێك لە زانایان مێردەکە ئەوەی ماوەتەوە بەگەڕانەوە بەری دەکەوێت ئەگەر هاتوو ژنەکەی میراتگری دیکەی نەبوو [(٢)].

## بەرکەوتەی ژن (استحقاق الزوجة):

ژنیش ئەگەر یەکێك بێت یان زیاتر تا چوار ژن ئەوا دوو شێوەی هەیە:

**شێوەی یەکەم:** ژن ئەگەر یەکێك بوو یان زیاتر ئەوا چوار یەکی میراتی مێردە کۆچکردووەکەی بەر دەکەوێت، ئەگەر هاتوو هیچ لقێکی میراتگری نەبوو لەم ژنەی کەمیرات دەبات یاخود لە ژنێکی دیکە.

| **میراتگرەکان:** | ژنەکەی | مامی دایكو باوکی |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ / ٤ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٣ |

**شێوەی دووەم:** ژن یەکێك بوو یان زیاتر هەشت یەکی میراتی مێردە کۆچکردووەکەی بەر دەکەوێت ئەگەر هاتوو لقی میراتگری هەبوو لەم بێت یان لە

---

(١) سورة النساء / ١٢.

(٢) زانایانی جەعفەری جیاوازیان کردووە لەنێوان ژن و مێرددا لەبابەتی گەڕانەوە، واتە لەوەی بەریان دەکەوێت لە میراتیەکەدا دوای ئەوەی هەموویان بەشی خۆیان بردو هیچ میراتگرێکی تر نەبوو ئەوا مێرد مافی بردنی ماوەکەی هەیە لەرێگەی گەڕانەوەوە بەڵام بۆ ژن وا نیە. إیضاح الفوائد (٤/٢٣٧): (وا بەناوبانگە لە نێو هاوەڵاندا کە هەموو سامانەکەی بۆ مێردەکەی دەبێت – لەحاڵەتی نەبوونی میراتگرێکی دیکەدا– نیوەی بە ناونان و نیوەکەی تری بەگەڕانەوە).

ژنێکی تر.

بەڵگەش لەسەر ئەم دوو شێوەیە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: ﴿وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾ (١).

ژن بەرێگەی گەڕانەوە لەکاتی نەبوونی میراتگری دیکەشدا مافی نیە لەوەی کە ماوەتەوە بەڵکو ئەوەی ماوەتەوە دەدرێتەوە بە گەنجینەی گشتی.

لە جێنشینە راشیدینەکان عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) دەڵێت: ژنو مێرد هەردووکیان لە رێگەی گەڕانەوەوە ئەوەی ماوەتەوە بەریان دەکەوێت وەك مراتگرەکانی دیکە، ئەمەش وەك کارکردن بە بنەمای (الغرم بالغنم) واتە: هەرشتێك کە سزاکەی لەسەر تۆ بوو دەستکەوتەکەشی هەر بۆ خۆتە، لەبەر ئەوەی بە زیادکردن (العول) کەم کردنەکە دەکەوێتە سەر پشکەکانی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان لە لێجێماوەکەدا بەبێ جیاوازی لەنێوان ژنو مێردو ئەوانەی دیکە لەخاوەن پشکە دیاریکراوەکان هەربۆیە پێویستە بەشی هەردووکیان زیاتر بکرێت لەوەی کە ماوەتەوە لە لێجێماوەکە لەکاتی نەبوونی میراتگری دیکەدا (٢).

پێشنیار دەکەم یاسا دانەری عێراقیش ئەم بۆچوونە کار پێ بکات، لەبەر ئەوەی گەنجینەی گشتی سەرچاوەی داهاتی دیکەی هەیە کە بەشی پێویستی خەرجیە گشتی یەکان دەکات، وەك وەرگرتنێکی بۆچوونەکەی گەورەمان عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ)، سەرەڕای ئەوەش هەردوو لایان بەشدار بوون لەپێکهێنانی لێجێماوەکەداو لەویژدانو دادپەروەریەوە دوورە کەسێك لەبەرهەمی ماندووبوونی خۆی بێ بەش بکرێت.

لە فیقهی جەعفەریش وا بەناوبانگە کە: ئەو ژنەی کوڕی نەبێت بە رەهایی لەزەویدا

---

(١) سورة النساء /١٢.

(٢) جابر کوڕی زەید لەزانایانی شوێنکەوتووانو وعثمان البتي ئەم بۆچوونەیان پەسەند کردووە.

بەشی پێنادرێت نە بەماڵینەو نە لەنرخەکەی، لە خانووبەرە (عقار)ی سەر بە زەویەکە لە نرخەکەی میراتی بەر دەکەوێت [1].

بەلام مێرد لەهەموو ئەوەی ژن بەجێی دەهێڵێت میراتی بەر دەکەوێت ئیدی لەپەردەی کردبێت یان نا جیاوازی نیە [2].

ئاشکرایە ژنو مێرد لەژیانی مادیو مەعنەویدا هاوبەشن، سەرمایەی مەعنەوی هاوبەشیی هاوسەرێتیان رێزو خۆشەویستیانە بەرانبەر یەك، قازانجەکەشی لەدایکبوونی نەوەیەکی نوێیە کە شیاوبن بۆ ئەندامێتی کۆمەڵگا، سەرمایەی مادی هاوبەشییان بریتیە لە هەوڵو ماندووبوونی هێزیو جەستەیی کە لەزاراوەناسی یاسایو فقهیدا پێی دەوترێت هاوبەشی جەستەیی (شركة الأبدان)، قازانجەکەشی ئەو سەرمایەیە کەخێزان هەیەتی، مێرد لەدەرەوەی ماڵ کار دەکاتو ژنیش بە زۆری لەنێو ماڵدا کاردەکاتو کاروباری ناوخۆی بەرێوە دەبات، لەوانەیە لەدەرەوەی ماڵیش کار بکات، وەك ئەوەی فەرمانبەر بێت یان کاری کشتوکاڵو مەرومالات بەخێوکردن ئەنجام بدات، لەبەر رۆشنایی ئەم راستیانەدا ئەو لێجێماوەی کە لەمێردە کۆچکردووەکە جێماوە بەتەواوەتی ماڵی خۆی نیە، بەڵکو ژنەکەشی لەپێکهێنانی

---

[1] بیانووشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە لە ئیمامەکانو عەقڵەوە پێیان گەیشتوە، ئەویش بریتیە لە ترسان لەوەی کەسێکی نامۆ بخرێتە نێو میراتگرەکانەوە و ببێتە هۆی دروستکردنی کێشە، لە کتێبی (اللمعة الدمشقية وشرحها الروضة البهية (٣٢٦/٢) هاتووە: ئەو ژنەی کە منالّی نیە بەشێوەیەکی رەها لە زەوی بەشی پێنادرێت ( واتە کرا بێتە باڵەخانە یان نا) بە ماڵینەیی و لەبەهاکەی و لەکەرەستەکانی بیناسازیش وەك دارو تەختەو دەرگاکانو بەردو ئەو شتانەی دیکە کەلەبیناکردندا بەکار دێن بە ماڵینەو بەهاوە، بینایەکە و خانووەکە لە زەوی کۆچکردووەکەدا دەبێت بەجیا لەو زەویەی تر کە هیچی تیا نیەو دەمێنێتەوە تا ئەو کاتەی لەناو دەچێت بەبێ قەرەبوو و لە نرخەکەی چوار یەك یان هەشت یەکی پێ دەدرێت) هەروەها لە ( القواعد وشرحها إيضاح الفوائد (٢٣١/٤) هاتووە: ئەگەر منالّی نەبوو وا بەناوبانگە کە لە زەوی هیچ بەشی پێنادرێت و لەبەهای ئامێرو باڵەخانەکان و دارخورماو رووەك مافی خۆی پێ دەدرێت، هەروەها وتراویشە لە خانوو و شوێنی نیشتەجێبوونیش پێی نادرێت، هەروەها وتراوە لە بەهای زەویەکە میراتی دەدرێتێ نەك لە ماڵینەکە.

[2] سەرچاوەی پێشوو.

بەشێکیدا بەشداری کردووە، لەسەر ئەم بنەمایە پێویستە بەشی ژنەکە لەوەی کەبەشدار بووە لە پێکهێنانیدا لێی دەربکرێت پێش پێدانی چوار یەك یان هەشت یەکەکە پێی، ئەم پشکەش لەلایەن کەسانی خاوەن ئەزموون و شارەزاوە دیاری دەکرێت، هەر ئەمەش بوو لەسەر پێشنیاری من خرایە ئەحکام و مادەکانی یاسای باری کەسیی ژمارە (١٥) لە ٢٠٠٨/١١/١٣ لە هەرێمی کوردستانی عێراق، لە برگەی یەکەمی مادە ٢٥، لەو بەروارەوە بەرکارە.

**هێزی پەیوەندی هاوسەرێتی (قوة الصلة الزوجية):**

١- هیچ یەك لە ژن و مێرد بەکەسی تر لەمیراتگری دیکە بەشبڕی تەواو (حجب حرمان)ی لێ ناکرێت[1].

٢- هیچ یەکێکیان بەهۆی خەسڵەتی هاوسەرگیریەوە نابنە هۆی رێگری لێکردنی میرات گرێکی دیکە لە لێجێماوەکە[2].

نمونە: **میراتگرەکان:**

| | ژنەکەی | کوڕی |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ / ٨ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٧ |

**میراتگرەکان:**

| | چوار ژن | کوڕی کوڕ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ / ٨ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٧ |

**میراتگرەکان:**

| | مێرد | گەنجینەی گشتی[3] |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٣ |

---

[1] بەڵاو بەهۆی لقە میراتگرەکەوە رێگیری ناتەواو دەکرێن.

[2] بەڵام مێرد لەوانەیە میراتگرێکی دوور رێگیری بکات لەرێی خزمایەتیەوە.

[3] وادەی دەبینین کە دابەروەری خوایی وا دەخوازێت کە ماوەکە بدرێتەوە بە ژنەکە، بەوەش هەموو میراتەکەی پێ بدرێت بەرێی بەشی دیاریکراوو گەڕانەوە، هەروەك گەورەمان خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەففان (ﷺ) فەتوای داوە.

## دەروازەی دووەم

## بەرکەوتەی دایک و باوک لە میراتیدا

## (استحقاق الأبوين من التركة)

دایكو باوكی مردووەكە هەریەكیان حاڵەتی تایبەتیان هەیە، لەهەر حاڵەتێكیاندا بەجۆرێك لە میراتیەكەیان بەر دەكەوێت كەلە حاڵەتەكانی تردا بەریان ناكەوێت:

### حاڵەتەكانی بەرکەوتەی دایک و باوکی مردوو لە میراتیەکەیدا:

ئەو باوكەی یەكێك لەمناڵەكانی نێر بێت یان مێ بمرێت ئەوا سێ شێوەی هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** تەنها شەش یەكی لێجێماوەكەی پێ دەدرێت ئەگەر كۆچكردووەكە لقێكی نێرینە (كوڕ یاخود كوڕی كوڕ و بەروخوارتر)ی هەبوو.

| **میراتگرەكان:** | باوك | كوڕ (یان كوڕی كوڕ) |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٥. |

**حاڵەتی دووەم:** هەموو لێجێماوەكە یاخود ماوەكەی پێ دەدرێت ئەگەر هاتوو كۆچكردووەكە بە رەهایی لقێكی میراتگر (نە نێرو نە مێ)ی نەبوو، یان میراتگرێكی هەیە وەك برا و خوشك بەڵام بەهۆی باوكەوە بەشبڕاو –حجب– كراوە.

| **میراتگرەكان:** | باوك | برا ك |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ھ (هەموو لێجێماوەكە) | ب |

| **میراتگرەكان:** | ژن | باوك |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٣ |

**حاڵەتی سێیەم:** میراتەکەی لەگەڵ لقە مێینەکانی میرات لێگیراوەکەدا (کچ یاخود کچی کوڕ و بەرەو خوارتر):

**أ- لای زۆرینەی زانایان:**

شەش یەکی بۆ هەیە وەك پشکی دیاریکراو لەگەڵ ماوەکە پاش ئەوەی لقە میراتگرە مێینەکە وەك خزمی پشت بەشی خۆی وەردەگرێت.

| **میراتگرەکان:** | (٢) کچ | باوك |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢ / ٣ | ٦/١ |
| پشکەکان: | ٤ | ١ وەك پشکی دیاریکراو |
| | | ١ وەك پشت |

| **میراتگرەکان:** | کچی کوڕ | باوك |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ /٢ | ٦/١ |
| پشکەکان: | ٣ | ١ وەك پشکی دیاریکراو |
| | | ٢ وەك پشت |

**ب- لە فیقهی جەعفەریدا:**

لە هەردوو حاڵەتی یەکەمو دووەمدا جیاوازی نیە لەنێوان فیقهی سونیو جەعفەریدا، بەڵکو جیاوازیەکە لە حاڵەتی سێ یەمدایە.

لە فیقهی جەعفەریدا هاتووە: هیچ جیاوازیەك نیە لەنێوان کۆبوونەوەی باوك لەگەڵ کوڕی یاخود کوڕی کوڕی یان کچی کوڕی، باوکەکە شەش یەك دەباتو ئەوەی مایەوە دەدرێتە کوڕەکەی یان کوڕی کوڕەکەی یان کچی کوڕەکەی لەبەر ئەوەی ئەو کچە جێگای باوکی دەگرێتەوەو لێرەدا باوکەکە وەك ئەوە وایە لەگەڵ کوڕیدا بێت.

هەر بەپێی ئەم فیقهە گەر لەگەڵ کچ یان کچی کچ کۆبووەوە ئەوا شەش یەکی بۆ هەیەو کچەکەی یان کچی کچەکەی ئەگەر تەنها یەکێك بوو ئەوا نیوەی بەر

دەکەوێت، خۆ گەر لەیەکێك زیاتر بوو ئەوا دوو لەسەر سێیان دەدرێتێ و ئەوەشی مایەوە دەگەڕێتەوە بۆ کچەکان، سەبارەت بە پشکەکانیان:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | (٢) کچ | باوك | بابەتەکە لە(٦)ە. |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٦/١ | یەك بەش دەمێنێتەوە بەسەریاندا |
| پشکەکان: | ٤ | ١ | دابەش دەکرێت بەهەمان رێژە |

بابەتەکە دەگەڕێتەوە بۆ(٥)

باوك ١/٥ بۆ هەر کچێك ٢/٥

ج -**لەیاسادا:**

باوك ئەگەر یەك کچ یان زیاتری لەگەڵدا هات ئەوا شەش یەکی بەر دەکەوێت و ئەوەی مایەوە بۆ کچەکە یاخود کچەکان دەبێت وەك پشکی دیاریکراو، بەپێی برگەی دووەمی مادە (٩١)ی هەموار کراو، بەڵام باوك لەگەڵ کچی کوڕدا شەش یەکی بەردەکەوێت و چارەنووسی ئەوەی دەمێنێتەوە جیاوازە، لە فیقهی سونیدا دەدرێتەوە باوك وەك پشت، لەفیقهی جەعفەریشدا دەدرێتە کچی کوڕ لەبەر ئەوەی لەجێگەی باوکیدایە [1].

---

[1] لە:(إیضاح الفوائد في شرح القواعد للمحلی ٢١١/٤) هاتووە: (باوك کەبەتەنها هاتبێت سامانەکەی دەدرێتێ. دایك بەتەنها هاتبێت سێ یەکی دەدرێتێو ئەوەی مایەوە دلبەش دەکرێتەوە بەسەریاندا، خۆگەر بەیەکەوە هاتن ئەوا دایك سێ یەك دەباتو ئەوەی مایەوە دەدرێتە باوك، ئەگەر لەگەڵ خوشکو برایاندا هات کە بەشبڕاوی –حجب– کردبوون ئەوا شەش یەکی بۆ هەیە و ئەوەی مایەوە بۆ باوکەکەیە، خوشکو براکان هیچیان پێ نادرێت با دایکەکەشیان بەشبڕاو کردبێت لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك.
ئەگەر دایکو باوك هەردووکیان یان یەکێکیان لەگەڵ منداڵێکی نێر (کوڕ)یان زیاتر هات ئەوا دوو شەش یەکیان بۆ هەیە، یان شەش یەك ئەگەر تەنها یەکێکیشیان بوو، ئەوەشی مایەوە بۆ کوڕەکە دەبێت یاخود بۆ کوڕەکان ئەگەر لەیەکێك زیاتر بوو بەیەکسانی پێیان دەدرێت، خۆ گەر منداڵی نێرو مێ لەگەڵ دایکو باوك یان یەکێکیان هاتبوو ئەگەر یەکێکیان بوو ئەوا شەش یەکی بۆ هەیە هەردووکیشیان بوون بەیەکەوە ئەوا دوو شەش یەکیان بۆ هەیەو ئەوەی مایەوە بۆ منداڵەکانیەتی کوڕ دوو هێندەی کچی دەدرێتێ.

←

**هێزی خزمایەتی باوک :**

١. باوکی کۆچکردووەکە بەهیچ میراتگرێکی دیکە بەشبڕاوی تەواوی لێ ناکرێت.

٢. لەگەڵیدا تەنها منداڵی کۆچکردووەکەو منداڵی کوڕەکەی لەفیقهی سوننیداو منداڵی کچەکەشی بەپێی فیقهی جەعفەری، ژنو مێردەکە یەکێکیانو دایکی کۆچکردووەکەو دایکی دایکی میراتیان بەردەکەوێت، بە پێی کۆڕای زانایان ئەوانەی دیکە لە میراتگران بەشبڕاو-حجب- دەکرێن لەمیراتی بەرکەوتن، هەروەها لەگەڵیدا داپیرە (دایکی دایک) بەپێی فیقهی جەعفەری میرات نابات لەبەر ئەوەی لەپلەی دووەمدایەو ئەم لەپلەی یەکەمە.

---

لە نمونەکانی جێبەجێکردنی:

**میراتگرەکان:** باوک کچ (یان کچی کچ) بابەتەکە (٦)

پشکە دیاریکراوەکان: ٦/١ ٢/١ ئەوەی مایەوە (٢) هەریەکەو

پشکەکان : ١ ٣ چوار یەکی بۆ دەگەڕێتەوە

بابەتەکە دەگوڕدرێت بۆ (٤) باوکەکە ٤/١ کچەکە یان کچی کچەکەش ٤/٣

**میراتگرەکان:**

باوک. کچی کوڕ (یاخود کوڕ یان کوڕی کوڕ). کچی کوڕ شوێنی باوکی دەگرێتەوە

٦/١ م

١ ٥

**میراتگرەکان:** باوک. دایک. کچ (٣) خوشکو برا لە دایکو باوکەوە یان لەباوکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٦/١ ٦/١ ٢/١ ئەوەی مایەوە (١) دەگەڕێتەوە بۆ باوکو کچەکە هەریەکەیان چوار یەك و بە دایك نادرێت

پشکەکان : ١ ١ ٣ شەش یەك زیاتری بەر ناکەوێت چونکە لەگەڵ خوشکو برادایە

**میراتگرەکان:** باوک. دایک. کچ بابەتەکە (٦) دەگۆڕێت بۆ (٥)

پشکە دیاریکراوەکان: ٦/١ ٦/١ ٢/١ یەك بەش دەمێنێتەوە هەریەك

پشکەکان : ١ ١/٣ ٣/١ پێنج یەکی بۆ دەگەڕێتەوە

٥/١ بۆ باوک ، ٥/١ بۆ دایک، ٥/٣ بۆ کچەکە

| | | |
|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | باوك | برای دایكو باوكی |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ھ | ب |

| | | |
|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | مێرد | باوك |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٢/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ١ |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | ژن | باوك | مام |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م | ب |
| پشكەكان: | ١ | ٣ | هیچ |

**بەركەوتەی دایكی كۆچكردووەكە لە میراتیەكەی،**

میراتی دایكی كۆچكردووەكە لە لێجێماوەكەدا سێ حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** سێ یەكی میراتەكەی پێ دەدرێت بەم مەرجانە:

١- كۆچكردووەكە لقی میراتگری نەبێت لەنێرو مێ [1].

٢- كۆچكردووەكە ژمارەیەك براو خوشكی نەبێت.

٣- لەكاتی هاتنەدی ئەو دوو مەرجەی پێشتردا لەگەڵ باوك و یەكێك لەژنو مێردەكە كۆنەبنەوە.

| | | |
|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | دایك | باوك |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٣/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٢ |

**حاڵەتی دووەم:** شەش یەكی لێجێماوەكەی دەكەوێت لەیەكێك لەم دوو بارەدا:

---

[1] پێشتر ئەوەمان باس كرد كەمەبەست لە لقی میراتگر لای زۆرینەی زانایان كوڕو منداڵەكانیەتی كوڕ بن یان كچ، لای جەعفەریەكانیش لەگەڵ ئەوانەدا كچو منداڵی كچو منداڵەكانی كچی كوڕیش دەگرێتەوە.

أ- ئەگەر كۆچكردووەكە لقی میراتگری هەبوو (نێر بن یان مێ).

ب- ئەگەر چەند براو خوشكێكی هەبوو [1].

| میراتگرەكان: | دایك | كوڕ (یان كوڕی كوڕ) |
| --- | --- | --- |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٥ |

| میراتگرەكان: | دایك | باوك | (٣) برای دایكو باوكی |
| --- | --- | --- | --- |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م | ب |
| پشكەكان: | ١ | ٥ | هیچ |

**حاڵەتی سێیەم:** سێ یەكی ئەوەی بۆ هەیە كەدەمێنێتەوە پاش بەشی یەكێك لەژنو مێردەكە، بەم مەرجانە:

١- نابێت كۆچكردوو هیچ لقێكی میراتگر نێر یان مێی هەبێت.

٢- بە ڕەهایی ژمارەیەك برا یان خوشكی نەبێت (دایكو باوكی بن یاخود باوكی یان دایكی) ئەمە لای پەیڕوانی سونی وایە.

٣- لەگەڵ باوكەكەدا ژنو مێردەكە یەكێكیان هەبێت.

ئەگەر ئەم سێ مەرجە هاتە دی ئەوا پاش بەشدانی یەكێك لە ژنو مێردەكە دایك سێ یەكی ئەوەی ماوەتەوە بەر دەكەوێت، ئەمەش وەك لەبەرچاوگرتنی بنەمای (للذكر مثل حظ الأنثيين) [2]. واتە: نێر دوو هێندەی

[1] لای زۆرینەی زانایان مەبەست لە ژمارە (عدد) زیاتر لەیەك لە برا یان خوشك یان هەردووكیان. بەڵام لای جەعفەریەكان ژمارە بریتیە لە دوو برا -نێرینە- زیاتر یان چوار خوشكو زیاتر، یان برایەكو دوو خوشك. ایضاح الفوائد ٢١١/٤.. هەروەها جەعفەریەكان بەمەرجیان گرتووە كە خوشكو براكان دایكی نەبن. الروضة البهية ٣٠٢/٢.

[2] ئەگەر دایك سێ یەكی ئەوەی پێ نەدرایە كەماوەتەوە ئەوا بەشی دایك زیاتر دەبوو لەبەشی باوك، ئەمەش ناكۆكە لەگەڵ ئەو بنەما شەرعیە گشتی یە كەدەڵێت هەر مێینەیەك لەگەڵ نێرینەیەكدا بەیەكەوە هاتنو لەیەك ئاستی پلەی خزمایەتیدا بوون ئەوا نێر دوو هێندەی مێی پێ دەدرێت.

مێینەی پێ دەدرێت.

زانایانی جەعفەری[١] و زاهریەکان[٢] وتوویانە سێ یەکی تەواوی بۆ هەیە بەهۆی ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزەوە: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ﴾[٣]، واتە: خۆ ئەگەر کوڕی نەبوو، دایكو باوکی بوونە میراتگری، ئەوا دایکی سێ یەکی بەردەکەوێت.

بەڵام زۆرینەی زانایان رووکاری ئەم ئایەتەیان وەرنەگرتووە وەك لەبەرچاوگرتنی بنەمای (للذكر مثل حظ الأنثيين).

**میراتگرەکان:** میرد دایك باوك

بنچینەی بابەتەکە(٦)[٤]

پشکەدیاریکراوەکان: ٢/١ دەبێت بە٣/١ ئەوەی مایەوە م

(بچوکترین چەندجارەی هاوبەش)

پشکەکان: ٣ ١ ٢

**میراتگرەکان:** ژن دایك باوك بنچینەی بابەتەکە (١٢)[٥]

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ دەبێت بە٣/١ ئەوەی مایەوە م (چەندجارە)

پشکەکان: ٣ ٣ ٦

---

[١] الكافي للكليني، ايضاح الفوائد ٢١٢/٣.

[٢] المحلى ٩ / ٢٦٢.

[٣] سورة النساء /١١.

[٤] ئەم ژمارەیە بچوکترین چەندجارەی هاوبەشی هەردوو ماوەکەیە (٣/١، ٢/١) لەبەر ئەوە بە بناغەی دابەشکردنی میراتەکە دادەنرێت.

[٥] ئەم ژمارەیە بچوکترین چەندجارەی هاوبەشی هەردوو ماوەکەیە (٤/١، ٣/١ ) لەبەر ئەوە بنچینەی بابەتەکەیە.

هەردوو مەزهەبی زاهری‌و جەعفەری هاودەنگن لەگەڵ ئەو بۆچوونەی ئیبن عەباس (ﷺ). دەگێڕنەوە کە ئیبن عەباس لە زەیدی کوڕی سابتی پرسیوە: ئایا لەکتێبی خوای گەورەدا سێ یەکی مایەوەت بینیوە؟ وتی: نەخێر بەڵام وەك بۆچوونی خۆم وتم باشێتی دایك نادەم بەسەر باوکدا، ئیبن عەباس پێی وت: کتێبی خوای گەورە لەپێشترە کاری پێ بکرێت لەبۆچوونی تۆ. تفسير الرازي ٢٢١/٩.

بەڵگەش لەسەر ئەو حوکمانەی میراتی دایكو باوکی کۆچکردووەکە ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: ﴿وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ، فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ، فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾(النساء : ١١)[1].

زانایانی ئیمامیو زاهریەکان وای دەبینن کەدایك سێ یەکی تەواوی پێ دەدرێت لەو حاڵەتەدا، ئەمەش وەك کارکردن بە رواڵەتی ئەو ئایەتەو پەسەندکردنی بۆچوونەکەی ئیبن عەباس.

**هێزی خزمایەتی دایک:**

١–دایك بە کۆڕای زانایانی شەریعەت هیچ میراتگرێك نابێتە هۆی بێ بەشبرانی بەشێوەی بەشبراوی تەواو–حجب حرمان–.

٢– لای زۆرینەی زانایان:

أ– هەموو ئەو خزمانە بەشبراو–حجب– دەکات کەخزمایەتیەکەیان بەهۆی سکەوەیە.

ب– هیچ خزمێکی پشتی پێ بەشبراو ناکرێت.

ت– داپیرەی دایکی (دایکی دایکی)و داپیرەی باوکی (دایکی باوکی) بەشبراو دەکات.

٣– لای زانایانی جەعفەری:

هەموو میراتگرانی پلەی دووەمو سێ یەم بەشبراو دەکات لەبەر ئەوەی لە پلەی یەکەمدایە[2].

---

[1] کتێبی(الخلاف في الفقه)ی (امام ابي جعفر محمد بن الحسن بن علي الطوسي ٢/٤٥).

[2] کتێبی (الخلاف في الفقه) ی (امام أبي جعفر سعد بن الحسن بن علي الطوسي ٢/٤٥).

# دەروازەی سێیەم

## بەرکەوتەی کچ و، کچی کوڕ لە میراتیدا

## (استحقاق البنت، وبنت الابن من التركة)

هەر یەك لە کچوکچی کوڕی کۆچکردووەکە لەوەرگرتنی میراتیدا چەند حاڵەتێکیان هەیە کە لەهەندێکیاندا وەك یەکن، لەهەندێکیشیاندا جیاوازن.

**بەرکەوتەی کچ:**

بۆ کچی کۆچکردووەکە ئیدی مردووەکە باوکی بێت یان دایکی چوار حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** نیوەی میراتیەکەی پێدەدرێت بەم دوو مەرجە:

١. دەبێت خۆی تاقە کچ بێت.

٢. کوڕی کۆچکردووەکەی لەگەڵ نەهاتبێت.

| **میراتگرەکان:** | کچ | مێرد | دایك | باوکی | بنچینەی بابەتەکە (١٢)یە |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٤/١ | ٦/١ | ٦/١ | بەرز کرایەوە بۆ(١٣) |
| پشکەکان: | ٦ | ٣ | ٢ | ٢ | |

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر زیاتر لەیەکێك بوونو کوڕی کۆچکردووەکەیان لەگەڵ نەهاتبوو ئەوا دوو لەسەر سێی لێجێماوەکەیان پێ دەدرێت [1].

---

١) سەعدی کوڕی رەبیع شەهید بوو، لەپاش خۆی دوو کچو ژنەکەیو برایەك بەجێما، براکەی هەموو میراتیەکەی برد، ژنەکەی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو دووانە کچی سەعدن و سەعدیش کوژراوە، مامەکەیان هەموو سامانەکەی بردوون. پێغەمبەر پێی فەرموو: بگەڕێرەوە لەوانەیە خوای گەورەر لەمەدا داوەری بکات، پاش ماوەیەك ژنەکە گەڕایەوەو گریا، ئەمجا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾ النساء/١١ پێغەمبەری خوا (ﷺ) مامیانی بانگ ←

| میراتگرەکان: | (٢) کچ | دایك | باوك | بنچینەی بابەتەکە (٦)ە |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٦/١ | ٦/١ | (چەندجارەی سادە) |
| پشکەکان: | ٤ | ١ | ١ | |

**حاڵەتی سێیەم:** گەر یەك کچ بوو یان زیاتر بوو لەگەڵ کوڕی کۆچکردووەکەدا هات ئەوا بەپێی بنەمای (للذكر مثل حظ الأنثيين) میراتی بەر دەکەوێت.

| میراتگرەکان: | ژن | کچ | کوڕ | |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م | | کوڕ دوو هێندەی کچ وەردەگرێت |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ | |

| میراتگرەکان: | ژن | (٣)کوڕ | کچ | |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | ١ | ٧ م | (بۆ هەر کوڕێك دووبەش |
| پشکەکان: | ١ | ٦ | ١ | و کچیش یەك بەش) |

**حاڵەتی چوارەم:** کچێك یان چەند کچێك ئەو کاتەی کۆچکردوو کوڕی نەبێت هەموو لێجێماوەکەیان بەر دەکەوێت پاش ئەوەی دایكو باوكو ژنی کۆچکردووەکە بەشی دیاریکراوی خۆیان برد، لەکاتی نەبوونی ئەمانیشدا کچەکان هەموو لێجێماوەکە دەبەن.

---

کردو پێی فەرموو: دوو لەسەر سێ بدە بە دوو کچەکەی سەعدو هەشت یەکیش بە دایکیانو ئەوەی مایەوە بۆ تۆیە ئەمەش یەکەم میرات بوو لە ئیسلامدا، بڕوانە: فتح الباري شرح صحيح البخاري لابن حجر العسقلاني ١٥/٤. التفسير الكبير للرازي ٩/ ٢٠٣ – ٢٠٤. لەم ئایەتەدا خوای گەورە دەفەرمووێت لەدووان زیاتر بوو لەئایەتێکی دیکەشدا دەفەرموێت: ﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ النساء /١٧٦. لەو دوو ئایەتەدا هونەرکارییەکی رەوانبێژی هەیە لەوەی دواتردا ئەوەی سڕیوەتەوە کەلە پێشترەکەدا هاتووە: (فَوْقَ اثْنَتَيْنِ) لەوەی پێشتریشدا ئەوەی سڕیوەتەوە کەلەوەی دواتردا هاتووە: (فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ).

ئەمەش لە بڕگەی دووی [1] مادە (٩١)ی یاسای باری کەسیی عێراقیو، بەپێی مادەی هەشتەم لەیاسای ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٧٨ هەمواری دووەمی یاسای باری کەسیی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩دا هاتووە.

| | | |
|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | باوك | کچ |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ / ٦ | ١ / ٢ |
| پشکەکان: | ١ | ٣ وەك پشکی دیاریکراو |
| | | + م وەك گەڕانەوە =٥ |

ئەو دوو پشکەی لەم بابەتە دەمێنێتەوە بۆ باوکەکەیە لای زۆرینەی زانایانو بۆ هەردووکیانە لای جەعفەریەکان، لەیاساشدا بۆ کچەکەیە، بەمەش یاسادانەری عێراقی لەوە لای داوە کە کۆدەنگی زانایانی شەریعەتی ئیسلامی لەسەرە، کە هیچ یاسایەکی دیکە پێشتر بڕیاری وەك ئەمەی نەداوە.

بەڵگەش لەسەر ئەم سێ شێوەیەی یەکەم ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ﴾[2].

---

١- بەپێی ئەم بڕگەیە هەر کەسێك لە ئەهلی سوننە مردو باپیرەو داپیرەیەکی هەبوو ئەوا لێجێماوەکە هەمووی بۆ کچەکە دەبێت بەپێی بەشی دیاریکراووو گەڕانەوە. خۆ ئەگەر مردو کوڕێكو باپیرەو داپیرەی لەپاش بەجێما ئەوا هەریەکە لەباپیرەو داپیرەی شەش یەکیان بەردەکەوێتو ئەوەی مایەوە بۆ کوڕەکەیە، بەمەش یاسا دانەری عێراقی پێگەی کچی لەکوڕ بەهێزتر کردووە، کە هیچ یاسایەکی دیکەی جیهان نەیوتووە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی وردبیەوەیە لە داڕشتنەوەی بڕگەی دووەم، چونکە یاسا دانەر ویستویەتی هەموارکردنەکە بەمجۆرە بێت: (تعتبر البنت بحكم الابن في الحجب) واتە: کچ وەك کوڕ وایە لە بەشبرکردن—حجب—دا. هەروەك لەبڕگەی چوارەمی مادەی (٨٩)دا هاتووە: (تعتبر الأخت الشقيقة بحكم الاخ الشقيق في الحجب) واتە: کچێك لەدایكو باوکەکەوە بێت وەك برا لەدایكو باوکەوە وایە لە بەشبری —حجب—دا، وەك ئەوەی لەفیقهی جەعفەریدا هاتووە.دلوا لەیاسا دانەری عێراقی دەکەین چاو بەم بڕگەیەدا بخشێنێتەوەو هەمواری بکاتەوە بەجۆرێك کەلەگەڵ دادپەروەریو رۆحی شەریعەتی ئیسلامیدا بگونجێت.

[2] النساء/١١

←

**هێزی خزمایەتی کچ:**

١. بەهۆی هیچ میراتگرێکەوە بەشبڕاوی تەواو-حجب حرمان- ناکرێت.

٢. لای زۆرینەی زانایان: هەموو ئەو خزمانە بەشبراو-حجب- دەکات کە خزمی سکی‌و خوشك‌و برا لەدایکەوە، هەروەها گەر لەیەکێك زیاتر بوو ئەوا کچی کوڕیش بەشبڕاو -حجب- دەکات.

٣. لای جەعفەریەکان: دەبێتە بەشبڕی-حجب- منالی منالەکان لە پلەی یەکەمداو هەموو میراتگرەکانی پلەی دووەم‌و سێ یەم.

٤. لەیاسادا: دەبێتە بەشبڕی -حجب- هەموو میراتگرەکان جگە لەم پێنجە: دایك‌و باوك‌و ژن‌و مێردو کوڕی کەسە کۆچکردووەکە.

**بەرکەوتەی کچی کوڕ:**

کچی کوڕی کەسە کۆچکردووەکە پێنج حاڵەتی میرات وەرگرتنی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** نیوەی میراتیەکەی بۆ هەیە، بەم مەرجانە:

١. کچەکە تاقانە بێت.

٢. کۆچکردووەکە کوڕو کچی نەبێت.

٣. لەگەڵیدا کوڕی کوڕ نەهاتبێت.

| **میراتگرەکان:** | مێرد | کچی کوڕ | باوك | بنچینەی بابەتەکە (١٢)یە |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٢/١ | ٦/١ | |
| پشکەکان: | ٣ | ٦ | ٢ وەك پشکی دیاریکراو<br>+ ١ وەك خزمی پشت | |

٢ ئیدی گەر برای کچی کوڕەکە بێت یان کوڕی مامی کچەکە بێت.

**حاڵەتی دووەم:** چەند کچێکی یەك کوڕی دوو لەسەر سێی میراتیەکەیان بەر دەکەوێت، بەم مەرجانە:

١. کۆچکردووەکە نابێت کوڕ یان کچی هەبێت.

٢. نابێت کۆچکردووەکە کوڕی کوڕی هەبێت.

| **میراتگرەکان:** | (٢) کچی کوڕ | دایك | باوك |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٦/١ | ٦/١ |
| پشکەکان: | ٤ | ١ | ١ |

**حاڵەتی سێیەم:** کچی کوڕ (یەکێك بێت یان زیاتر) بەپێی بنەمای (للذكر مثل حظ الأنثيين) میراتی دەدرێتێ لەکاتی هاتنی لەگەڵ کوڕی کوڕدا [1].

| **میراتگرەکان:** | مێرد | کچی کوڕ | کوڕی کوڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | | م[2] |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ |

**حاڵەتی چوارەم:** لای زۆرینەی زانایان[3] کچی کوڕ (یەکێك بێت یان زیاتر) شەش یەکی لێجێماوەکەی بۆ هەیە بەم مەرجانە:

١. لەگەڵ یەك کچدا بێت [4].

---

[1] ئەمە لای زۆرینەی زانایان، بەڵام لای زانایانی جەعفەری ئەوەی مایەوە دەدرێتەوە بەکچی کوڕەکە، چونکە دەچێتە جێگەی باوکیو وەك ئەوەی لێدێت باوك لەگەڵ کوڕدا هاتبێت، لە (ایضـاح الفوائـد ٢١٢/٤)دا هاتووە: منداڵی کچەکەی ئیدی ئەو منداڵە کوڕ بێت یان کچ پشکەکەی دایکی دەدرێتێ کەئەویش نیوەیە ئەگەر بەتەنیا هاتبوو، یان لەگەڵ دایکو باوکی هاتبوو، وەك دایکیشی لەوەی دەگەڕێتەوە بەشی دەدرێت، خۆ گەر کوڕ بوو ئەوا منداڵی کوڕەکە بەشی کوڕی دەدرێتێ نێر بێت یان مێ کەئەویش گەر بەتەنیا هات ئەوا هەموو سامانەکەی دەدرێتێ، ئەگەر لەگەڵ خاوەن پشکە دیاریکراوەکان یان یەکێك لەژنو مێردەکەدا هات ئەوا ئەو زیادەیەشی دەمێنێتەوە پێی دەدرێت.

[2] ئیدی چ برای کچی کوڕەکە بێت یان کوڕی مامی بێت.

[3] لە فیقهی جەعفەریو یاسادا: منداڵەکانی کوڕ گەر لەگەڵ کچدا بێن میراتیان پێ نادرێت ئیدی کوڕ بن یان کچ جیاوازی نیە.

[4] ئەگەر لەگەڵ زیاتر لەکچێکدا بێت ئەوا لەمیراتەکە بەشبڕاو دەکرێت.

٢. دەبێت کۆچکردووەکە کوڕی نەبێت.

٣. کوڕی کوڕ لەگەڵیدا نەیەت [1].

| **میراتگرەکان:** | <u>کچ</u> | <u>کچی کوڕ</u> | <u>دایك</u> | <u>باوك</u> |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ | ٦/١ | ٦/١ |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | ١ | ١ |

لای جەعفەریەکان بەکچ بەشبڕاو-حجب- دەکرێت چونکە کچ لەپلەی یەکەمدایەو کچی کوڕ لەپلەی دووەمدایە، هەرچەندە لە ریزبەندی یەکەمە.

**حاڵەتی پێنجەم:** کچی کوڕ لەرێگەی راسپاردننامەی پێویست -الوصیە الواجبە-ەوە میراتی بەردەکەوێتو ئەم حاڵەتە لەدەروازەی دواتردا باس دەکەین، لای زۆرینەی زانایان مناڵەکانی کچی کۆچکردووەکە لە خزمانی سك دادەنرێنو لەبەندی سێیەمدا چۆنیەتی میرات وەرگرتنیان دەخەینە روو.

**میراتی مندالی منالْ لە فیقهی جەعفەریدا:**

زانایانی جەعفەری دەڵێن: کوڕی کوڕ لەجێگەی کوڕ دادەنرێتو بەشی ئەو کەسە نزیکەی کۆچکردووەکەی بەر دەکەوێت کە لەجێگەیەتی [2].

مناڵەکانی کچ دەچێتە جێگەی کچەکە ئیدی ئەو مناڵانە کوڕ بن یان کچ جیاوازی نیە، مناڵەکانی کوڕیش لەجێگەی کوڕەکەن نێر بن یان مێ، خۆ گەر

---

[1] گەرنا بەپێی بنەمای نێر دوو هێندەی مێ بەشی دەکەوێتو میراتی پێ دەبڕێت.

[2] بەچەند ئایەتێك بەلگەیان هێناوەتەوە یەکێکیان ئەم ئایەتەیە: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمهاتكُمْ وَبَنَاتُكُمْ﴾ (النساء : ٢٣) وتویانە: ئوممەت یەکدەنگن ئەم ئایەتە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کچی کچو کچی کوڕ بێ بەش دەکرێن، ئەم ئایەتەش: ﴿وَحَلاَئِلُ أَبْنَائِكُمْ﴾ ئوممەت یەکدەنگن لەسەر ئەوەی ژنی کوڕی کوڕ و ژنی کوڕی کچ بەپێی ئەم ئایەتە بێ بەش دەکرێن. دەربڕینەکەش یەکە تەنها لەگەڵ راستەقینەیەکدا بەرەهایی نێت نەك هەردەم بەرەهایی بێت نەك لەسەر کۆی راستیو مەجاز.. هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ کوڕی کوڕ و کچی کوڕیش هەروەها دەگرێتەوە... ایضاح الفوائد ٤/٢١٣-٢١٤. الخلاف للطوسي ٢/٤٩ نخبة الاحاديث في الوصايا والمواريث للكرباسي ٣/٤٢.

بەیەکەوە هاتن ئەوا هەریەکەو بەشی ئەو کەسەی کۆچکردووەکەی بەر دەکەوێت کە جێی گرتۆتەوە.

| **میراتگرەکان:** | کچی کوڕ | کوڕی کچ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢ / ٣ | ١ / ٣ |
| پشکەکان: | ٢ | ١ |

خۆ ئەگەر دایکو باوك لەگەڵیاندا هاتن ئەوا هەریەکەیان شەش یەکی بەرکەوێتو ئەوەشی مایەوە وەك ئەوەی پێشتر باسمان کرد لەنێوان کوڕو کچەکاندا بەش دەکرێت.

ئەگەر ژنو مێرد یەکێکیان لەگەڵیاندا هات ئەوا بەشی هەرە کەمی پێ دەدرێتو ئەوەی مایەوە لەنێوانیاندا بەش دەکرێت وەك باسمان کرد، لەراسترینی دوو بۆچوونەکەی فیقهی جەعفەریدا ئەوەیە کە منداڵەکانی کچ ئەگەر کوڕو کچ بوون ئەوا بەشی دایکەکەیان بەسەریاندا دابەش دەکرێت بەجۆرێك کوڕ دوو هێندەی کچی پێ دەدرێتو وتراویشە بەیەکسانی بەسەریاندا دابەش دەکرێت[1].

**هێزی خزمایەتی کچی کوڕ:**

١- بەشبڕاوی ناتەواو -حجب نقصان- لە دایكو باوكو ژنو مێرد دەکەن لەوەی کەباشترین بەشیان بەریکەوێت کە بۆ دایكو باوك شەش یەکە، بۆ مێرد چوار یەك، بۆ ژنیش هەشت یەك.

٢- دەبێتە بەشبڕی تەواو -حجب حرمان-ی خزمانی سکی کوڕ بن یان کچ، هەروەها دەبێتە بەشبڕ لەمیرات بەرکەوتنی ئەو خوشكو برایانەی لەدایکن.

---

[1] اللمعة الدمشقية وشرحها الروضة البهية ٢ / ٣١٠.

٣- ئەگەر زیاتر لەیەکێك بوو ئەوا دەبێتە بەشبڕی کچەکانی کوڕی کوڕ چونکە ئەو کاتە کچی کوڕ وەك کچەو کچی کوڕی کوڕیش وەك کچی کوڕە ئەگەر نەبێتە خزمی پشت.

لە فیقهی جەعفەریدا: دەبێتە بەشبڕی -حجب- هەموو ئەوانەی لەپلەی دووەمو سێیەمدان، هەروەها دەبێتە بەشبڕی ئەوانەی لەپلەی یەکەمدانو لەم دوورترن، کچی کوڕی کوڕ ئەگەر لەگەڵ کچی کوڕ هات ئەوا میراتی بەر ناکەوێتو ، منداڵەکانو منداڵی منداڵەکان لای ئەوان لەپلەی یەکەمن ئیدی نێر بن یان مێ ئەوانیش پلەیان جیاوازە.

پلەی یەکەم وەك کوڕو کچ دەبنە بەشبڕی ئەوانەی پلەی دووەم وەك منداڵەکانی کوڕو منداڵەکانی کچ، پلەی دووەمیش وەك کوڕی کوڕ دەبێتە هۆی بەشبڕانی ئەوانەی پلەی سێیەم وەك کوڕی کوڕی کوڕو بەوجۆرە.

## دەروازەی چوارەم
## بەرکەوتەی منداڵی منالەکان لە میراتیدا
## بە راسپاردنی پێویست
## (استحقاق أولاد الأولاد من التركة بالوصية الواجبة)

بەر لەهاتنەخوارەوەی ئایەتەکانی تایبەت بەمیرات، دابەشکردنی میرات لەسەر بنەمای پێویستی راسپاردنامەی دایكو باوكو خزمەکان بوو، هەروەك لەم ئایەتەدا هاتووە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾.[1]

پاشان ئەم ئایەتە تایبەت کرا بە جگە لەو میراتگرانەی کەلە رێی میراتەوە مافی میرات وەرگرتنیان هەیە.

هەندێك لەزانایانی شەریعەتیش وای دەبینن پێویستی راسپاردن هێشتا ماوەو بەردەوامە بۆ ئەوانەی هۆکارەکانی میراتگریان تێدایەو، میراتیان بەر ناکەوێت بەهۆی بوونی میراتگرێکی بەهێزتر لەخۆی کە دەبێتە هۆی بەشبڕان–حجب–ی لێی، یان بەهۆی بەربەستێك لەبەربەستەکانی میرات بەرکەوتن وەك جیاوازی ئاین[2].

---

[1] سورة البقرة / ١٨٠.

[2] هەندێکیش وتویانە: هەر راسپاردنێك بۆ دایكو باوكو خزمان بە ئایەتەکانی میرات سڕاونەتەوە. بگرە هەندێك بۆ دوورتر لەوە چوونو وتراوە بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) سڕاوەتەوە: (ان الله اعطى كل ذي حق حقه فلا وصية لوارث) واتە: خوای گەورە مافی هەموو خاوەن مافێکی داوە بۆیە میرات لێگیراو بۆی نیە راسپاردن بکات، ئەمەش تێکەڵکردنە لەنێوان سڕانەوەو تایبەتکردن (النسخ والتخصيص)،ئەمەش هەڵەیەکە لێبوردنی بۆ نیە چونکە سڕانەوە لەقورئاندا نیە.

هێنانی ئایەتەکانی میرات و ئەو ئایەتەی ڕاسپاردن کەباسکرا بەیەکەوە لەلای هەندێك لەگەورە زانایان هێنراوە لەوانە زانای پایەبەرز (ابن حزم الظاهري) رەحمەتی خوای لێ بێت [1]، ڕاسپاردنی پێویست لەلایەن زانایانی هاوەڵانو شوێنکەوتووانو شوێنکەوتووانی شوێنکەوتووان و زۆرێك لە پێشەوای مەزهەبەکان بڕیاری لەسەر دراوە.

یاسادانەری میسریش لەیاسای ڕاسپاردنی ژمارە(٧١)ی ساڵی (١٩٤٦) [2] دا ئەم بۆچوونەی پەسەند کردووەو دواتر لەیاسای وڵاتانی دیکەی عەرەبیدا[3] هاتووە .

بەڵام دادگاو یاسای عێراقی وایان نەکرد تا ئەو کاتەی هەموارکردنەوەی سێیەمی یاسای باری کەسیی ژمارە (٧٢)ی ساڵی (١٩٧٩) دەرچوو کە مادەی (٧٤)ی زیاد کردووە بۆ یاساکەو تێیدا هاتووە:

---

[1] لە (المحلی (٣١٤/٩)دا هاتووە: ( فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە ڕاسپاردن بۆ ئەو خزمانەی بکات کەمیراتیان بەر ناکەوێت بەهۆی بەشبران —حجب— یاخود بێ دینیان یاخود لەبەر ئەوەی کەسانی تر هەیە کەبەهۆیانەوە میرات بەمان ناگات، یان ئەوەتا میراتیان هەر بەرناکەوێت بۆیە ئەوەندەی پێی خۆشە بە ڕاسپاردن بۆیان دیاری دەکات، هیچ سنوورێك لەمەدا نیە، خۆ ئەگەر ڕاسپاردنی نەکرد ئەوا میراتگرەکانی و سەرپەرشتکارەکەیان ئەوەی پێیان باشە دەیدەن، خۆ ئەگەر دایکو باوکی یان یەکێکیان بێ باوەڕ بوو لەسەری پێویستەو هەر دەبێت بیکات، بەڵگەی ئەمەش ئەم ئایەتەیە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ، فَمَن بَدَّلَهُ بَعْدَ مَا سَمِعَهُ فَإِنَّمَا إِثْمُهُ عَلَى الَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُ إِنَّ اللّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾(البقرة:١٨١)، ئەمەش وەك دەبیسترێت دایکو باوکو ئەو خزمانەی میراتیان بەر دەکەوێت لێی دەردەکرێت و تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بەشی دیاریکراویان نیە، خۆ ئەگەر ئەوە مافێکی ئەوان بێت ئەوا لەسامانەکەی بەشێك پێویستە دەربکرێتو پێیان بدرێت ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر ئەو کەسە ستەمی کردو فەرمانی بەوە نەدا (واتە ڕاسپاردنی نەکرد) کە دەربکرێت) .

[2] مادەکانی (٧٦، ٧٧، ٧٨، ٧٩).

[3] وەك یاسای سوری ژمارە (٣٤) ی ساڵی ١٩٧٥ لە مادە (٢٥٧).

ئەگەر منالێك بەر لە کۆچی دوایی باوکی یان دایکی مرد ئیدی کوڕ بێت یان کچ ئەوا وەك زیندوو دادەنرێت لەکاتی مردنی هەرکام لەو دووانەداو مافی شایستەی خۆی لەمیراتەکە دەدرێت بەمناڵەکانی کوڕ بن یان کچ بەپێی ئەحکامە شەرعیەکان، بەو پێیەی راسپاردنی پێویستە —الوصیة الواجبة— بەمەرجێك لە سێ یەکی میراتیەکە زیاتر نەبێت.

١— بەپێی بڕگەی (١)ی ئەم مادەیە راسپاردنی پێویست دەخرێتە پێش راسپاردنەکانی دیکە لە وەرگرتنی سێ یەکی لێجێماوەکەدا.

ئەم دەقەش لە ناوەرۆك‌و تێگەیشتنیدا بەڵگەیە لەسەر ئەم حوکمانە:

١— لەسەر هەموو کەس پێویستە پێش مردنی راسپاردن بکات بۆ منالی ئەو کوڕ یان کچەی کە پێش خۆی مردوون و بەو هۆیەوە لەمیرات بێ بەش دەبن چونکە کوڕو کچی دیکەی هەیە.

٢— خۆ ئەگەر مردو راسپاردنی نەکردبوو ئەوا دادوەر لەجێگەی ئەو دەبێت لەوەدا بەپێی ئەو یاسایە کە لەبۆچوونی هەندێ لەزانا موسڵمانەکان وەرگیراوە وەك زاهریەکان.

٣— راسپاردنەکە وەك بەشی کەسە کۆچکردووەکە وا دەبێت کەباوکی ئەو منالانەیەو مردووە، ئەگەر منالی کوڕی بوون بەشی باوکیان‌و، گەر منالی کچی کۆچکردووەکە بوون ئەوا بەشی دایکەکەیان دەدرێتێ، بەلام بەو پێیەی ئەم پشکە لەراستیدا راسپاردنە بۆیە حوکمەکانی راسپاردنی لەسەر جێ بەجێ دەکرێت‌و نابێت لەسێ یەکی لێجێماوەکە زیاتر بێت مەگەر میراتگرەکانی رازی بن.

٤— لەکاتی دابەشکردنی میراتەکەو دیاریکردنی میراتگرە خاوەن پشکەکان وا دادەنرێت کە کۆچکردووەکە (باوك یاخود دایکی نەوەکان) هێشتا لەژیاندایەو لەبەر رۆشنایی ئەم دەقەدا

میراتگرەکانیش وەك میراتگرێکی زیندوو بەشی خۆی دەدەنێ، پاشان ڕاستەوخۆ پشکەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ نەوەکانی لە کوڕو کچ.

## مەرجەکانی جێبەجێکردنی ڕاسپاردنی پێویست (الوصية الواجبة):

لە جێبەجێکردنی ڕاسپاردنی پێویستدا لەسەر دادوەرە ڕەچاوی ئەم مەرجانە بکات:

١. پێویستە منداڵەکان لەگەڵ نەوەکاندا بێت، چونکە ئەگەر نەوە کوڕ یان کچی کەسە کۆچکردووەکەی لەگەڵدا نەهات ئەوا خۆی لەڕێگەی میراتەوە بەشی دەدرێتو بەبێ ڕاسپاردنی پێویست.

٢. نابێت کۆچکردووەکە (باپیرە یان داپیرەی نەوەکان) ئەو کاتەی لەژیاندا بووە لەڕێگەی بەخشینو ڕێگەی ترەوە بەبێ بەرانبەر هێندەی بەخشیبێت بەنەوەکانی کەیەکسان بێت بە ڕادەی ڕاسپاردنی پێویست، خۆ ئەگەر بێ بەرانبەر بەشێك لەسامانەکەی پێ دابوون و ئەندازەکەی کەمتر لەبەشی ڕاسپاردنی پێویست بوو، ئەوا هێندەی پێ دەدرێت کە بگاتە ئاستی خۆی.

یاسادانەری عێراقی ئەم مەرجەی فەرامۆش کردووەو لە یاسای وڵاتانی دیکەی عەرەبیدا هاتووە [1].

٣. گەر نەوەکان کوڕ بوون یان کچ ڕاسپاردنە پێویستەکە بەپێی بنەمای (بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ) بەسەریاندا دابەش دەکرێت چونکە مافەکەیان وەك میرات وایەو ناکەوێتە ژێر حوکمەکانی ڕاسپاردنەوە

---

[1] وەك یاسای سوری مادە (٢٥٧ /ب): (یاخود ڕاسپاردنی بۆ کرابوون یان ئەو کاتەی لەژیاندابوو پێی بەخشیبوون بەبێ بەرانبەر بەڕادەی ئەوەی شایستەیەتی بەو ڕاسپاردنە پێویستە، خۆ ئەگەر بەکەمتر لەوە ڕاسپاردن کرابوو پێویستە بگەیەنرێتە ئەو ئەندازەیە).

کەلەنێویانـدا هەیـە راسـپاردنکراوەکە بەسـەر راسـپاردن بۆکراوەکانـدا بەیەکسانی دابەش دەکرێت ئەگەر راسپاردنکار شتێکی باس نـەکردبوو پێچەوانەی ئەمە بێت.

٤. نابێـت نەوەکـە بکـوژی کۆچـکردووەکە (بـاپیرەو داپـیرە) یـان بـاوکی یاخود دایکی کۆچکردووی بێت، ئەم مەرجەش لەبڕگەی دووەمی مـادە (٦٨)ی یاسای باری کەسێتیدا وەردەگیرێت کەدەڵێت: (مەرجە بکوژی راسپاردنکارەکەی نەبێت) [1].

٥. نابێت لە سێ یەکی لێجێماوەکە زیاتر بێت.

ئایـا مەرجـە راسـپاردنی پێویسـت بـۆ چـینی یەکـەم بێـت؟ ئـەم مەرجـە یاسادانەری عێراقی بەچاکو خراپ لێی بێدەنگ بووە.

بەڵام لەوتەی زانایانی شەریعەت وەردەگیرێـت کـە هـاتنی منالّـەکانی کـوڕ لەگەڵ منالّەکانی کوڕی کوڕدا هەروەك هاتنی کوڕە لەگەڵ منالّـەکانی کـوڕدا: بۆیە راسپاردنی پێویست تەنها چینی یەکەم ناگرێتەوە.

پاشان هەندێ لەیاسا عەرەبیەکان بە روونـی ئەمـەی لـەخۆ گرتـووە، وەك یاسای سوری [2].

یاسـادانەری عێراقـی چـاکی کـردووە کەراسـپاردنی گشـتگیر کـردووە بـۆ کوڕەزاو کچەزا.

---

[1] بەڵام ئایا مەرجە جیاواز نەبێت لەگەڵیدا لـە ئاینـدا؟ وەڵامەکـە نـەخێر چـونکە لـەو هۆکارانـەی وایکـردووە زانایان راسپاردنی پێویست بڕیار لێ بدەن ئەوەیە کە جیاوازی ئـاین رێگـرە لـە مـیرات پێـدان لەهەنـدێك حاڵەتدا، بۆچونی من لەگەڵ ئەوەدا نیە کە مامۆستا (محمد الحسيني) بۆی چووە لەبەمەرج گرتنی ئـەم مەرجە لەکتێبەکەیدا: (الموجز في شرح قانون الوصية) ل ٣٨١ .

[2] مادە (٢٥٧ /١):(هەر کەسێك مردو منالّی کوڕەکەی هەبوو، ئەو کوڕەشی پێش ئەم مرد یان لەگەڵ ئەمـدا مـرد، ئـەوا بـۆ منالّـەکانی ئـەو کـوڕەی سـێ یـەکی میراتیەکـە پێویسـتە بەراسـپاردننامە، ئـەم راسپاردننامەیەش بۆ منالّی کوڕەکەو منالّی کوڕی کوڕو بەرەو خوارتر).

**جێبەجێکردنەکانی:**

١- **میراتگرەکان:** باوك دایك کچ کوڕی کچێکی کەمردووە

وا دادەنرێت کە میراتگرەکان ئەمانەن: باوك دایك (٢)کچ

پشکە دیاریکراوەکان: ٦/١ ٦/١ ٣/٢

پشکەکان: ١ ١ ٤

بۆ هەر یەکێکیان دوو بەش هەیەو بەشی کۆچکردووەکە دەگوازرێتەوە بۆ کوڕەکەی

٢- **میراتگرەکان:** مێرد کوڕ کچی کچە مردووەکە

وا دادەنرێت میراتگرەکان ئەمانە بن: مێرد کوڕ، کچ

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ م بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ

پشکەکان: ١ ٣

بەشی کۆچکردووەکەش یەك پشکەو دەگوێزرێتەوە بۆ کچەکەی.

٣- **میراتگرەکان:** ژن (٢)کچ کوڕی کچە کۆچکردووەکە

وا دادەنرێت میراتگرەکان ئەمانە بن: ژنەکە (٣)کچ

پشکە دیاریکراوەکان: ٨/١ ٣/٢

بنچینەی بابەتەکە (٣×٨) = ٢٤

پشکەکان: ٣ ١٦+م =٢١بەش

بۆ هەر کچێك حەوت بەش هەیەو بەشی کۆچکردووەکە دەگوێزرێتەوە بۆ کوڕەکەی)

٤- **میراتگرەکان:** ژن کچ (٤)منالّی کوڕە مردووەکە

وا دادەنرێت میراتگرەکان ئەمانە بن: ژنەکە کچ: کوڕ

| | | | |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | م | (بۆ کوڕ دوو |
| پشکەکان: | ١ | ٧ | هێندەی کچ) |

بنچینەی بابەتەکە (٨)و لە(٢٤)دا راست دەبێت[1].

بۆ ژنەکە هەشت یەك (٣) بەش، کچەکە (٧)بەش، کوڕەکەش (١٤)بەش ئەمەش زیاترە لە سێ یەکی لێجێماوەکە کە (٨) پشکە هەربۆیە زیادەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ کچەکەو بەمەش پشکەکەی دەبێتە: (٧ + ٦ = ١٣) بەش.

هێندەی سێ یەکی لێجێماوەکەش لەبەشی کوڕەکە کە (٨) پشکە دەدرێتە منالّەکانی بۆ هەریەکەیان دوو بەش..

لەکۆتاییدا داوا لەیاسادانەرانی جیهانی ئیسلامی دەکەم بەرێگەیەکی دادپەروەرانەی هەمەلایەن چارەسەری راسپاردننامە بکەن تا حالّەتەکانی جیاوازی ئاینیش بگرێتەوە، بەتایبەت لەنێوان پیاوی موسلّمانو ژنەکەیدا کەلەسەر ئاینێکی ئاسمانی تر بێتو، مندالّی براو خوشکەکان بگرێتەوە لەخزمانی سکیی، وەك کچی براو منالّەکانی خوشكو منالّەکانی برای دایکی، دادپەروەرانە نیە کەمیرات بدرێتە منالّەکانی برای دایكو باوکی یان هی باوکیو نەدرێتە خوشکەکانیان تەنها لەبەر ئەوەی ئەمان پشتنو ئەوان لەخزمانی سکن، تەنها لەبەر ئەوەی ئەمان کوڕنو ئەوان کچن، لەکاتێکدا خزمایەتیەکەیان وەك یەکەو، وەك یەك لە کۆچکردووەکەوە نزیکن.

---

[1] چونکە ژمارە (٧) دابەش نابێت بەسەر سێدا (پاش ئەوەی کوڕ وەك دوو کچ دانرا) بۆیە ژمارەکەیان لەگەلّ بنچینەی بابەتەکە لێکدەدرێت (٣×٨=٢٤).

دەبینین بۆچوونی زانایانی ئیمامی لەم بابەتەدا نزیکترە لەقورئانو سوننەتو دادپەروەری، بۆچوونی ئەوانەی دیکە لە ژێر کاریگەری رەگەز پەرستی نەفامیدایە کە گرنگی زیاتر بەکوڕان دەدات لەکچان، هەر بۆ نمونە کەسێك مردو لەپاش خۆی لە برا دایكوباوکیەکەی کوڕێکی هەبوو، لەبرا دایكو باوکیەکەشی کچێکی هەبوو، ئەو دووانەش خوشكو بران لەیەك دایكو باوك، لای زانایانی مەزهەبە سونیەکان هەمووی بۆ کوڕ برا دایكو باوکیەکەیە چونکە خزمی پشتەو خوشکەکەی بێ بەش دەکرێت لەمیرات وەرگرتن چونکە لەخزمانی سکە، هەرچەندە پلەی خزمایەتیان وەك یەکەو هەر خزمایەتیشە هۆکاری میرات بەرکەوتن.

لەبەر ئەوە پێشنیار دەکەین کە میراتیەکە لەم حاڵەتەدا بەسەر کوڕو کچی براکەدا دابەش بکرێت لەسەر بنەمای راسپاردننامەی پێویست، ئەمەش وەك رەچاوکردنی دادپەروەریو یەکخستنی نێوان هەردوو فیقهی سوننەو شیعە.

# دەروازەی پێنجەم

## بەرکەوتەی خوشکی دایک و باوکی و خوشکی باوکی

**( استحقاق الأخت الشقيقة والأخت من الأب )**

خوشکی دایكو باوکیو خوشکی باوکی چەند حاڵەتێکیان هەیە، لەهەندێکیاندا بەیەك دەگەن، لەهەندێکیشیاندا لێك جیان.

### بەرکەوتەی خوشکی دایک و باوکی:

ئەم حەوت حاڵەتەی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** بەم مەرجانە نیوەی میراتیەکەی پێ دەدرێت:

١- خۆی بەتەنیا بێت.

٢- برای دایكو باوکی لەگەڵدا نەهاتبێت.

٣- کۆچکردووەکە هیچ لقێکی دیکەی میراتگری نێر یان مێی نەبێت.

٤- کۆچکردووەکە باوکی لەژیاندا نەبێت (بەپێی رێککەوتنی زانایان) و باپیری نەمابێت بەپێی بۆچوونی ئەبو حەنیفە، چونکە باوك دەبێتە بەشبڕ-حجب- ی و باپیرەش بەش دەبات بەپێی بنەمای بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە.

٥- کۆچکردووەکە دایکی لەژیاندا نەبێت (لای جەعفەریەکان)، چونکە دایك لەپلەی یەکەمدایەو خوشك لەپلەی دووەم.

| **میراتگرەکان:** | مێرد | خوشکی دایكو باوکی |
| --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

**حاڵەتی دووەم:** کاتێ خوشکی دایكو باوکی لەیەکێك زیاتر بوو، ئەو مەرجانەی لەشێوەی یەکەمدا باسکرا تێیاندا هاتە دی جگە لەمەرجی یەکەم، ئەوا دوو لەسەر سێی لێجێماوەکەیان پێ دەدرێت.

| **میراتگرەکان:** | (٢) خوشکی دایكو باوکی | (٢) برای دایکی [1] |
| --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢ / ٣ | ١ / ٣ |
| پشکەکان: | ٢ | ١ |

**حاڵەتی سێیەم:** خوشکی دایكو باوکی ئیدی یەکێك بێت یان زیاتر بەپێی بنەمای (بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە هەیە) بەم مەرجانە میراتی دەدرێتێ:

١- کۆچکردووەکە برای دایكو باوکی هەبێت.

٢- پێویستە مەرجی سێیەمو چوارەمو پێنجەم کەلەخاڵی یەکەمدا خرانە روو تێیدا بێتە دی.

| **میراتگرەکان:** | ژنەکەی | خوشکی ك | برای ك |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | م٣ (بۆ نێر دوو هێندەی مێ) | |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ |

**حاڵەتی چوارەم:** لای زۆرینەی زانایان [2] بەخزمایەتی پشت لەگەڵ کەسانی تر (کچی کۆچکردووەکە یان کچی کوڕەکەیوبەرەو خوارتریش بێت) ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە پاش دابەشکردنی بەشی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان پێی دەدرێت.

---

[1] بۆ زیاتر لەیەك برا یان خوشکی دایکی سێ یەکی میراتەکە هەیە، ئەم بابەتەش بنچینەکەی (٣) دەبێت بەڵام بەشی براکان ناتوانرێت بەبێ مانەوە بەسەریاندا دابەش بکرێت، بۆیە ژمارەکەیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت (٢×٣=٦) بۆ هەر خوشکێك دوو بەش و هەر برایەك یەك بەش.

[2] لەفیقهی جەعفەریدا منالێ لە پلەی یەکەمدانو خوشكو برا لەپلەی دووەمدان، جا ئەگەر کەسێك لەپلەی یەکەمدا هەبوو نێر بێت یان مێ دەبێتە هۆی ئەوەی میرات بەوانەی پلەی دووەم نەگات.

| میراتگرەکان: | کچ | خوشکی ك[1] |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

| میراتگرەکان: | کچی کوڕ | خوشکی ك |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

| میراتگرەکان: | مێرد | کچی کوڕ | خوشکی ب |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٢/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٢ | ١ |

لەپێناو میرات بەرکەوتنی خوشکی دایكو باوکیدا لەڕێگەی خزمایەتی پشت بەهۆی کەسی ترەوە (کچوکچی کوڕ) پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێتە دی:

١- دەبێت کۆچکردووەکە کچ یان کچی کوڕی هەبێت.

٢- دەبێت کۆچکردووەکە کوڕ یان باوکی نەبێت [2].

٣- نابێت برایەکی دایكو باوکی هەبێت، دەنا بەهۆی خزمایەتی پشت لەڕێگەی کەسی ترەوە میراتی وەردەگرێت[3].

---

[1] لەیاسای عێراقیدا (م ٩١ / ٢)ی یاسای باری کەسیی کچی کۆچکردووەکە دەبێتە بەشبڕی -حجب- خوشكو براکان چونکە ئەو دەبێتە هۆی بەشبڕان-حجب-ی هەموو میراتگرەکان جگە لەپێنج پێڕ نەبێت کەئەمانەن: دایكو باوك، ژنو مێرد، کوڕی کەسە کۆچکردووەکە.

[2] چونکە بەهەریەکەیانبەشبڕاو دەکرێت لەمیرات بردن.

[3] واتە لەبەر ڕۆشنایی بنەمای (بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ هەیە) لە کتێبی: نیل الاوطار (٦٦/٦)، لەژێر ناونیشانی (باب الاخوات مع البنات عصبة): ((لە (هزيل) کوڕی (شرحبيل) دەڵێت: ((پرسیار کرا لە ئەبوو موسا دەربارەی کچو کچی کوڕو خوشك وتویەتی: بەردەوام ڕێگەم دەداو منیش لە ڕێنمونیکراولنم کەبەوە دادوەری بکەم کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی: بۆ کچ نیوەو شەش یەك بۆ کچی کوڕ وەك تەواوکاری دوولەسەر سێیەکە، ئەوەشی مایەوە بۆ خوشکەکە دەبێت)) رواه الجماعة إلا ←

**حاڵـەتی پێنجـەم:** لەگـەڵ خوشـكو بـرا دایكیەكانیـدا هاوبـەش دەبێـت لەپشــكەكانیاندا، ئەگــەر خەســڵەتی خزمــی پشــتی بــەهۆی بــرا دایــكو باوكیەكەیـەوە بەدەستهێنا، لـە میراتیەكەشـدا ئەگـەر پـاش پێـدانی بەشـی خـاوەن پشـكە دیاریكراوەكـان لـەمیراتگرەكانی دیكـە هـیچ نەمایـەوە، لەبـەر رۆشنایی ئەمەدا پێویستە ئەم مەرجانە بێتە دی:

١- دەبێت بەهۆی برا دایكو باوكیەكەیەوە ببێتە خزمی پشت.

٢- دەبێت لەنێو میراتگرەكاندا خوشكو برای دایكی هەبن.

٣- میراتگرەكانی دیكە میراتیەكە نغرۆ بكەن.

٤- لەرووی میرات بەركەوتنەوە بە خوشكی دایكی دادەنرێت [1].

ئەم حاڵەتەش لای هەندێك لەزانایان بوونی نیە [2].

---

مسلماً والنسائي، (احمد والبخاري) ئەمەیان بۆ زیاد كردووە: چوینە خزمەت ئەبو موسا قسـەكەی ئـیبن مەسعودمان بۆ گێڕایەوە، ئەویش وتی: پرسـیار لـەمن مەكـەن مـادام حیـبری ئومـەت (مەبەسـت ئـیبن مەسعودە) رایەكەی ئێوەی هەیە))..

[1] ئـەم حاڵەتـەش پێویسـتی بـە (الاستحسـان) و ویـژدانو دادپـەروەری هەیـە چـونكە مـافی میراتگرەكـان لەمیراتەكەدا ئیعتیبار بۆ باوكەكە دادەنرێت و رەچاوی رێگەی گەیشتنەوە بەمردووەكە دەكرێت تێیاندا، بەمەش منداڵی دایكیو منداڵی دایكو باوكی یەكسانن لەگەیشتنەوە لەرێگەی دایكەوە.

[4] وەك حەنەفیو حەنبەلیەكان، لە (الدر المختار ٦/٧٨٥) ٠ مێردو دایـكو بـرای دایكـیو بـرای بـاوكیو بـرای دایكو باوكی، مێردەكە نیوەی بەر دەكەوێت، دایكەكەش شەش یەك، كوڕی دایكیش شـەش یـەك، بـرا باوكو دایكیەكان هیچیان نادرێتێ چونكە خزمی پشتنو هیچیان بۆ نامێنێتـەوە. لای مالیـك و شـافعی ئەو دوو پێڕەی دوایی بەشداری پێدەكرێن، وەك ئەوەی هەموویان منداڵی دایكەكە بـن و بـە هاوبەشـێتی (المشركە) ناونراوە. لە (المغني لابن قدامة ٦/١٨٠ )٠ خۆ ئەگەر مێردو دایكو برای دایكیو برای بـاوكیو و دایكی بوو ئەوا مێردەكە نیوەو دایك شەش یەكو برای دایكیەكان سێ یەك، مافی برای باوكیو دایكی نامێنێت، دەگێڕنەوە لە (عمر)ی كوڕی (خطاب) و(عثمان) و(زیـد كـوڕی ثابـت) رەزای خوایـان لێ بێـت كەئەوان منداڵی دایكی و باوكیان هاوبەش كردووە لەگەڵ منداڵی دایكیو بەیەكسانی لەنێوانیانـدا بەشـیان كردووە، ئەمەش لەم ئایەتەدا هەیە: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَـهُ أَخٌ أَوْ أُخْـتٌ فَلِكُـلِّ وَاحِـدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِـي الثُّلُـثِ﴾(النسـاء:١٢) جـا ئـەوەی هاوبەشـی كـرد لەنێوانیاندا هاوبەشی كرد لەنێوانیانداو هەریەكـەیان شـەش یـەكی پێنـەدان ئـەوا پێچـەوانەی رووكـاری قورئان بڕیاری داوە).

| میراتگرەکان: | مێرد | دایك | خوشكی ك. | برای ك | (٢)برای د |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ | م.پ | | ٣/١ |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | هیچ نامێنێتەوە | | ٢ |

| وادادەنرێت ئەمانەن: | مێرد | دایك | (٤)برا یان خوشك لەدایکەوە |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ | ٣/١ |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | ٢ |

بنچینەی بابەتەکە (٦)ە (بچوکترین هاوبەش) بە (١٢) راست دەردەچێت[١].

بۆ مێردەکە (٦) بەش، دایکەکەش (٢) بەش، ئەوەی مایەوە (٤) بەش بۆ براو خوشکەکان بەیەکسانی بۆ هەریەکەیان یەك بەش[٢].

**حاڵەتی شەشەم:** خوشکی دایكو باوکی وەك برای دایكو باوکی دەبێت لەکاتێکدا کەبرای دایكو باوکی لەگەڵ نەهاتبێت، ئەمەش بەپێی هەمواری هەشتەمی یاسای باری کەسیی کە مادەی (٨٩)ی زیاد کرد، لەنێویدا برگەی چوارەم کەئەمە دەقەکەیەتی: (تعتبر الأخت الشقيقة بحكم الاخ الشقيق في

---

[١] پاش لێکدانی نیوەی ژمارەی براو خوشکەکان (٢) لەبنچینەی بابەتەکە (٦) (٢×٦=١٢).

[٢] ئەم بابەتە بەهاوبەشکار بە(المشتركه) یان (المشتركه) یا (یمیه) یا (حجریه) ناونراوە چونکە عومەری کوڕی خەتاب (ﷺ) لەساڵی یەکەمی جێنشینیدا لەم بابەتەدا دلوەری کردووە بەوەی هیچ بە خوشكو برا دایكو باوکیەکان نەدرلوە چونکە بەشبڕاو بوون بە نغرۆ. هەمان بابەت دووبارە بویەوە لەساڵی دووەمدا ویستی وەك بابەتەکەی پێشتر بڕیاری تیا بدات پێیان وت: ئەی ئەمیری بڕواداران: وا دابنێ کە باوکمان بەرد بووە، یان فڕێ درلوەتە دەریاوە، ئەی ئایا دایکمان یەك نیە؟!!
ئەویش قسەکەی پەسەند کردنو بەهاوبەش کردنیان بڕیاریدا، پێی وترا تۆ لەساڵی یەکەمی جێنشینتدا پێچەوانەی ئەمە بڕیارتدا، وتی: ئەوە بەو جۆرە بوو کە دلوەریمان تیا کردو ئەمەش بەمجۆرەیە کەدلوەری تیا دەکەین.

الحجب).واتە: خوشکی باوکو دایکی لەجێگەی برای دایکو باوکیدا دەبێت لە بەشبڕ-حجب-کردندا.

| میراتگرەکان: | ژن | خوشك ك | برای باوکی یان (کوڕی برا ك) |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | ١/٢ +م | ب |
| پشکەکان: | ١ | ٣ + ١ | هیچ |

فیقهی جەعفەری دان بە حاڵەتی پێنجەمو شەشەمدا نانێت، چونکە لە حاڵەتی پێنجەمدا دایك دەبێتە بەشبڕی -حجب- خوشكو براکان، چونکە ئەم لەپلەی یەکەمەو ئەوان لەپلەی دووەمن، لە حاڵەتی شەشەمدا خوشکی دایکو باوکی وەك برای دایکو باوکی وایە، کەهەر یەکەیان لەپلەی یەکەم ریزی دووەمدان، هەر بۆیە لەگەڵیاندا برای باوکی یان خوشکی باوکی میراتیان نادرێتێ چونکە لەپلەی دووەمنَ، لەمبارەیەوە هەموارکردنەوەکە یەکی گرتۆتەوە لەگەڵ ئەم فیقهە.

**حاڵەتی حەوتەم:** ئەگەر لەگەڵ باپیرە (باوکی باوك)ی کەسە کۆچکردووەکەدا هات ئەوا لەهەندێك حاڵەتدا وا دادەنرێت وەك ئەوەی لەگەڵ برای دایکو باوکیدا هاتبێت ئەمەش لەشوێنی خۆیدا باس دەکەین.

**هێزی خزمایەتی خوشکی دایک و باوکی:**

١-لەگەڵ باوکی کۆچکردووەکەو کوڕیو کوڕی کوڕەکەی با بەرەوخوارتریش بێت هات بەکۆدەنگی زانایانی شەریعەت بەشبڕی-حجب- لەمیراتی لێ دەکرێت ومیراتی نادرێتێ، لەفیقهی جەعفەریشدا کاتێ لەگەڵ دایکی کەسە کۆچکردووەکەو منالەکانی هات ئیدی کوڕ بن یان کچ جیاوازی نیە ئەوا میراتی ناکەوێت چونکە ئەوان لەپلەی یەکەمنو ئەم لەپلەی دووەمە، لەیاساشدا لەگەڵ کچی کەسە کۆچکردووەکە.

٢-هەموونەو خزمانە بێ بەش دەكات كەلەسكەوەن، خۆ ئەگەر زیاتر لەیەكێك بوو ئەوا بە یەكدەنگی زانایان ئەو خوشكانەش بەشبڕاو -حجب- دەكات كەلەباوكن[1] و، بەپێی یاساش هەریەك لەوانەش بەشبڕاو دەكات كەمیراتیان پێ بدرێت كە بەهۆی برای دایكو باوكیەوە بەشبڕاو بكرێت، لەمەزهەبی جەعفەریشدا هەموو ئەو میراتگرانە رێگری لێدەكات كەلە پلەی سێیەمدانو، ئەو میراتگرانەش كە لەریزبەندی یەكەمو پلەی دووەمدا نین.

**جێبەجێكردنەكانی:**

١- **میراتگرەكان:** باوك (یان كوڕ

یاخود كوڕی كوڕ) خوشكی ك (یەكدەنگی لەسەرە)

پشكە دیاریكراوەكان: هەموو میراتیەكە . ب

٢- **میراتگرەكان:** دایكی كەسە كۆچكردووەكە

(یان یەكێك لەمناڵەكانی

یاخود مناڵی مناڵەكانی) خوشكی ك (فیقهی جەعفەری)

هەموو میراتیەكە ب

٣- **میراتگرەكان:** خوشكی ك برای باوكی (یان كوڕی برا یان مام یان كوڕی مام)

هەموو میراتیەكە ب (یاسا، فیقهی جەعفەری)

٤- **میراتگرەكان:** خوشكی ك برای باوكی (یان كوڕی برا لە باوك یاخود مام)

پشكە دیاریكراوەكان: ٢/١ م (زۆرینەی زانایان)

پشكەكان: ١ ١

ب (لای زۆرینەی زانایانو یاسا)

---

[1] گەر نەبوونە خزمی پشت بەهۆی كەسی ترەوە ولتە بەهۆی برای باوكی لای زۆرینەی زانایان.

## بەركەوتەی خوشكی باوكیی:

ئەو خوشكەی كەسە كۆچكردووەكە كەلەباوكەوە خوشكیەتی هەموو ئەو شێوانەی كەبۆ خوشكی باوكو دایكی[1] باسكران هەیەتی بەهەمان ئەو مەرجانەو ئەو ناكۆكیە مەزهەبیو یاساییانەی كەهەیە لەمیرات وەرگرتنی خوشكی دایكو باوكیدا، جگە لە شێوەی پێنجەمو شەشەم چونكە لەگەڵ براو خوشكەكانی دایكیی هاوبەش دەبێت هەروەك چۆن خوشكی دایكو باوكیی هاوبەشیان دەبێت، لەیاساشدا وەك برا نابێت لە بەشبڕان —حجب— دا، چونكە هەموارەكە بەدەق خوشكی دایكو باوكی تایبەت كردووە.

لەگەڵ رەچاوكردنی ئەم خاڵانەدا:

١- لای زۆرینەی زانایان شەش یەكی بۆ هەیە ئەگەر لەگەڵ یەك خوشكی دایكو باوكیدا بوو.

٢- بەكۆدەنگی زانایان بەدوو خوشكی دایكو باوكی یان زیاتر بەشبڕاو—حجب— دەكرێت.

٣- خوشكی باوكیی لەگەڵ برای باوكیدا هات دەبێتە خزمی پشت بەبێ برای دایكو باوكی.

٤- بەهۆی برای دایكو باوكیەوەی بەشبڕاو دەكرێت لەمیراتی بردن، لە فیقهی جەعفەریشدا[2] بەخوشكێكی دایكو باوكیی یان زیاتر، یاسادانەری عێراقیش لەمادە٩١ / ٢.

---

[1] بێ هیچ جیاوازییەك لەنێوان فیقهی سنیو جەعفەریدا. في ایضاح الفوائد (٣١٦/٤). ئەو كەسەی لەسەری باوكەوە نزیكە دەچێتە جێگای ئەو برایانەی كەلەدایكو باوكەوە نزیكن كاتێك ئەوا نەبنو پشكەكەیشی وەك بەشی ئەوان دەبێت).

[2] ایضاح الفوائد (٤/ ٢١٦).(ئەوەی لەباوكو دایكەوە خزمە بەرەهایی دەبێتە رێگر لەوەی كەبەتایبەت لەرێی باوكەوە خزمە).

جێبەجێکردنەکانی:

١- **میراتگرەکان:** مێرد برای باوکیی
پشکە دیاریکراوەکان: ٢/١ ٢/١
پشکەکان: ١ ١

٢- **میراتگرەکان:** (٢)خوشکی باوکیی (٢)برای دایکیی بنچینەی بابەتەکە (٣)ە
پشکە دیاریکراوەکان: ٣/٢ ٣/١ راست دەبێت بە(٦)
بۆ هەر خوشکێکی باوکیی بەشێك هەیە.

٣- **میراتگرەکان:** ژن برای باوکی خوشکی باوکیی
پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ .٣م (بۆ نێر دوو هێندەی مێ)
پشکەکان: ١ ٢ ١

٤- **میراتگرەکان:** باوك(یان کوڕ یان کوڕی کوڕ) خوشکی باوکیی(هاودەنگی لەسەرە)
پشکە دیاریکراوەکان: هەموو لێجێماوەکە ب

٥- **میراتگرەکان:**
دایك(یان یەکێك لەمناڵەکان یان مناڵی مناڵەکان) خوشکی باوکیی
هەموو میراتیەکە ب(فیقهی جەعفەری)

**هێزی خزمایەتی خوشکی باوکی (قوة قرابة الأخت من الاب):**

١. بەهەموو ئەو میراتگرانە بەربەستی میرات وەرگرتنی لێ دەکرێت کە دەبنە ڕێگر لەخوشکی دایكو باوکی، هەروەها بەدوو خوشکی دایكو باوکی و زیاتر و برای دایكو باوکیش ئەگەر بەهۆی برایەکی باوکیەوە نەبێتە پشت.
٢. هەموو ئەوانەی لەگەڵ خوشکی باوكو دایکیدا میراتیان نادرێتێ لەگەڵ خوشکی باوکیشدا پێیان نادرێت تەنها برای باوکیی بەدەرە لەمەو پێی دەدرێت.

## بەڵگەکانی ئەو حوکمانەی باسکران:

ئــەو حوکمانــەی باســکران هەیانــە بەرهــەمی ئیجتیهــادە، هەشــیانە لــە ســوننەتی پێغەمبــەردا [1](ﷺ) هــاتووە، زۆربەشــیان لــەقورئانی پــیرۆزدا باسکراون: ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ[2] إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِن كَانُواْ إِخْوَةً رِّجَالاً وَنِسَاء فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّواْ وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾.[3]

---

[1] بڕوانە کتێبی ( نيل الاوطار) ل ٦ / ٦٦ وبەدواتر.

[2] رازی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت (١١/١٢٢-١٢٣): (الكلالة) ناوێکە دەکەوێتە سەر میراتگرو میراتلێگیراو: خۆ گەر کەوتە سەر میراتگر ئەوا جگە لە باوك و کوڕ دەبێت، ئەگەر کەوتە سەر میرات لێگیراویش کەئەویش مردووە ئەوا هیچ کام لەدایك و باوك و منداڵەکان میراتی لێ ناگرن). پاشان دەڵێت: ڕوکاری ئەم ئایەتە سێ پابەندی ( تقييد)ی تێدایە:

یەکەم: ڕوکاری ئایەتەکە ئەوە دەخوازێت کەخوشك نیوەی بەر بکەوێت کاتێ کوڕی لەگەڵ نیـە، بـەڵام کاتێ کوڕ هەبێت ئەوا نیوەی بەرناکەوێت، شتەکە بـەوجۆرە نیـە، بـەڵکو مـەرجی ئـەوەی خوشـك نیوەی بەریکەوێت ئەوەیە کەکۆچکردووەکە منداڵی کوڕی نەبێت، خۆ ئەگەر کچێکی هـەبوو لەگـەڵ خوشکێك لێرەدا خوشکەکە نیوەی بەردەکەوێت.

دووەم: ڕووکاری ئایەتەکە ئەوە دەخوازێـت ئەگـەر کۆچـکردووەکە کـوڕی نـەبوو ئـەوا خوشـك نیـوەی بەردەکەوێت، بەوجۆرەش نیە، بەڵکو مەرجەکە ئەوەیە کۆچکردووەکە کوڕو باوکی نەبێت، چونکە بەکۆدەنگی زانایان خوشك کاتێ باوکی لەگەڵ هاتبێت میراتی بەرناکەوێت.

سێیەم: ئەوەی خوای گەورە دەفەرموێت: (وله اخت) مەبەست لێی خوشکە لەسـەری بـاوك و دایکـەوە یان تەنها لەسەری باوکەوە چونکە خوشك لەسەری دایکەوە و بـرا لەسـەری دایکـەوە لەسـەرەتای سورەتەکەدا خوای گەورە بەگشتی حوکمەکەی روون کردوونەتەوە: ئەگەر یـەکێك بـوو ئـەوا شـەش یەکی بۆ هەیە، زیاتر لەیەکێك بوو سێ یەك).

[3] النساء : ١٧٦.. حوکمی زیاتر لەدوو خوشك بـە ڕوونـی نـەوتراوە، بـەڵام وەك سـوننەتی پێغەمبـەر (ﷺ) سەلمێندراوە کەهەروەك حوکمی دوو خوشك وایە ئەمەش بە پێوان-قیاس- لەسەر کچان، پاشان لـەم شێوە دەربڕینەی قورئاندا هونەرێکی زۆرجوانی ڕەوانبێژی هەیە کەئەویش سڕینەوەی ئەوەی دواترە بە (قرينه)ی پێشتر، هەروەها سڕینەوەی ئەوەی پێشترە بـە (قرينـە)ی دواتـر، لـەبارەی میراتـی کچـەوە ←

# دەروازەی شەشەم

## بەرکەوتەی خوشک و برای دایکی

### (استحقاق الإخوة والأخوات من الأم)

خوشكو براكانی كەسە كۆچكردووەكە كەتەنها لەدایكەوە خوشكو برای ئەونو باوكیان جیایە هەمیشە لەرێگەی بەشی دیاریكراوەوە میراتیان پێ دەدرێت، لەبەر ئەوەی بەخزمایەتی دایك دەگەنەوە بەكۆچكردووەكە، بەپێی ئەو كۆدەنگیەی كەلەدەقی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەرەوە وەرگیراوەجیاوازی نیە لەنێوان نێرو مێیاندا، تەنها دوو حەڵەتیان هەیە:

**حاڵەتی یەكەم:** ئەگەر تەنها یەكێك بوو، ئیدی كوڕ بێت یان كچ جیاوازی نیە، گەر بەهۆی میراتگرێكی لەم بەهێزترەوە بەشبڕاو -حجب- نەبوو ئەوا شەش یەكی دەدرێتێ.

**حاڵەتی دووەم:** ئەگەر دووان یان زیاتر بوون، كوڕ یان كچ بوون، یان كوڕیشو كچیش، ئەوا سێ یەكی لێجێماوەكەیان بۆ هەیە، لەهەموو رەوشەكاندا سێ یەكەكە بەیەكسانی بەسەریاندا دابەش دەكرێتو، لەكاتی هاتنی كوڕو كچدا كار بەبنەمای ((للذكر مثل حظ الأنثيين)) ناكرێتو دیاریكردنی پشكەكانیان لەبەر رۆشنایی ئەم ئایەتەدا دەبێت:

﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً[1] أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ[2] فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا

---

فەرموویەتی: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ﴾. لەبارەی میراتی خوشكەكانیشەوە فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾.

[1] پێشتر واتای وشەی (الكلالـة) لەپەراوێزدا رونكرایەوە. وشەی (الكلالـة) بۆ نێرو مێش بەكار دێت، لەعەرەبیدا دەوترێت: (رجل كلالة وامرأة كلالة). چونكە چاوگە وەك (الوكالة والدلالة).

[2] واتە برایەك كەلەدایكەوە برایەتی، یان خوشكێك كەلەدایكەوە خوشكیەتی، بەكۆدەنگی زانایان ئەمە مەبەستە لەبەر ئەوەی حوكمەكانی خوشكی دایكو باوكیو خوشكی باوكیی لەئایەتێكی دیكەدا هاتووە ←

السُّدُسُ فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾[1].

**هێزی خزمایەتی خوشك و برا:**

١-بەپێی كۆدەنگی زانایان خوشكو برا دایكیەكان بە باوكو دایكی كەسە كۆچكردووەكەو منداڵی ئیدی كوڕ بن یان كچ بەشبڕاو-حجب- دەكرێن، لای زۆرینەی زانایانیش [2] بە باپیرەش (باوكی باوك)و لای جەعفەریەكانیش بەدایكی كۆچكردووەكەو منداڵی كچەكانیشی ئیدی كوڕ بن یان كچ.

٢-نابنە بەشبڕی -حجب- هیچ یەكێك لەمیراتگرانی خاوەن بەشی دیاریكراوو خزمانی پشت، لای زۆرینەی زانایان تەنها خزمانی سكیی بەشبڕاو دەكەن،و، لای جەعفەریەكان لەكاتی هەبوونی ئەماندا مامەكانو پورەكان(خوشكی باوك)و، خاڵەكانو پورەكان (خوشكی دایك) میراتیان نادرێتێ چونكە ئەوانە لەپلەی سێیەمدان، لەكاتێكدا خوشكو برای دایكی لەپلەی دووەمدانو بنەمای گشتیش لای ئەوان ئەوەیە ئەگەر میراتگرێك هەبوو لەپلەی دووەمدا نێر بێت یان مێ جیاوازی نیە ئەوا ئەوانەی لەپلەی سێیەمدا دێن میراتیان نادرێتێ.

**جێبەجێكردنەكانی:**

| ١- **میراتگرەكان:** | برا (یان خوشك)ی دایكیی | برا ك |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٥ |

هەروەك باسمان كرد، بۆ خوێندنەوەی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص و ئەوانەی تر: ((وله اخ أو اخت من ام)) واتە: برا یان خوشكێكی هەیە لەدایكەوەیە، تفسیر الرازاي ٩/٢٣١.

[1] سورەتی النساء / ١٢.

[2] لای جەعفەریەكان لەگەڵ باپیرەدا بەرەهایی میراتیان بەر دەكەوێ چونكە هەردوولا لەپلەی دووەمدان.

٢- **میراتگرەکان:** (٢) برای دایکیی برای باوکیی

پشکەکان: ١/ ٣ م

٣- **میراتگرەکان:** (٤) خوشکی دایکیی مام[1] بنچینەی بابەتەکە (٣) یە

پشکە دیاریکراوەکان: ١/٣ م

بە (١٢) راست دەردەچێت ئەمەش بەلێکدانی (٤×٣)، بۆ کچێکیان بەشێك هەیەو ئەوەی مایەوە بەخزمایەتی پشت دەدرێتە مامەکەی.

پشکەکان: ٤ ٨

٤- **میراتگرەکان:** باوك (٥) خوشکی دایکیی

پشکە دیاریکراوەکان: هەموو میراتیەکە ب (یەکدەنگی لەسەرە)

٥- **میراتگرەکان:** باپیر (باوکی باوك) (٣)خوشك (یان برای دایکیی)

هەموو میراتیەکە ب

---

[1] لای جەعفەریەکان مام رێگیری دەکرێت چونکە لەپلەی سێیەمە.

# دەروازەی حەوتەم
# بەركەوتەی باپیرە و داپیرە لە میراتیدا
## (استحقاق الجد والجدة من التركة)

چۆنیەتی میرات پێدانی باپیرەو داپیرە لەگرنگترین ئەو بابەتانەیە لەفیقهی ئیسلامیدا كە راجیاییی تێدایە لەوەی كەچۆن جۆری میراتگرێتی باپیرەو داپیرە دیاری بكرێت لەلای باوك (باوكو دایكی باوك)و لەلای دایك (باوكو دایكی دایك)، هەروەها ئەندازەی بەشی هەریەكەیان، بەتایبەت لەكاتێكدا كەلەگەڵ براو خوشكی كەسە كۆچكردووەكەدا بێن، لەو رووەوە كە ئایا باپیرە (باوكی باوك) وەك باوك وایە لەهێزی بەشبڕی –حجب–ی كەسانی دیكەدا لەكاتێكدا باوك یاخود دایك نەمابێت؟ ئەم راجیاییەش لەبەر ئەوەیە دەقێكی روون لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) دەربارەی میراتی باپیرەكانو داپیرەكان نیە.

### بەركەوتەی داپیرە:[1]

لای زۆرینەی زانایان داپیرە دابەش كراوە بۆ دوو جۆر:

أ– داپیرەیەك لەخزمانی سكە: بریتیە لەو كەسەی كە خزمایەتیەكەی لەگەڵ كەسە كۆچكردووەكەدا داپیرەیەكی سكی(رەحمی)یە وەك دایكی باوكی دایك، حوكمەكانی ئەمەش لەباسی سێیەمی ئەم بەندەدا دێت.

ب–داپیرەیەك لەخاوەن پشكە دیاریكراوەكانە: بریتیە لەو داپیرەی

---

[1] پێشخستنی داپیرە لە باپیرە لەم باسەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو كەلێنە زۆرانەی لەمیراتی داپیرەدا هەیە.

کەلەگەیشتنەوەی بەکەسە کۆچکردووەکە داپیرەیەکی سکی (ڕەحمی) وەك دایکی دایكو بەرەوسەرتر، دایکی باوكو بەرەوسەرتر نەکەوێتە نێوانیان.

زۆرینەی زانایان بۆچوونیان وایە: بە ڕەهایی مافی شەش یەکی میراتەکەیان هەیە بەپێی سوونەتی پێغەمبەر[1] (ﷺ)، ئیدی کۆچکردووەکە لقێکی میراتبەری هەبێت یان نا، داپیرەکە باوکی[2] بێ یان دایکی[3] یان هی هەردوولا[4] جیاوازی نیە.

زانایانی جەعفەری ئەیاری ئەوەن داپیرە بەوجۆرە دابەش بکرێت بۆ خاوەن بەشی دیاریکراوو خزمی سکیی، بەڵکو دەڵێن: باپیرەو داپیرەکان لەپلەی دووەمی ریزبەندی میراتگراندان، داپیرە لەدایکەوە دەچێتە جێگای دایك، داپیرە لەلای باوکیشەوە دەچێتە جێگای باوك، لەکاتێکدا کەدایكو باوکەکە لەژیاندا نەبن، لەکاتی هاتنیان بەیەکەوە ئەوا بۆ باوکیەکە دوو لەسەر سێو دایکیەکە یەك لەسەر سێ، هەروەك هاتنی باوكو دایك وایە بەیەکەوە کە لقی میراتگریان لەگەڵدا نەهاتبێت[5].

---

[1] لە (نیل الاوطار (٦/٦٧) لە ژێر ناونیشانی (باب ماجاء في میراث الجدة والجد) هاتووە: لە عوبادەی کوڕی صامت دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) داوەری کرد لەمیراتی دوو داپیرەدا شەش یەکی بەشکرد لەنێوانیاندا. (عبدالله کوڕی احمد) لە (المسند)دا گێڕاویەتیەوە.

لە (بریدة) دەگێڕنەوە: (پێغەمبەر (ﷺ)) بۆ داپیرە شەش یەکی داناوە کەدایك نەهاتبێت لەگەڵی. (ابو داود) گێڕاویەتەوە.

لە (عبد الرحمن) کوڕی (زید) دەگێڕنەوە، دەڵێت: (پێغەمبەری خوا (ﷺ) سێ داپیرە شەش یەکی پێدان دووانیان لەلای باوکەوە بوون. ئەویتریشیان لەلای دایکەوە) (الدارقطني) بەمجۆرە بە (مرسل) گێڕاویەتیەوە.

[2] دایکی باوكو بەرەوسەرتر.

[3] دایکی دایكو بەرەوسەرتر.

[4] وەك دایکی دایکی دایك ئەمیش هەروەك دایکی باوکی باوك وایە، هەروەها ئەگەر کوڕێك کچە مامەکەی خواست و منداڵێکیان بوو ئەوا دایکی دایکی دایکی ئەم منداڵە بەهەمان شێوە دایکی باوکی منداڵەکەیە، داپیرەیە لەهەردوو سەرەوە خزمە.

[5] دایکی دایكو بەرەوسەرتر.

**هێزی خزمایەتی داپیرە:**

داپیرە ئیدی دایکیی بێت یان باوکیی یان هەردوو خزمایەتیەکەی هەبێت بەمجۆرەی خوارەوە بەشبڕاو -حجب- دەکرێت:

١- دایك بەرەهایی دەبێتە بەشبڕی -حجب- داپیرە، ئیدی دایکیی بێت یان باوکی یان هەردوو خزمایەتیەکەی هەبێت.

٢- باوك دەبێتە بەشبڕی -حجب- داپیرەی باوکییو نابێتە بەشبڕی -حجب- داپیرەی دایکیی لەبەر ئەوەی بەهۆی ئەوەوە رەچەڵەکی ناگاتەوە بە کۆچکردووەکە بەپێچەوانەی جەعفەریەکانەوە [1].

٣- باپیرە دەبێتە بەشبڕی -حجب- هەموو داپیرەیەك کەبەهۆی ئەوەوە بگاتەوە بەکۆچکردووەکە.

٤- هەموو داپیرەیەکی نزیك دەبێتە بەشبڕی -حجب-داپیرەی دوور، لەسەری باوکەوە بن یان لەسەری دایکەوە بن، ئیدی نزیکەکە لەمیراتگران بێت یاخود بەهۆی میراتگرێکی ترەوە بەشبڕاو -حجب- کرابێت.

٥- هەموو داپیرەیەك لەخاوەن پشکە دیاریکراوەکان دەبێتە بەشبڕی -حجب- داپیرە لەخزمانی سکیی (لای زۆرینەی زانایان).

زانایانی جەعفەری وتویانە: داپیرە بەرەهایی لەپلەی دووەمەو دەبێتە بەشبڕی -حجب- هەموو ئەو میراتگرانەی لەپلەی سێیەمدا دێن، هەروەها وتویانە: داپیرە نزیکەکەیان دەبێتە هۆی بەشبڕانی -حجب- دوورەکەیان.

بەپێی هەمواری دووەمی یاسای باری کەسیی داپیرە بەهۆی کچەوە بەشبڕاو-حجب- دەکرێتو، بەهۆی کوڕەوە بەشبڕاو-حجب- ناکرێت، لەمادە (٢/٩١) هاتووە: (( لەکاتێکدا کەسە کۆچکردووەکە کوڕی نەبێت ئەوا

---

[1] لە (الخلاف)ی (طوسي)دا ٢/٥٥ هاتووە: ((دایکی دایك لەگەڵ دایکایەتیدا میراتی ناکەوێت، شافیعیش لەگەڵ زانایانی دیکەدا وتویەتی: شەش یەکی بۆ هەیە )).

کچ یان کچەکانی شایانی ئەوەن کە لە لێجیماوەکە دەمێنێتەوە پاش ئەوەی دایکو باوکو هاوسەرەکە پشکە دیاریکراوەکانی خۆیان لێی دەبەن، شایانی هەموو لێجێماوەکەن کاتێك کە هیچ لەوانەیان لەگەڵ نەیەت [1]))، بەپێی دەربڕینی ئەم بڕگەیە بێت کاتێ کەسێك کۆچی دوایی کردو لەپاش خۆی باپیرەو داپیرەو کچێکی لەپاش بەجێمابێت، ئەوا لێجێماوەکە بەپێی بەشی دیاریکراوو گەڕاوە (فرضاً ورداً)، هەمووی بۆ کچەکە دەبێت، بەڵام ئەگەر لەگەڵ کوڕیدا هاتن ئەوا هەریەکەیان شەش یەکی بەر دەکەوێتو ئەوەی مایەوە بۆ کوڕەکەیە بەبەڵگەی مادە (٩٠) [2]، بەمجۆرە یاسا دانەری عێراقی لەمیراتدا پێگەی کچی بەهێزتر کردووە لەپێگەی کوڕ، ئەمەش لەهیچ یاسایەکی جیهاندا نەوتراوە، لەکاتێکدا کەئەمە مەبەستی یاسا دانەر نەبووە بەڵکو هەڵە لەداڕشتنەوەیدا کراوەو ئەوەی هەستاوە بەئامادەکردنی ورد نەبووە، چونکە یاسا دانەر ویستویەتی هەموارکردنەکە بەمجۆرە بێت: (وتعتبر البنت بحکم الابن فی الحجب) واتە: (کچیش حوکمەکەی وەك کوڕ دەبێت لە بەشبڕ –حجب– کردندا).وەك فیقهی جەعفەری کردووە هەروەك لەداڕشتنەوەی بڕگەی چوارەمی مادە (٨٩)دا هاتووە: (تعتبر الأخت الشقیقە بحکم الاخ الشقیق فی الحجب).واتە: (خوشکی دایکو باوکی حوکمەکەی وەك برای دایکو باوکیە لە بەشبڕی –حجب–دا).

---

[1] مادە (٩٠): ((لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی خرایە ڕوو، مافەکانو پشکەکان بەپێی خزمایەتی بەسەر میراتگرەکاندا بەپێی ئەو بنەما شەرعیانە دابەش دەکرێت کە پێش دەرچوونی یاسای باری کەسیی ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ کاریان پێدەکرا.

[2] ئەم بڕگەی دووەمە بەپێی مادەی دووەمی یاسای ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٧٨ هەمواری دووەمی یاسای باری کەسیی ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ زیادکرا، واتە مەزهەبی ئەبو حەنیفە بەسەر سوننەکانو مەزهەبی ئیمامی بەسەر شیعەکاندا جێ بەجێ دەکرێت.

داوا لەیاسا دانەری عێراقی دەکەین چاو بەم بڕگەیەدا بخشێننەوە کە کەمو کورتی تێدایە.

**جێبەجێکردنەکانی:**

| | | |
|---|---|---|
| ١- **میراتگرەکان:** | دایپیره | برا ك |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ / ٦ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٥ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢- **میراتگرەکان:** | دایپیره (دایکی دایك) دایپیره(دایکی باوك) | برای باوکیی |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٥ |

بنچینەی بابەتەکە لە (٦)و بە (١٢) ڕاست دەکرێتەوەو بۆ هەر داپیرەیەك یەك بەش‌و ئەوەی مایەوە وەك خزمی پشت بۆ براکە

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | ژن | مام | (دایکی دایك) داپیره(دایکی باوك) لەفیقهی جەعفەریدا |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ب | م سێ یەك |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ |

## بەرکەوتەی باپیرە (استحقاق الجد):

هەروەك زۆرینەی زانایان داپیرەیان دابەش کردووە بۆ خاوەن پشکە دیاریکراوەکان‌وخزمی سکیی هەمان دابەشکردنیشیان بۆ باپیرەکان کردووە:

باپیرەی سکیی(الجد الرحمی): بریتیە لەو باپیرەی کە لەڕێی مێینەیەکەوە دەگاتەوە بە کۆچکردووەکە، وەك باوکی دایك‌و، باوکی دایکی باوك، ئەمیش لەخزمانی سکیی دادەنرێت‌و باسەکەی لەبەشی سێیەمدا دێت.

باپیرەی پشت (الجد العصبی): بریتیە لەو باپیرەی کەمێینەیەك ناکەوێتە نێوان ئەوو کەسە کۆچکردووەکە، وەك باوکی باوك‌و، باوکی باوکی باوك‌و

بەرەو سەرتریش.

ئەویش یان ئەوەتا لەگەڵ خوشكو برای كۆچكردووەكەدا دێت یان بێ ئەوان، بۆ هەر جۆرە هاتنێك چەند شێوازێكی هەیە:

**باپیرە بەبێ خوشك و برا،**

ئەگەر كۆچكردووەكە خوشكو برای نەبوو ئەوا باپیرەكە ئەم سێ حاڵەتەی هەیە[1]:

**حاڵەتی یەكەم: تەنها شەش یەكی میراتیەكەی بۆ هەیە، بەم دوو مەرجە:**

١- باوك نەمابێت. ٢-.لقێكی نێرینەی میراتگر هەبێت.

| **میراتگرەكان:** | باپیرە | كوڕ (یان كوڕی كوڕ) |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٥ |

**حاڵەتی دووەم: وەك خزمی پشت هەموو میراتیەكە یاخود ئەوەی ماوەتەوە بەری دەكەوێت، بەم دوو مەرجە:**

١- باوك نەمابێت. ٢- بە رەهایی لقێكی نێرینەی میراتگر نەبێت.

| **میراتگرەكان:** | ژن | باپیرە |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ٣ |

| **میراتگرەكان:** | مێرد | باپیرە |
|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٢/١ | م |
| پشكەكان: | ١ | ١ |

---

[1] بەڵگەش لەسەر سەلماندنی ئەم حاڵەتانە بۆ باپیرە لەكاتی نەمانی باوكدا ئەوەیە كە باپیرە لەزۆر ئایەتی قورئانی پیرۆزدا بەباوك ناوبراوە، لەوانە: ((كما أخرج ابويكم من الجنة)) سورة الاعراف / ٢٦.

**حاڵەتی سێیەم:** شەش یەکی وەك بەشی دیاریکراو بەردەکەوێت، ئەوەشی مایەوە وەك خزمی پشت بەردەکەوێت، بەم دوو مەرجە:

١- باوك نەمابێت.

٢- تەنها لقێکی میراتگری مێینەی هەبێت (واتە نێرینە نەبێت).

| میراتگرەکان: | کچی کوڕ | باپیرە |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ وەك بەشی دیاریکراو+م |
| پشکەکان: | ٣ | ٢+١ وەك خزمی پشت |

**باپیرە لەفیقهی جەعفەریدا کاتێك کەبراو خوشکی لەگەڵ نەهاتبێت:**

ئەم مەزهەبە بۆ ئەوە نەچووە باپیرە بکات بەدوو بەشەوە خاوەن بەشی دیاریکراوو خزمی سکیی، بەڵکو بەرەهایی لەپلەی دووەمدا دایناون، ئیدی لەسەری باوکەوە بێت یان سەری دایك، باپیرە لەسەری دایکەوە جێگەی دایك دەگرێتەوەو، باپیرە لەسەری باوکەوە جێگەی باوك دەگرێتەوە، خۆ ئەگەر بەیەکەوە هاتن ئەوا سامانەکە هەمووی، یان ئەوەی ماوەتەوە دەکرێتە سێ بەش: سێ یەکی بۆ ئەوەیانە کەلەسەری دایکەوەیە، دوو لەسەر سێش بۆ ئەوەیان کەلەسەری باوکەوەیە [1].

| میراتگرەکان: | باپیرە (باوکی باوك) | باپیرە(باوکی دایك) |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٣/١ |
| پشکەکان: | ٢ هەموویان سێ یەك | ١ |

| میراتگرەکان: | ژن | باپیرە (باوکی دایك) | باپیرە (باوکی باوك) |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م بەسێ یەك | |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ |

[1] ایضاح الفوائد ٢١٩/٤ لاپەڕەکانی دواتر.

**باپیره لەگەڵ خوشک و برادا بێت[١]:**

دوو حاڵەتی هەیە، هەرحاڵەتێکیان چەند جۆرێکە:

**حاڵەتی یەکەم:** کاتێك لەگەڵ باپیرەو خوشكو برادا خاوەن بەشی دیاریکراوی تر نەبوو، باپیرە سەرپشك دەکرێت لەنێوان سێ یەکی میراتیەکەو، بەشکردنی لەگەڵ خوشكو براکاندا، پاش ئەوەی بەبرای دایكو باوکی دانرا لەگەڵ برا دایكو باوکیو خوشکە دایكو باوکیەکاندا، هەروەها بەبرای باوکی دادەنرێت لەگەڵ ئەو خوشكو برایانەدا کەلەباکەوەن، هەر بۆیە لەسێ یەك زیاتری بەر دەکەوێتو بەشکردن لەنێوانیاندا لەم حاڵەتەدایە.

پێودانگەکانی زانینی زیادەکراو:

أ- دابەشکران بەزیاتر (المقاسمة أکثر): ئەگەر ئەوانەی لەگەڵیدا هاتن لەخوشكو براکان زیاتر بوون لێی، هەروەك لەم پێنج شێوەیەدا هاتووە:

١- باپیرەو، خوشك[٢].

٢- باپیرەو، دووخوشك[٣].

٣-باپیرەو، سێ خوشك[٤].

٤- باپیرەوبرا[٥].

٥-باپیرەو، براو، خوشك[٦].

ب- سێ یەكو بەشکردنی بەیەکسانی: ئەگەر ژمارەی ئەوان زیاتر بوو لەباپیرە، وەك لەم سێ شێوەیەدا:

١- باپیرەو، دوو برا[١].

---

[١] مەبەست لەخوشكو براکان لای زۆرینەی زانایان براو خوشك لەدایکەوە ناگرێتەوە چونکە ئەوان بەهۆی باپیرەوە بەشبڕاو-حجب- دەکرێن بەپێچەوانەی فیقهی جەعفەریەوە.

[٢] سامانەکە لەنێوانیاندا دەکرێتە سێ بەشو بەپێی بنەمای ((للذکر مثل حظ الأنثیین)) دابەش دەکرێت.

[٣] میراتیەکە دەکرێتە چوار بەش باپیرە دووبەشو هەر خوشکێکیش یەك بەشی بەردەکەوێت.

[٤] میراتیەکە دەکرێتە پێنج بەش باپیرە دووبەشو هەر خوشکێکیش یەك بەشی بەردەکەوێت.

[٥] میراتیەکە وەك یەك لەنێوانیاندا دابش دەکرێت، هەریەکەیان نیوەی بەردەکەوێت.

[٦] میراتیەکە لەنێوانیاندا دەکرێتە پێنج بەش، باپیرە دووبەش، برا دوو بەش، خوشکەکەش یەك بەش.

٢- باپیرەو، برایەكو، دووخوشك[٢]
٣- باپیرەو، چوار خوشك[٣].

ت- سیٚ یەك زیاتر: ئەگەر ژمارەی براو خوشكەكان دوو ئەوەندی باپیرە بوو، ئەوەی دەكەویٚتە ژیٚر ئەم پیٚودانگە شیٚوەكانی وەك یەك نیە، بۆ نمونە: باپیرە لەگەلٚ سیٚ برا، یان لەگەلٚ پیٚنج برا، یان لەگەلٚ دوو براو خوشكیٚكو، بەوجۆرە.

ئەوەی دەكەویٚتە ژیٚر ئەم پیٚو دانگە لەم پارچە شیعرەدا باس كراوە:

الجد مع[٤] فرع أب أو ولد　　لأبوين فائز بالأزيد[٥]
من ثلث والقسم[٦] عند فقد　　صاحب فرض كأخ وجد
كلاهما[٧] من ضعف جد شرع[٨]　　ودون مثليه الأخير[٩] أنفع
ومع فوق ضعفه فأكثـــر　　ثلث وما صوره منحصر[١٠]

واتە:

باپیرە لەگەلٚ لق باوك بیٚ یان كوڕی... دایكو باوكی زیادەكەی دەكەویٚت

---

١ میراتیەكە لەنیٚوانیاندا دەكریٚتە سیٚ بەش هەریەكەیان بەشیٚكی بەردەكەویٚت.
٢ میراتیەكە دەكریٚتە شەش بەش باپیرە دوویەشو براكە دوویەشو، هەر خوشكیٚكیش یەك بەشی بەردەكەویٚت.
٣ میراتیەكە دەكریٚتە شەش بەش، باپیرە دوویەشو ، هەر خوشكیٚكیش یەك بەشی بەردەكەویٚت.
٤ پیتی (عین) (سكون)ی لەسەر دەبیٚت بۆ ڕاگرتنی كیٚشو سەرواى شیعرەكە.
٥ زۆرترەكە.
٦ پیتی (قاف) (فتحە)ی لەسەر دەبیٚت واتە بەش یان بەشكردن( القسمة أو المقاسمة).
٧ سیٚیەكو بەشكردن.
٨ پیتی (شین) و(راء) (فتحە)یان لەسەر دەبیٚت واتە وەك یەك ( سواء)
٩. واتە دابەشكردن.
١٠. بڕوانە: (كشف الغوامض لقطر العارض) شیخ معروف النودهي ل٦٩-٧٠.

لە سێ یەكو دابەشكردن كاتێ نەبێ خاوەنی بەشی دیاریكراو وەك براو باپیرە

هەردووكیان دوو ئەوەندی باپیرەبن وەك ئەوانەی دواتر بەشكردن باشە لەگەڵ زیاتر لەخۆی و زیاتریش سێ یەك ئەوەی نمونەكانی روونە

**شێوەی دووەم:** كاتێك لەگەڵ باپیرەو براو خوشكەكاندا خاوەن بەشێكی دیاریكراو هەبێت، لێرەدا باپیرە سەرپشك دەكرێت لەنێوان بەشكران لەنێوانیانو، شەش یەكو، ئەو سێ یەكەی كە پاش بەشی خاوەن پشكە دیاریكراوەكە دەمێنێتەوە.

زانایانی شەریعەت بۆ ئەو كەلێنانەی لەم حاڵەتانەدا هەیە پێوەری روونیان دانەناوە، بەڵكو پاش ئەوی لێجێماوەكە بەشێوەیەكی تیۆری دابەش دەكرێت لەنێوان ئەوسێ پێشنیاركراوەی باسمان كرد دەزانرێت كامەیان زیادەكەیە.

**أ– شەش یەك باشترە:**

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| **میراتگرەكان:** | میرد | كچی كوڕ | باپیرە | برا ك | بنچینەی بابەتەكە [1](١٢) |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | ٢/١ | ٦/١ | م | (بچوكترین ژمارەی هاوبەش) |
| پشكەكان: | ٣ | ٦ | ٢ | ١ | |

**ب– دابەشكرانی لەنێوانیاندا باشترە:**

| | | |
|---|---|---|
| **میراتگرەكان:** | ژن | باپیرە خوشك ك |
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م (بۆ نێر دووهێندەی مێینە)[1] |

[1] ئەگەر باپیرە سێ یەكی ئەوەی ماوەتەوە پێماندا پاش پێدانی بەشی خاوەن پشكە دیاریكراوەكان (ژنەكەیو كچی كوڕی) ئەوا لەسێ بەش بەشێكی بەردەكەوێت، ئەگەر بەشی خۆی بەبەشكردن برد ئەوا بەشێكو نیوی بەردەكەوێت، كەوابوو شەش یەكەكە باشترە لەدابەشكرانو سێ یەكی ئەوەی مایەوە.

ج- سێ یەکی ئەوەی مایەوە باشترە:

| **میراتگرەکان:** | داپیرە | باپیرە | (١٠) برا | بنچینەیبابەتەکە (٦)م[٢] |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/١ماوە | م | راست دەکرێتەوە بە(١٨) |
| پشکەکان: | ٣ | ٥ | ١٠ | |

**باپیرە کاتێ لەگەڵ خوشک و برادا بێت لەفیقهی جەعفەریدا:**

باپیرەو داپیرەو براو خوشکەکانو منداڵەکانی بەکوڕ کچەوە لەپلەی دووەمدان، لەبەر ئەوە نە باپیرە دەبێتە هۆی بەشبڕانی -حجب- ئەوان، نەئەوان دەتوانن باپیرە بەشبڕاو -حجب- بکەن، بەڵکو لێجێماوەکە لەنێوانیاندا بەش دەکەن، ئەگەر میراتگرێك نەبوو لەپلەی یەکەم، بەم شێوەیە:

١- ئەگەر باپیرەو داپیرە بەیەکەوە یان یەکێکیان لەگەڵ براو خوشك لەدایکەوە هاتن ئەوا هەموویان وەك خوشكو برا لەدایکەوە دادەنرێنو هاوبەشن لەسێ یەکدا، خۆ ئەگەر میراتگرێکی دیکەیان لەگەڵدا نەهاتبوو ئەوا لێجێماوەکە بەیەکسانی بەسەریاندا دابەش دەکرێت، وەك بەشی دیاریکراوو گەڕاوە (فرضا وردا).

٢- ئەگەر باپیرەو داپیرە یان یەکێکیان لەسەری باوکەوە لەگەڵ برا یان خوشك لەدایكو باوکەوە یان لەسەری باوکەوە هات، لێرەدا باپیرە وەك برا وا دەبێت، داپیرەش وەك خوشك دادەنرێت، لێجێماوەکەش هەمووی یان ئەوەی دەمێنێتەوە لەنێوانیاندا بەپێی بنەمای بۆ نێرینە هێندەی دوو مێینە دابەش دەکرێت [٣].

---

[١] ئەوەی دەمێنێتەوە پاش بەشی ژنەکەی بەسەر باپیرەو خوشکە دایكو باوکیەکەدا دابەش دەکرێت پاش ئەوەی باپیرەکە وەك برای باوكو دایکی دانراو دابەشکردنەکەش بۆ نێر دوو هێندەی مێینە دەبێت.

[٢] بنچینەی بابەتەکە (٦) دووهێندەی سادە، ئەم ژمارەیەش سێ یەکی ماوەی راستی نیە، لەبەر ئەوە لەجێگەی ماوەکە لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت (٣×٦)=١٨. ماوەکە (١٥) وسێ یەکی (٥)، بۆ باپیرە دەبێتو ئەوەی مایەوە بۆ هەر برایەك یەك بەش.

[٣] (الکافي)ی کلیني ١١١/٧.

٣-ئەگەر برا جیاوازەکان (لەسەری دایكو باوكو لەسەری باوکەوەو لەسەری دایکەوە) لەگەڵ باپیرە جیایەکاندا (لەسەری باوکەوەو لەسەری دایکەوە) هاتن، ئەوا ئەو براو باپیرانەی کەلەسەری دایکەوەن سێ یەکیان بەردەکەوێت وەك یەك بەیەکسانی بەشی دەکەن، ئەوەشی مایەوە بۆ ئەو براو خوشکانەی کەلەسەری دایكو باوکەوەن، ئەو باپیرەو داپیرانەشی کەلەسەری باوکەوەن (بۆ نێرینە هێندەی دوو مێینە) دەبێتو، ئەو براو خوشکانەشی کەلەسەری باوکەوەن بەشبڕاو-حجب- دەبن[1].

٤- ئەگەر باپیرە یان داپیرە یاخود هەردووکیان لەسەری باوکەوە لەگەڵ برا یان خوشك یان هەردووکیان لەسەری دایکەوە هاتن ئەوا:

أ- بۆ یەك برا یان یەك خوشك لەسەری دایکەوە شەش یەکی لێجێماوەکە هەیەو ئەوەی مایەوە بۆ باپیرەو داپیرەکە دەبێت[2].

ب-بۆ زیاتر لەیەك برا یان خوشك لەسەری دایکەوە سێ یەك هەیەو ئەوەی مایەوە بۆ باپیرەو داپیرە دەبێت.

٥- ئەگەر ژنو مێرد یەکێکیان لەگەڵ باپیرەو داپیرەو براو خوشکدا هاتن، پشکە زۆرەکەی خۆی دەباتو ئەوەی مایەوە بەپێی ئەو شیکردنەوەی خستمانە روو بۆ ئەوان دەبێت.

---

[1] ایضاح الفوائد ٤/٢٢٠، اللمعة الدمشقیة وشرحها الروضة البهیة ٢/٢١٧.

[2] لە: (الكافي)ی کلیني الرازي (١١١/٧): "لە ئیبن سینانەوە وتویەتی: پرسیار کرا لە باوکی عەبدولا (ﷺ) : دەربارەی پیاوێك کەبرایەکی لەسەری دایکەوە لەپاش لێجێماوەو هیچ میراتگرێکی تری نیە، وتی: سامانەکە بۆ ئەو دەبێت، وتم: ئەی ئەگەر لەگەڵ ئەو برایەی لەسەری دایکەوەیە باپیرەیەك هەبوو؟ وتی: شەش یەك دەدرێتە ئەو برایەی لەسەری دایکەوەیەو ئەوەی مایەوە دەدرێتە باپیرەکە، وتم: ئەی ئەگەر برایەك هەبوو لەسەری باوکەوە لەگەڵ باپیرە؟ وتی: سامانەکە لەنێوانیاندا وەك یەك دابەش دەکرێت.

**جێبەجێکردنەکانی:**

**١- میراتگرەکان:**

باپیرە(باوکی دایك)، داپیرە(دایکی دایك)،

| بنچینەی بابەتەکە (٣)یە | برای ك | برا لەسەری دایکەوە | |
|---|---|---|---|
| راستدەکرێتەوە بە (٩)[1] | م | ٣/١ بەیەکسانی | پشکە دیاریکراوەکان: |
| | ٢ | ١ | پشکەکان: |
| | ٦ | ٣ | پاش راستکردنەوە: |

**٢- میراتگرەکان:**

باپیرە(باوکی باوك) داپیرە(دایکی باوك) برای ك خوشکی ك

بنچینەی بابەتەکە (٦)یە، پاش ئەوەی هەر نێرینەیەك بەدووان دادەنرێت، بۆ هەر نێرینەیەك دوو بەش، هەر مێینەیەکیش یەك بەش.

پشکە دیاریکراوەکان: هەموو لێجێماوەکە (بۆ نێرینە هێندەی دوو مێینە).

**٣- میراتگرەکان:** برا لەسەری دایکەوە برا ك باپیرە، برا لەسەری باوکەوە

بنچینەی بابەتەکە (٣)یە

باپیرە (باوکی دایك) باوکی باوك یان خوشك لەسەری باوکەوە

راستدەکرێتەوە بە (٦)

| | | | |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/١ | م | ب |
| پشکەکان: | ١ | ٢ | هیچ |
| پاش راستکردنەوە: | ٢ | ٤ | هیچ |

**٤- میراتگرەکان:** برا لەسەری دایکەوە باپیرە (باوکی باوك)

| | | |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٥ |

---

[1] ژمارەی ئەوانەیان کە سێیەکیان بۆ هەیە لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت (٣×٣)= ٩.

٥–**میراتگرەکان:** (٢) برا لەسەری دایکەوە باپیرە (باوکی باوك)

بنچینە بابەتەکە(٣)

| | | | |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/١ | م | راست دەکرێتەوە بە(٦) |
| پشکەکان: | ١ | ٢ | |
| پاش راستکردنەوە: | ٢ | ٤ | |

٦– **میراتگرەکان:** ژن، برا لەسەری باوکەوە، باپیرە(باوکی باوك) برای ك

بنچینەی بابەتەکە لە (٦)ە

| | | | |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ | م بەیەکسانی |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | ٢ |

**باپیرە لەگەڵ منالی براو خوشك لەفیقهی جەعفەریدا:**

زانایانی جەعفەری وای دەبینن کە برازاو خوشکەزاکان ئیدی نێربن یان مێ جیاوازی نیە، لەجێگەی باوکەکانو دایکەکانیاندان، لەجێگەی برا کوڕو کچەکانی دەبن، لەجێگەی خوشکیش کوڕو کچەکانی دەبن، ئیدی ئەو خوشكو برایانە لەهەردوو سەری دایكو باوکەوە بن یان تەنها لەسەری باوکەوە یاخود لەسەری دایکەوە.

لەبەر رۆشنایی ئەمەدا ئەگەر باپیرەکان لەگەڵ خوشكو براکاندا هاتن، ئەوا هەر بەوجۆرەی کەپێشتر لێی دواین هەروەك بەشکردنی نێوان خوشكو برا دابەشی دەکەن[1].

---

[1] لە (الکافی)ی (کلینی) (١١٣/٧): "لەباوکی عەبدوڵاوە(ﷺ) وتویەتی: کە عەلی (ﷺ) میراتی باوکی دەدایە برازا کاتێ کەلەگەڵ باپیرەدا دەهات. لەباوکی عەبدوڵاوە لەبارەی کچی خوشكو باپیرەوە وتویەتی: بۆ ←

**میراتگرەکان:**

| کوڕی برایەك کە لەسەری دایکەوەیە. | کوڕی برای ك. باوکی دایك. | کوڕی برا یان کوڕی خوشکێك. باوکی باوك. | کەلەسەری باوکەوەیە |
|---|---|---|---|
| ٣/١ | م | ب | |
| ٢ | ٤ | هیچ | |

بنچینەی بابەتەکە (٣)یەو ڕاست دەکرێتەوە بە (٦)

| **میراتگرەکان:** | کوڕی برایەك کەلەسەری دایکەوەیە | باپیرە (باوکی باوك) |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٥ |

---

کچەکانی خوشکەکە سێ یەکی ئەوەی مایەوە بۆ باپیرە (واتە ئەگەر باپیرەکە لەسەری باوکەوە بوو خوشکەکەش لەدایكو باوکەوە بوو یان تەنها لەسەری باوکەوە) کچەکانی خوشکەکە دەچنە جێگەی خوشکەکەو باپیرەکەش خراوەتە جێی برا ".

# باسی دووەم
# خزمانی پشت و چۆنیەتی میراتگرییان
## (العصبات وكيفية توريثهم)

خزمانی پشت (العصبات): بریتیە لەو خزمانەی کەسە کۆچکردووەکە کەباسکران، لەگەڵ ئەو مێینانەی کەلەجێگەی ئەوان دادەنرێن، لەزمانی عەرەبیدا (العصبە) کۆی (عاصب)ە، هەروەك وشەی (ظلمة) كە كۆی (ظالم)ە، بەڵام بۆ تاك (مفرد)و، دووان (المثنى)و، كۆ (الجمع)و، نێرو مێ بەكاردەهێنرێت [1].

خزمانی پشت سێ جۆریان هەیە: خۆی خزمی پشتە، بەهۆی كەسی دیكەوە خزمی پشتە، لەگەڵ كەسی دیكەدا خزمی پشتە.

### أ- خۆی خزمی پشتە:

بریتیە لەو نێرینەیەی كە تەنها لەرێگەی مێینەوە خزمایەتیەكەی ناگاتەوە بەكەسە كۆچكردووەكە، بەڵكو لەرێگەی باوكو دایك، یاخود تەنها بەهۆی نێرینەوە دەگاتەوە بەكۆچكردووەكە، وەك كوڕی كوڕو، برا لەسەری باوكەوە.

ئەوانەی خۆیان خزمی پشتن چوار پێڕن، لەمیرات بردندا هەندێكیان پێش ئەوانی دیكەیان دەكەون، بەمجۆرە:

١- كوڕێتی (البنوة): كوڕەكانی كەسە كۆچكردووەكە دەگرێتەوە، لەگەڵ كوڕی منداڵەكانیو بەرەو خوار.

---

[1] خزمانی پیاو لەباوكیەوە بە پشت ناونراوە لەبەر ئەوەی لەدەوریی ودەیپارێزنو سەری دەخەن، وەك لەزمانی عەرەبیدا وتراوە: (عصب القوم بالرجل) واتە: لەدەووری بوون بۆ شەڕكردنو پاراستنی.

٢- باوکێتی (الأبوة): ئەمەش باوکی کۆچکردووەکە دەگرێتەوە، لەگەڵ باپیرەی پشتی و بەرەوسەرتریش.

٣- برایەتی (الإخوة): بریتیە لەبراکانی کەسە کۆچکردووەکە لەسەری دایکو باوکەوەبن یان تەنها لەسەری باوکەوە، لەگەڵ کوڕەکانیانو بەرەوخوارتریش.

٤- مامەیەتی (العمومة): مامەکانی کەسە کۆچکردووەکەو، مامەکانی باوکیو، مامەکانی باپیرەی پشتیو دەگرێتەوە، ئیدی ئەمانە لەهەردوو سەری باوکو دایکەوە بن یان تەنها لەسەری باوکەوەبن، هەروەها کوڕەکانی ئەوانەو کوڕی کوڕەکانیانو بەروخوارتریش دەگرێتەوە.

**حوکمی ئەوانەی خۆیان خزمانی پشتن لەمیرات وەرگرتندا:**

شایستەی هەموو لێجێماوەکەن ئەگەر کەسێکیان لەگەڵدا نەهاتبوو کەخاوەن پشکی دیاریکراو بێت، خۆ ئەگەر خاوەن پشکی دیاریکراویان لەگەڵدا هات ئەوا ئەوەی مایەوە [1] پاش پێدانی خاوەن پشکە دیاریکراوەکە پێیان دەدرێت، هەندێ جاریش هیچ نامێنێتەوەو بە نغرۆبوون بەشبڕاو -حجب- دەکرێن.

ئەگەر کەسێك مردو لەپاش خۆی تەنها کوڕێك یان تەنها برایەکی باوکو دایکی یاخود مامەیەکی کەتەنها لەسەری باوکەوە بوو لەپاش بەجێما ئەوا هەموو میراتەکەی بەر دەکەوێت، بەڵام ئەگەر پیاوێك مردوو پاش خۆی دایكو کوڕێکی لەپاش بەجێما، ئەوا پاش ئەوەی دایکەکە پشکی دیاریکراوی خۆی پێدرا ئەوەی مایەوە بۆ کوڕەکەی

[1] لە (فتح الباري (١٤/١٥)) دا هاتووە: زانایانی شەریعەت کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەوەی مایەوە پاش بەشی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان دەدرێتە خزمانی پشت، هەروەها لەمبارەیەوە تێیدا هاتووە ١٥/١١-١٢: "پشکە دیاریکراوەکان بدەنە خاوەنەکانیو ئەوەی مایەوە بۆ پیاوێ لەپێشترە" مەبەست نزیکترین خزمی نێرینەیە.

دەبێت، ئەگەر پیاوێك مردو پاش خۆی ژنەکەی و برایەکی لەپاش بەجێما، ئـەوا براکـە پاش ئەوەی ژنەکە بەشی خۆی دەبات ئەوەی مایەوە بۆ ئەو دەبێت وبەوجۆرە...

ئەگەر ئافرەتێك مرد مێردەکەی و خوشکێکی باوك و دایکی و برایەکی کـە لەسـەری باوکەوە بوو لەپاش خۆی بەجێما ئەوا براکە بەنغرۆ بوون بەشبڕاو -حجب- دەکرێت، چونکە مێردەکە نیوەی میراتیەکە دەبات و خوشکە دایك و باوکیەکـەش نیوەکـەی تـر دەبات.

## ب-بەهۆی کەسی ترەوە پشت بوون (العصبه بالغیر):

هەموو مێینەیەکی خاوەن پشکی دیاریکراو بۆ ئەوەی ببێتە خزمی پشت پێویستی بەکەسی ترە کەبەشدار دەبێت لەگەڵی لەپشتبوون و میراتدا، لێرەشدا بەخزمایەتی پشت میرات دەبات نەك وەك خاوەن پشکی دیاریکراو، خزمایەتی پشتیش بەهۆی کەسانی ترەوە ئەم چوار پێڕە دەگرێتەوە:

١-کچی پشتی (البنت الصلبیه): ئەگەر لەگەڵ برای پشتدا هات.

٢-کچی کوڕو بەرەوخوارتریش: ئەگەر لەگەڵ کوڕو بەرەخوارتردا هات.

٣-خوشکی باوك و دایکی: ئەگەر لەگەڵ برای دایك و باوکی یان باپیرەدا هات.

٤-خوشك لەسەری باوکەوە: ئەگەر لەگەڵ برا لەسەری باوکەوەدا هات.

### حوکمی خزمی پشت بوون بەهۆی کەسی دیکەوە

نیوەی ئەو کەسە وەردەگرێت کەبۆتە هۆی بەخزمی پشـتبوونی ئـەم، جـا ئەگـەر یەکێك مردو پاش خـۆی کوڕێـك و کچـێك کـەخۆی خزمـی پشـت بـوو، لەگـەڵ کچـێك کەبەکەسێکی تر بوو بووە خزمی پشت هات، ئەوا سامانەکە لەنێوانیاندا دەکرێتە سێ بەش، دوو لەسەر سێی بۆ کوڕەکەیە، یەك لەسـەر سـێ یەکـەی دیکـەش بـۆ کچـەکە دەبێت بەپێی بنەمای (للذکر مثل حظ الأنثیین).

**بەخزمی پشتبوون لەگەڵ کەسی دیکەدا (العصبە مع الغیر):**

بریتیە لەهەر مێینەیەك بۆ بەئەندامبوونی پێویستی بەکەسێکی دیکە هەبێت، بەڵام ئەو کەسەی دیکە لەگەڵ خزمی پشتبوونەکە لەگەڵی بەشدار نابێت، ئەمەش تەنها لەدوو پێڕدا هەیە:

١. خوشکی باوكو دایکی کەسە کۆچکردووەکە: ئەگەر لەگەڵ کچی کۆچکردووەکە یان کچی کوڕیدا هات.

٢. خوشکی کەسە کۆچکردووەکە لەسەری باوکەوە: ئەگەر لەگەڵ کچی کەسە کۆچکردووەکە یان کچی کوڕیدا هات.

**حوکمی خزمی پشتبوون لەگەڵ کەسی دیکەدا:**

پاش پێدانی بەشی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان ئەوەی مایەوە پێی دەدرێت، ئەگەر هیچ نەمایەوە ئەوا بەهۆی نغرۆ بوونەوە بەشبڕاو دەکرێت لەمیرات وەرگرتن، کەسێك مردو پاش خۆی کچی کوڕێکیو خوشکێکی دایكو باوکیو ژنەکەی لەپاش بەجێما، لێرەدا کچی کوڕەکەی نیوەی میراتیەکە دەبات، هەشت یەکیش بۆ ژنەکەیە، ئەوەی مایەوە بەهۆی خزمی پشتبوون لەگەڵ کەسی دیکەدا دەدرێتە خوشکەکەی.

**فیقهی جەعفەریو یاسا:**

لەفیقهی جەعفەریدا هیچ کام لەو دووجۆرەی خزمی پشتبوون لەگەڵ کەسی دیکەدا بوونی نیە، چونکە براو خوشك لەپلەی دووەمن، کچو کچی کوڕ لەپلەی یەکەمن، ئەگەر کەسێك لەپلەی یەکەم هەبوو نێر بێت یان مێ ئەوا کەس لەوانەی پلەی دووەم میراتیان پێ نادرێت.

بەڵام لەیاسادا لە مادەی (٢/٩١)ی هەموار کراو لەیاسای باری کەسیی دا هاتووە بەهۆی کچەوە هەموو میراتگرەکان بەشبڕاو-حجب- دەکرێن تەنها ئەم پێنجە نەبێت: (دایكو باوك، ژنو مێرد، کوڕی کەسە کۆچکردووەکە).

سەرەڕای ئەوە زانایانی فیقهی جەعفەری (ئیمامی) دان بەو دابەشکردنە سێیەدا نانێن کەزۆرینەی زانایان کردوویانە (واتە خاوەن پشکی دیاریکراوو، خزمانی پشتو، خزمانی سکیی)، بەڵکو لای ئەوان دابەش کراون بۆ سێ پلە [1]:

پلەی یەکەم: دایكو باوکی ڕاستەوخۆو، منداڵو منداڵی منداڵ ئیدی نێر بن یان مێ یان جیاواز.

پلەی دووەم: باپیرەکانو داپیرەکانو براکانو خوشکەکانو منداڵەکانیان نێر بێت یان مێ.

پلەی سێیەم: مامەکانو پورەکان (خوشکی باوك)و خاڵەکانو پورەکان (خوشکی دایك)و منداڵی ئەوانە نێر بێت یان مێ.

بەم پێشەکیە چۆنیەتی میرات بەرکەوتن بەخزمایەتی پشتی ئەو چوار پێڕە دەکەینە چوار دەروازە:

---

[1] طوسي لە کتێبی (الخلاف في الفقه ٢/٥٥)دا دەڵێت: "پەسەندکردنی خزمی پشت بەتاڵە لای ئێمەو بەو هۆیەوە میراتی بەرناکەوێت لەهیچ شوێنێك لەشوێنەکاندا، بەڵکو بەپشکی دیاریکراو یاخود خزمایەتی یان بوونی ئەو هۆکارانەی کە هاوسەرێتیو وەلائەوە میرات دەبرێت، ئەمەشیان لەئیبن عەباسیان گێڕاوەتەوە: چونکە ئەو وتویەتی دەربارەی ئەو کەسەی مردو پاش خۆی کچێكو خوشکێك بەجێما ئەوا هەموو سامانەکەی بۆ کچەکەی دەبێتو خوشکەکە هیچی نادرێتێ، لەمەشدا جابری کوڕی عەبدوڵا هاوبۆچوونی بووە.

# دەروازەی یەکەم
# میراتگریتی بەهۆی کوڕیتیەوە
# (التوریث بالبنوة)

کـوڕێتی –وەك پێشـتر باسمـان کـرد– کـوڕی کەسـە کۆچـکردووەکەو کوڕەزاوبەروخوارتر دەگرێتەوە:

## چۆنیەتی میرات وەرگرتنی کوڕی کەسە کۆچکردووەکە:

کـوڕی کەسـە کۆچـکردووەکە چـەند شـێوەیەکی مـیرات وەرگرتنـی هەیـە، گرنگترینیان ئەمانەیە:

١- کاتێ بەتەنیا بێت: یـان ئـەوەتا هـەموو میراتیەکـەی بەردەکـەوێت یـان پـاش پێدانی بەشی خاوەن پشکی دیاریکراو ئەوەی مایەوە بۆ ئەم دەبێت.

| | | |
|---|---|---|
| أ- **میراتگرەکان:** | کوڕی برا | مام |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب |

| | | |
|---|---|---|
| ب- **میراتگرەکان:** | ژن | کوڕ |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٧ |

٢- کاتێ زیاتر لەیـەکێك بێـت: یـان ئـەوەتا هـەموو میراتیەکـەیان دەدرێتـێ یـان ئەوەی مایەوە پێیان دەدرێت‌وبەیەکسانی لەنێوانیاندا بەشی دەکەن.

| | | |
|---|---|---|
| أ- **میراتگرەکان:** | مێرد | (٣) کوڕ |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٣ بە هەریەکەیان بەشێك |

ب- میراتگرەکان: (٥) کوڕ براى باوكو دايكى. خوشكى باوكو دايكى [1]

پشكە دياريكراوەكان: هەمووى بەيەكسانى ب

پشكەكان: ٥ بۆ هەر كوڕێك يەك بەش هيچ

٣- كاتىٚ لەگەڵ كچى كەسە كۆچكردووەكەدا هات ئەوا هەموو ميراتيەكە يان ئەوەى دەمێنێتەوە بەپێى بنەماى (للـزكر مـِـل حـف الٓنـپـيـن) بەسەرياندا دابەش دەكرێت.

أ- میراتگرەکان: (٣) كوڕ، (٤) كچ بنچينەى بابەتەكە (١٠)يە

پشكە دياريكراوەكان: هەمووى پاش دانانى هەر كوڕێك بەدوو كچ

پشكەكان: ١٠ بۆ هەر كوڕێك دوو بەش هەر كچێكيش يەك بەش

ب- میراتگرەکان: مێرد كوڕ كچ

پشكە دياريكراوەكان: ٤/١ م

پشكەكان: ١ ٢ ١

ج- میراتگرەکان: ژن (٣) كوڕ كچ

پشكە دياريكراوەكان: ٨/١ م

پشكەكان: ١ بۆ هەر كوڕێك دوو بەش هەر كچێكيش يەك بەش

## هێزى خزمايەتى كوڕ:

أ- دەبێتە هۆى ميرات بەرنەكەوتنى هەموو ميراتگرەكان جگە لەم حەوتە: (دايكو باوك، ژنو مێرد، باپيرە، داپيرە، كچى كەسە كۆچكردووەكە).

لاى جەعفەريەكان تەنها نابێتە رێگرى لەم پێنجە: (دايكو باوك، ژنو مێرد، كچى كەسە كۆچكردووەكە).

---

[1] لەحاڵەتى بوونى خاوەن پشكى دياريكراودا بەشى خاوەن پشكى دياريكراو لەجێى بنچينەى بابەتەكە دەبێت، لەحاڵەتى نەبوونى خاوەن پشكى دياريكراودا ئەوا ژمارەيان دەبێتە بنچينەى بابەتەكە.

یاسای باری کەسێتیش لەمادە (٢/٩١)ی هەموارکراودا هەمان بۆچوونی جەعفەریەکانی لەخۆگرتووە.

ب- دەبێتە هۆی بێ بەشکردنی دایکو مێردو ژن لەوەی لە دوو جۆرە پشکەکە هەرەباشەکەیان بەر بکەوێت [1].

ج- هیچ میراتگرێکی تر ناتوانێت کوڕ لەمیراتی بەشبڕاو-حجب- بکات.

## چۆنیەتی میراتی کوڕی کوڕ:

چۆنیەتی میراتی کوڕی کوڕ بەهەمان شێوەی میراتی کوڕە کاتێ ئەو نەمابێت، ئەم جێگای دەگرێتەوە، واتە کوڕی کوڕ جێگای کوڕ دەگرێتەوە، هەرچی بۆ ئەو هەبێت بۆ ئەمیش هەیە تەنها لەم حاڵەتانەدا نەبێت:

١- ناتوانێت کچی کەسە کۆچکردووەکە بکات بە پشت بەڵکو لەفیقهی جەعفەریو یاسادا کچەکە دەبێتە هۆی بەشبڕانی لەوەی میرات بەم بگات، بەڵام لەفیقهی سونیدا ئەگەر یەکێك بوو یان زیاتر ئەوا پاش ئەوەی مایەوە پاش بەشی کچەکە پێی دەدرێت.

| **میراتگرەکان:** | کچ | کوڕی کوڕ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

| **میراتگرەکان:** | کچ | کوڕی کوڕ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ + م | ب (لەفیقهی جەعفەریو یاسادا) [2] |
| پشکەکان: | ١ وەك ب پشکی دیاریکراو<br>١ وەك گەڕاوە | هیچ |

---

[1] بۆ دایك(٣/١، ٦/١)هەیە، (٦/١)بەردەکەوێت ئەگەر لەگەڵ کوڕدا بێت، بۆمێرد (٢/١، ٤/١) هەیە، (٤/١) بەردەکەوێت ئەگەر لەگەڵ کوڕدا بێت، بۆ ژن(٤/١، ٨/١)هەیە، (٨/١) بەردەکەوێت ئەگەر لەگەڵ کوڕدا بێت.

[2] چونکە کچ لەریزبەندی یەکەمی پلەی یەکەمە، کوڕی کوڕیش لەریزبەندی دووەمی پلەی یەکەمە

٢- کچی مامەکەی دەکاتە پشت بەهەمان شێوەی بەپشتکردنی خوشکەکەی: کەسێك مردو پاش خۆی کوڕی کوڕەکەی و کچی کوڕێکی دیکەی لەپاش بەجێما ئەوا میراتەکە دەکرێتە سێ بەش بەپێی بنەمای (للذکر مثل حظ الأنثیین).[1] لەنێوانیاندا دابەش دەکرێت.

٣- لای زۆرینەی زانایان کوڕی کوڕی کوڕ دەبێتە هۆی ئەوەی کە کچی کوڕ ببێتە پشت لەکاتێکدا ئەو دوورترە لەمردووەکە لە کچی کوڕی مردووەکە.

**میراتگرەکان:** (٢) کچ. کچی کوڕ کوڕی کوڕی کوڕ بنچینەی بابەتەکە(٣)یەو بە(٩) راست دەکرێتەوە

| | | | |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٣م | (للذکر مثل حظ الأنثیین) |
| پشکەکان: | ٦ | | ١ + ٢ |

لەیاساو فیقهی جەعفەریدا ئەم حاڵەتە بوونی نیە، چونکە کوڕی کوڕی کوڕ بەهۆی کچو کچی کوڕەوە کەلەو نزیکترن بۆ کەسە مردووەکە بەشبڕاو -حجب- دەکرێن.

---

[1] **میراتگرەکان:**

| | مێرد | کوڕی کوڕ | کچی کوڕ |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٣/ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٢ | ١ |

# دەروازەی دووەم

# میراتگریتی بەهۆی باوکایەتیەوە

## (التوریث بالابوة)

پلەی باوکایەتی لەپاش پلەی کوڕێتی دێت، ئەگەر میراتگرێکی نێری لە کوڕێتی یەوە هەبوو ئەوا باوکایەتیەکە وەك پشت میراتی بەرناکەوێت، بەڵکو وەك پشکی دیاریکراو (ناولێنراو) [1] پێی دەدرێت کەئەویش شەش یەکی میراتیەکەیە، باوکایەتیش لای زۆرینەی زانایان باوكو باپیرەی پشت (باوکی باوكو بەرەوسەرتر) دەگرێتەوە، بەڵام باوکی دایكو باوکی دایکی باوك لەخزمانی سکییە، هەروەك پێشتر باسمان کرد ئەمجۆرە دابەشکردنە لەفیقهی جەعفەریدا نیە.

ئەوەی لەبارەی میرات وەرگرتنی باوكو باپیرەوە لێرەدا بوترێت هەموو دووبارە کردنەوەی ئەوەیە کەلەباسی یەکەمدا خستمانە روو، لەبەر ئەوە تەنها ئەو حوکمانە روون دەکەینەوە کەباوك تێیدا جیاوازە لەباپیرە.

### حوکمەکانی تایبەت بەباوك:

لەم حوکمانەدا باوك لەمیراتیدا جیاوازە لەگەڵ باپیرە:

١. باوك بەرەهایی دەبێتە هۆی بەشبڕان–حجب–ی براو خوشکەکانی کۆچکردووەکە بەپێچەوانەی باپیرەوە کە نابێتەهۆی بەشبڕانیان تەنها لای ئەبو

[1] لای زۆرینەی زانایان کچی کوڕ بەشبڕلو –حجب– دەکرێت لەمیرات ئەگەر دوو کچ یان زیاتر هەبوو، بەڵام ئەگەر کوڕی کوڕی کۆچکردووەکە هەبوو لەو بەشبڕانە رزگاری دەکاتو دەیگوڕێت بۆ پشت با کوڕی کوڕەکە لەرووی خزمایەتیەوە لەم دورتر بوو، زانایانی جەعفەری وشەی (التسمیە) (ناولێنان) بەکار دەهێنن لەبری (فرض) (پشکی دیاریکراو).

حەنیفە (رەحمەتی خوای لێ بێت)و ئەوانەی بۆچوونیان وەك ئەوە، لەفیقهی جەعفەریشدا بەرەهایی نابێتە بەشبڕیان چونکە هەموویان لەپلەی یەکەمدان، لەفیقهی سونیشدا –جگە لە فیقهی ئەبو حەنیفە– باپیرە تەنها دەبێتە بەشبڕی ئەو براو خوشکانەی کەلەسەری دایکەوەن.

٢. باوك دەبێتە هۆی گوێزرانەوەی میراتی دایك لە یەك لەسەر سێی میراتیەکەوە بۆ یەك لەسەر سێی ئەوەی دەمێنێتەوە پاش میرات وەرگرتنی ژن و مێرد، لەکاتێکدا کەباوك یەکێك لەژن و مێردەکەی لەگەڵ هاتبوو، بەومەرجەی لقێکی میراتگرو ژمارەیەك براو خوشکی لەگەڵ نەهاتبێت هەروەك لەباسی یەکەمدا باسمان کرد.

٣. بەڵام باپیرە بەکۆدەنگی هەموو بۆچوونەکان ئەم هێزەی نیە، بەڵکو لەگەڵیدا دایك سێ یەکی میراتی بەردەکەوێت لەو حاڵەتەی کەباسکرا.

٤. لەفیقهی جەعفەریدا ئەم جیاوازییەی نێوان باوك و باپیرە بوونی نیە، چونکە دایك سێ یەکی تەواو دەبات لەکاتێکدا ئەوان بڕیار لەسەر سێ یەکی ئەوەی مایەوە نادەن لەهیچ حاڵەتێکدا هەروەك پێشتر باسمان کرد.

٥. دایکی باوکی کۆچکردووەکە بەهۆی باوکەوە بەشبڕاو–حجب– دەکرێت لەمیرات وەرگرتن، بەڵام باپیرە ناتوانێت بەشبڕاوی بکات، چونکە دایکی باوکی کۆچکردووەکە ژنی باپیرەکەیەو داپیرەی کۆچکردووەکەشە، ئەویش لەهەمان پلەی نزیکیدایە لەگەڵ کۆچکردووەکە.

٦. لەفیقهی جەعفەریدا باوك بەهۆی منداڵەکانی کۆچکردووەکەو منداڵی منداڵەکانیاوە بەشبڕاو–حجب– ناکرێت، چونکە هەموویان لەپلەی یەکەمدان، بەڵام باپیرە بەهۆی ئەوانەوە بەشبڕاو–حجب– دەکرێت، چونکە ئەم لەپلەی دووەمەو ئەوان لەپلەی یەکەمن.

# دەروازەی سێیەم
# میراتگریتی بەهۆی برایەتی یەوە
## (التوريث بالإخوة)

أ-پلەی برایەتی پاش پلەی کوڕێتیە، هەر بۆیە هیچ برایەك -بەهەمان شێوە هیچ خوشکێك- لەکاتی هەبوونی لقێکی میراتگری نێرینەی کەسە کۆچکردووەکەدا میرات وەرناگرێت، ئیدی کوڕی بێت یان کوڕی کوڕیو بەرەوخوارتریش، بەڵام سەبارەت بەباپیرە بەرەهایی لەفقهی جەعفەریدا هەموویان لەیەك پلەی میرات وەرگرتندان، لای زۆرینەی زانایان تەنها براکانی سەری دایکی لێ دەردەکرێت، هەروەك لەبەشی یەکەمدا لێی دواین.

ب-برایەتی ئەمانە دەگرێتەوە:

١-برای دایكو باوکی کۆچکردووەکە.

٢-برای کۆچکردووەکە لەسەری باوکەوە.

٣-کوڕی برای دایكو باوکی کۆچکردووەکەو بەروخوارتریش.

٤-کوڕی برای کۆچکردووەکە لەسەری باوکەوەو بەرەوخوارتریش.

جا هەر پلەیەك بەو پلەی کەلەپێشیەوە دێت بەشبڕاو -حجب- دەکرێت.

میرات وەرگرتنی هەر میراتگرێك لەو پلەیانەدا بە پشت دەبێت، بۆیە ئەگەر بەتەنها هاتبوو و بەشبڕاو -حجب- نەکرابوو ئەوا هەموو میراتیەکە دەبات، ئەگەر خاوەن پشکی دیاریکراویشی لەگەڵدا بوو ئەوا پاش بەشی ئەوانە هەرچی مایەوە دەیبات.

| **میراتگرەکان:** | برا ك | برا لەسەری باوك |
| --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب |

**میراتگرەکان:** کوڕی برا ك | کوڕی برا لەسەری باوك

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی | ب

**میراتگرەکان:** ژن | برا ك، یان برا لەسەری باوك، یان کوڕی برای دایكو باوکی، یان کوڕی برا لەسەری باوکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ١ /٤ | م

پشکەکان: ١ | ٣

پ—برای دایكو باوکی دەبێتە هۆی ئەوەی خوشکە دایكو باوکیەکەی بگوڕێت بۆ پشتو بەمەش میراتیەکە هەمووی یان ئەوەی دەمێنێتەوە بەپێی بنەمای (بۆ نێرینە هێندەی دوو مێینە) لەنێوانیاندا دابەش دەکەن، ئەمە سەبارەت بە برا لەسەری باوکەوە ئەگەر لەگەڵ خوشك لەسەری باوکەوە هات ئەوا حوکمەکەی بەهەمان شێوەیە.

**میراتگرەکان:** ژن | برا ك | خوشك ك

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ | ٣ م (بۆ نێرینە هێندەی دوو مێینە)

پشکەکان: ١ | ٢ | ١

**میراتگرەکان:** برا لەسەری باوك | خوشك لەسەری باوك

پشکە دیاریکراوەکان: (للذکر مثل حظ الأنثیین)

بەڵام هەریەك لەکوڕی برای دایكو باوکیوکوڕی برا لەسەری باوکەوە ناتوانن خوشکەکەیان بکەنە پشت، چونکە کچی برا لەخزمانی سکیە لای زۆرینەی زانایان[1].

[1] لەفیقهی جەعفەریدا: کوڕانو کچانی برا هەموو میراتەکە یان ئەوەی دەمێنێتەوە لەنێوان خۆیاندا بەپێی (للذکر مثل حظ الانثیین)بەش دەکەن بەهەمان شێوەی خوشكو برا کاتێك بەیەکەوە بێن.

د- بـرا دايـكو باوكيـەكانو ئـەو برايانـەی لەسـەری باوكـەوەن لەوانيـە بـەهۆی نغرۆبوونەوە لەميرات بەشبڕاو-حجب- بكرێن:

| ميراتگرەكان: | مێرد | خوشك ك | برا لەسەری باوك |
| --- | --- | --- | --- |
| پشكە دياريكراوەكان: | ٢/١ | ٢/١ | ب بەنغرۆبوون[١] |
| پشكەكان: | ١ | ١ | هيچ |

| ميراتگرەكان: | دايك | (٢) كچی كوڕی | باپيرە | برا ك |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| پشكە دياريكراوەكان: | ٦/١ | ٣/٢ | ٦/١ | ب بەنغرۆبوون[٢] |
| پشكەكان: | ١ | ٤ | ١ | هيچ |

[١] لەفيقهی جەعفەریو ياسادا بەهۆی خوشكی دايكو باوكيەوە بەشبڕاو -حجب- دەبن.

[٢] لەفيقهی جەعفەريدا بەهەريەك لە دايكو كچی كوڕ بەشبڕاو دەكرێت چونكە لەپلـەی دووەمدايـە، بەهـەمان شێوە لەم بابەتەشدا باپيرە بەشبڕاو -حجب- دەكرێت لەبەر ئەوەی لەپلەی دووەمدايە ئەميش.

# دەروازەی چوارەم
# میراتگریتی بەهۆی مامەیەتی بوونەوە
## (التوريث بالعمومة)

أ- مامەبوون لە نێو خزمانی پشتدا لەپلەی كۆتاییدایە، هەر بۆیە ئەگەر میراتگرێكی دیكەی پشت هەبوو لەو سێ یەی پێشتر باسمان كرد ئەوا ئەمان میراتیان بەر ناكەوێت.

مامەیەتی ئەمانە دەگرێتەوە:

١- مامەی دایكو باوكی.

٢- مامە لەسەری باوكەوە.

٣- كوڕی مامەی دایكو باوكی.

٤- كوڕی مامە لەسەری باوكەوە.

هەموو پلەیەك لەمانە لەمیراتدا پلەی دوای خۆی بەشبڕاو -حجب- دەكات.

| **میراتگرەكان:** | ژن | مام ك | مام لەسەری باوكەوە |
|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٤/١ | م | ب |
| پشكەكان: | ١ | ٣ | هیچ |

| **میراتگرەكان:** | داپیرە | مام لەسەری باوكەوە | كوڕی مامەی دایكو باوكی یان لەسەری باوكەوە |
|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | م | ب |
| پشكەكان: | ١ | ٥ | هیچ |

ب- لای زۆرینەی زانایان بەم حوکمانە مامەیەتی جیا دەکرێتەوە:

١- هەموو نێرینەیەك لەریزی ئەمانەدا بێت خزمایەتیەکەی نابێتە هۆی ئەوەی ئەو مێینەی کەلەهەمان پلەیدایە بگۆڕێت بۆ میراتگر وەك پشت، چونکە لەخزمانی سکییە: بۆیە مامەی دایكو باوکی نابێتە هۆی ئەوەی پور(خوشکی باوك)ی دایكو باوکی ببێتە پشت، مام لەسەری باوکەوە نابێتە هۆی ئەوەی پور (خوشکی باوك) لەسەری باوکەوە ببێتە پشت و ئیتر بەوجۆرە [1].

٢- مام لەسەری دایکەوەو منداڵەکانی نێر بن یان مێ لەخزمانی سکییە، لەفیقهی جەعفەریشدا مامەکانو پورەکان (خوشکانی باوك) بەرەهایی لەپلەی سێیەمی میراتگراندان.

٣- لەوانەیە میراتگر بەهۆی خزمی پشت بوونەوە ببێتە هۆی بەشبڕان- حجب-ی مامەیەتی بەنغرۆ بوون، چونکە لەکاتی هەبوونی خاوەنی پشکی دیاریکراودا ئەوەی دەمێنێتەوە بەم دەدرێت، خۆ ئەگەر هیچ نەمایەوە ئەوا دەوترێت بەهۆی نغرۆبوونەوە بەشبڕاو -حجب- کراوە.

| میراتگرەکان: | مێرد | خوشك لەسەری باوك | مام[2] |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ | ب بەنغرۆبوون |
| پشکەکان: | ١ | ١ | هیچ |

ج- لەفیقهی جەعفەریدا: مامەکانو پورەکان (خوشکانی باوك) لەپلەی سێیەمدان، ئەگەر لەدایكو باوکەوە بوون یان تەنها لەسەری باوکەوە ئەوا هەموو

---

[1] فیقهی جەعفەری دان نانێت بە بیرۆکەی خزمی پشت لەرووی تیۆریەوە، بەلام بەکرداریی هەڵدەستێت بەدابەشکردنی میراتیەکە بەسەر مامو پور (خوشکی باوك)دا لەکاتێکدا بەیەکەوە بێن بەپێی ڕێسای (للذكر مثل حظ الانثيين).

[2] لەفیقهی جەعفەریدا مام بەهۆی خوشکەوە بەشبڕاو-حجب- دەکرێت چونکە مام لەپلەی سێیەمدایەو خوشکیش لەپلەی دووەمدا.

میراتەکە یان ئەوەی دەمێنێتەوە بەپێی (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە) بەش دەکەن لەنێوان خۆیاندا، بەڵام ئەو مامەو پورانە (خوشـکانی بـاوك)ی کەلەسـەری دایکـەوەن ئەوا حوکمەکەیان هەمان حوکمی خوشكو برایە لەسەری دایکەوە، ئەگەر یـەکێك بـوو نێر بێت یان مێ شەش یەکی بەردەکەوێت، ئەگەر زیـاتر لەیـەکێکیش بـوو ئـەوا سـێ یەك بەیەکسانی لەنێوان خۆیاندا بەش دەکەن بەنێرو مێیانەوە.

# باسی سێیەم
# خزمانی سکیی و چۆنیەتی میراتگرێتییان
## (ذوو الأرحام وكيفية توريثهم)

خزمانی سکیی (ذوو الأرحام): هەموو ئەو خزمانە دەگرێتەوە کەنە خاوەن پشکی دیاریکراون نەخزمی پشتن.

بـەپێی لایـەنی خزمایەتیەکـەیان دەکرێنـە چـوار جـۆر[1]: لـەمیرات وەرگـرتنو بەشبڕکردندا هەندێکیان پێش هەندێکی تریان دەکەون، بەپێی ئەم ڕیزبەندییە:

---

[1] (الأرحام) کۆی (رحم)ە مەبەست لێی شوێنی لەدایکبوونی منالە، ئەم خزمایەتیەش بۆیە ناونراوە (رحم)ی چونکە (رحم) هۆکاری خزمایەتیەکەیە: زانایان بۆچوونیان جیاوازە لەمیراتی بەرکەوتنی خزمانی سکیدا: زەیدی کوڕی سابت لەزانایانی هاوەڵانو ئەوانەی شوێنی ئەو کەوتوون پێیان وایە میراتیان نادرێتێ، لای ئەوان لێجێماو لەکاتی نـەبوونی خـاوەن پشـکی دیـاریکراوو خزمـی پشـتدا بـۆ بەیتولمالـە (گەنجینـەی گشتی)، هـەروەها ئەگـەر خـاوەن پشـکی دیاریکراوهـەبوو ئـەوەی مایـەوە پـاش بەشـی ئـەو ئـەوا بـۆ بەیتولماله.

زۆرینەی زانایانیش لەنێویشیاندا عومەری کـوڕی خـەتاب (ﷺ) و عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیب(ﷺ) و ئـیبن مەسعود(ﷺ) دەڵێن لەکاتی نەبوونی خاوەن پشکی دیاریکراوو خزمی پشتدا ئـەوا میراتـی بـۆ خزمـانی سکییە، هەروەها پێشەوا ئەبو حەنیفەو ئەحمەدی کوڕی حەنبەلو هاوەڵانیانو زۆرێك لە شوێنکەوتووان ئەم بۆچوونەیان لا پەسەند بووە، لە سەدەی چواری کۆچیشەوە زانایانی مالکیو شافعیش هاتنە سـەر بۆچوونەکەی ئەمانو بەوەی خزمانی سکیی میراتیان بەر دەکەوێت چونکە بەیتولمال ڕێکو پێك نەبوو.

ئەوانەی بۆچوونیان وابوو میراتیان ناکەوێت بەوە بەڵگەیان دەهێنایـەوە کـە هـیچ دەقێك نیـە لـەبارەی میرات کەوتنیانەوە، ناشکرێت لەبابەتی میراتیدا ئیجتیهاد کاری پێبکرێت.

ئەوانەشی بۆچوونیان وابوو میراتیـان دەکـەوێت بەڵگـەیان بـەم ئایەتـە دەهێنایـەوە: ﴿وَأُوْلُـواْ الأَرْحَـامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ﴾(الأنفال:٧٥ ) واتە: خزمان هەندێکیان لەپێشـترن لـەوانی دیکـەیان، دەقەکەش خزمانی سکیی دەگرێتەوە.

←

**جۆری یەکەم:** ئەوانەی لقی کەسە کۆچکردووەکەن‌و خاوەن پشکی دیاریکراوو خزمی پشت نین، ئەمانەش دوو پێڕن:

١- منداڵەکانی کچی کەسە کۆچکردووەکە بەرەهایی (نێر ومێ)و بەرەو خوارتریش.

٢- منداڵی کچی کوڕی کەسە کۆچکردووەکە بەرەهایی (نێرو مێ) و بەرەو خوارتریش.

جۆری دووەم: ئەوانەی لە بنەچە (اصول)ی کەسە کۆچکردووەکەن‌و نە خاوەن پشکی دیاریکراون نەخزمی پشت، ئەمانەش دوو پێڕن:

١- باپیرەی سکیی‌و بەرەو سەرتر ( باوکی دایك، باوکی دایك‌و باوکی دایك.).

٢- داپیرەی سکیی‌و بەرەوسەر تر( دایکی دایك‌و باوکی دایك، دایکی دایکی دایك‌و باوکی دایك).

جۆری سێیەم: ئەوانەی لەلقی دایك‌و باوکی کۆچکردووەکە بوون، واتە هەموو منداڵەکانی ئەو خزمانەی خاوەن پشکی دیاریکراو و خزمی پشت نین، ئەمانەش چوار پێڕن:

١- منداڵەکانی ئەو برایانەی کۆچکردووەکە کەلەسەری دایکەوە برایەتی (نێرو مێ)و بەرەو خوارتریش.

٢- منداڵەکانی خوشکی کۆچکردووەکە بەرەهایی ( خوشکی دایك‌و باوکی، یان خوشك لەسەری باوکەوە، یان خوشك لەسەری دایکەوە)و بەرەوخوارتریش،

---

بەم فەرموودەیەش کەپێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((من ترك مالا فلورثته، وانا وارث من لا وارث له اعقل عنه وأرث. والخال وارث من لا وارث له يعقل عنه ويرثه)) رواه احمد وابو دلود وابن ماجة نيل الاوطار٦/٧٠.

له ئیبن عەباسیش(ﷺ) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر هاوەڵانی کردبووە برا بەوەش میراتیان لەیەك پێدەبڕا تا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَأُولُوا الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ﴾ ئیدی بەڕەچەڵەك میراتیان پێدەبڕا. نيل الاوطار٦/١٧٣.

ئیدی نێرینە بن یان مێینە جیاوازی نیە.

٣- منداڵەکانی برای کۆچکردووەکە بەرەهایی (دایکو باوکی، یان لەسەری باوکەوە، یان لەسەری دایکەوە) [1].

٤- کچەکانی کوڕی برای کۆچکردووەکە بەرەهایی.

جۆری چوارەم: ئەوانەی لقی یەکێك لەباپیرە یان داپیرەکانی کۆچکردووەکەن هەرچەند بەرەوسەرتریش بن، واتە ئەوانەی دەگەڕێنەوە سەر بنەچەی کۆچکردووەکە کەخاوەن پشکی دیاریکراوو خزمی پشت نین، ئەمانەش ئەم پێڕانەن:

١- مامەکانی کۆچکردووەکە کەلەسەری دایکەوەن [2] و منداڵەکانیان.

٢- کچەکانی مامەکان بەرەهایی [3] و منداڵەکانیان.

٣- پورەکان (خوشکی باوك)و منداڵەکانیان.

٤- خاڵەکانو منداڵەکانیان.

٥- پورەکان (خوشکی دایك)و منداڵەکانیان [4].

جێی ئاماژەیە کە لەکاتی هەبوونی خزمی پشت یان خاوەن بەشی دیاریکراودا خزمانی سك میراتیان ناکەوێت جگە لەژنو مێرد کەئەم دووانە کەس بەشبڕاو ناکەنو کەسیش بەشبڕاویان ناکات.

ریزبەندی خزمانی سکیش بەجۆرێکە کەجۆری یەکەم دەخرێتە پێش جۆری دووەم، دووەم پێش سێیەم، سێیەم پێش چوارەمو ، ئەوەی دوای ئەو دێت [5].

---

[1] کچانی برا لەسەری دایکەوە لە پێڕی یەکەمن بۆ زیاتر روونکردنەوە دووبارەکرانەوە.

[2] واتە برای باوکی کۆچکردووەکە لەدایکیەوە.

[3] مامە لەدایکو باوکەوە یان لەسەری باوکەوە یان لەسەر دایکەوە.

[4] لەو پێنج پێڕەوە هەمان ئەو پێنجەش بۆ دایکو باوکی کۆچکردووەکە دەکرێت بپێورێت، باپیرەی، داپیرەی، وەك پوری -خوشکی باوك-دایکو باوکی کۆچکردووەکەو، پوری -خوشکی دایکی- ، لەگەڵ پوری -خوشکی باوك-ی باپیرەیو.... بەو جۆرە.

[5] بۆ ئەم چوار جۆرە گوزارشتی پێڕ (الأصناف) بەکار دەهێنرێت ئەمەش بەکارهێنانێکی هەڵەیە، چونکە جۆر دابەش دەبێت بۆ پێڕ (اصناف)، پێڕیش (صنف) دابەش دەبێت بۆ کەسەکان (الأشخاص).

مامەو پورو خاڵەو پوری هەمان کەسی کۆچکردوو دەخرێتە پێش مامەو پورو خاڵەو پوری باوکی، ئەمانیش دەخرێنە پێش مامەو پورو خاڵەو پوری داپیرەو باپیرەی، بەمجۆرە ریزبەندی پێرەکانی خزمانی سکیی لە رێگریدا بەهەمان شێوەی پلەکانی میراتگرانە لای جەعفەریەکان، هەروەك چۆن هەر پلەیەك پلەی دوای خۆی لەمیراتی بەشبڕاو دەکات، بەهەمان شێوە هەر جۆرێك لەجۆرەکانی خزمانی سك جۆری پاش خۆی ئیدی نێرینە بێت یان مێینە بەشبڕاو دەکات، خۆ ئەگەر لەهەر جۆرێکیان یەك کەس هەبوو ئەوا ئەو کەسە شایستەی هەموو میراتیەکەیە، یان دووکەس یا زیاتر هەبێت، ئەم حوکمانە لەو چوار جۆرەدا پەیڕەو کراوە:

.

# جۆری یەکەم

## میراتی کچەزا و، منالی کچی کوڕ

**یەکەم: لای زۆرینەی زانایان:**

میراتی کچەزاو منالّی کچی کوڕو بەرەوخوارتر بەپێی ئەم بنەمایانەدا دەبێت:

١- ئەگەر یەکێك بوو ( نێر بێت یان مێ): پاش میراتی یەکێك لەژن و مێردەکە هەموو میراتیەکەی بەردەکەوێت.

| | |
|---|---|
| **میراتگرەکان:** | کوڕی کچ، یان کچی کچ، یان کوڕی کچی کوڕ |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەموو میراتیەکە |

| **میراتگرەکان:** | ژن | کچی کچ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٣ |

| **میراتگرەکان:** | مێرد | کوڕی کچ، یان کوڕی کچی کوڕ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

٢- زیاتر لەیەکێك بوون ئەوا پەیڕەوی ئەم خاڵانە دەکرێت:

أ- ئەگەر پلەی خزمایەتیەکەیان و گەیشتنەوەیان پێی وەك یەکبوو، میراتیەکە هەمووی یان ئەوەی دەمێنێتەوە بەیەکسانی لەنێوانیاندا بەش دەکرێت، ئەگەر تەنها نێرینە بوون وەك کوڕانی کچ، یان تەنها مێینە بوون وەك کچانی کچ، ئەگەر کوڕو کچ بوون پێکەوە هاتن ئەوا کوڕ دووهێندەی کچی بەردەکەوێت، وەك کوڕانی کچ لەگەڵ کچانی کچدا هاتبێت.

**میراتگرەکان:** (٥) کوڕی کچ بنچینەی بابەتەکە(٥) ژمارەیان

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بەیەکسانی)

**میراتگرەکان:** ژن (٣) کچی کچ

پشکە دیاریکراوەکان: ١/٤ م یەك بەش بۆ هەر کچی کچێك

پشکەکان: ١ ٣

**میراتگرەکان:** کچی کچی کچ کوڕی کچی کچ

پشکە دیاریکراوەکان: (بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە)

پشکەکان: ١ ٢

ب- ئەگەر پلەی خزمایەتیەکەیان جیاواز بوو ئەوا پلە نزیکەکان نێر بن یان مێ پێش دەخرێن:

**میراتگرەکان:** کچی کچ کوڕی کچی کوڕ

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

ج- ئەگەر پلەی خزمایەتیان وەك یەك بوو بەڵام ڕێگەی گەیشتنەوەی خزمایەتیەکەیان جیاواز بوو، ئەوەیان کەلەڕێگەی خاوەن پشکی دیاریکراوەوە دەگەیشتەوە بەکۆچکردووەکە دەخرێت پێش ئەوەی کەلەڕێگەی خزمی سکیەوە دەگاتەوە بە کۆچکردووەکە:

**میراتگرەکان:** کچی کچی کوڕ کوڕی کوڕی کچ [1]

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

---

[1] کچی کوڕ لەخاوەن پشکە دیاریکراوەکانەو کوڕی کچ لەخزمانی سکیە لەبەر ئەوە کچی کچی کوڕ دەخرێتە پێش کوڕی کوڕی کچ.

### دووەم: لەفیقهی جەعفەریدا [1]:

میراتی کچەزاو منداڵەکانی کچی کوڕ لەم فیقهەدا بەپێی ئەم بنەمایانە دەبێت:

١- کچەزاو منداڵی منداڵەکانیانو بەرەوخوارترو منداڵەکانی کچی کوڕو منداڵی منداڵەکانیانو بەرەوخوارتر نێر بن یان مێ دەچنە جێی ئەسڵەکەیان لەمیراتی وەرگرتندا لەکاتی نەبوونی ئەوانداو ئەوەی بۆ ئەسڵەکە بێت گەر لەژیاندا بووایە ئەوا دەدرێتە ئەمان.

٢- منداڵو منداڵی منداڵەکانو بەرەوخوارتر نێر بن یان مێ لەچینی (پلەی) یەکەمی میراتگرانن لەبەر ئەوە دەخرێنە پێش هەموو خزمەکان جگە لەدایكو باوك.

٣- ئەگەر ژنو مێرد یەکێکیان لەگەڵ یەکێك لەدایكو باوك یان هەردووکیاندا هات لەگەڵ کوڕەزاو کچەزادا ئەوا یەکێك لەژنو مێردەکە کەمترین بەشی بەردەکەوێت، بۆ هەریەك لەدایكو باوکیش شەش یەك، ئەوەشی مایەوە بۆ کوڕەزاو کچەزاکان دەبێت بەسێ بەش: کوڕەزاکان بەشی باوکیان دەبەن دوولەسەر سێ لەنێوان خۆیاندا بەش دەکەن بەیەکسانی گەر تەنها کوڕ یان کچ بوون بۆ کوڕیش دووهێندی کچ ئەگەر کوڕو کچ بوون.

کچەزاکانیش بەشی دایکیان بەردەکەوێت کەیەك لەسەر سێیە، بەهەمان شێوە بەیەکسانی بەشی دەکەن ئەگەر تەنها کوڕ یان کچ بوون، ئەگەر کوڕو کچیشی هەبوو ئەوا نێر دووهێندەی مێی دەدرێتێ:

| میراتگرەکان: | مێرد | کوڕی کچ | کچی کوڕ |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | (ئەوەی مایەوە دەیکەنە سێ بەش) | |
| پشکەکان: | ١ | ١ | ٢ |

[1] ڕێڕەوی باو لەفیقهی جەعفەریدا ئەوەیە کە بەرێگەی دابەزین هەرکەس جێگەی ئەسڵەکەی دەگرێتەوە لەمیراتی وەرگرتنداو بەو جۆرە ئەوەی ئەسڵەکە شایستەی بووە ئەم وەریدەگرێت.

| میراتگرەکان: | ژن | کوڕی کچ. | کچی کچ | کوڕی کوڕ . | کچی کوڕ |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ /٨ | ١ /٣ م | | ٣/٢ م | |
| پشکەکان: | ٢٧ | ٤٢ | ٢١ | ٨٤ | ٤٢ |

بنچینەی بابەتەکە (٢٤)ە بچوکترین چەندجارەی هاوبەش بۆ ئەوەی دەمێنێتەوەو راست دەکرێتەوە بە (٣×٣) × (٢٤)=٢١٦.[١]

٤- ئەگەر پلەی خزمایەتیەکەیان جیاواز بوو ئەوا نزیکترین پلەیان نێر بێت یان مێ پێش دەخرێت، ئیدی گەیشتنەوەی بەکۆچکردووەکە بەرێی خاوەن پشکی دیاریکراو بێت یان نا.

| میراتگرەکان: | کچی کچ | کچی کوڕی کوڕ |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | (هەموو میراتیەکە) | ب |

---

[١] روونکردنەوەی ئەمە بەشی کچەزاکان لە (٢٤) و(٧) دەبێتو ئەمەش دابەش ناکرێت بۆ سێ بەش (بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە) هەروەها بەشی کوڕەزاکانیش (١٤)یە و دابەش ناکرێت بۆ سێ بەشی وەك یەك لەبەر ئەوە ژمار هەموویان پاش ئەوەی نێرینە بەدوو دادەنرێت لەگەڵ ئەوانی تردا لێك دەدرێت پاشان ئەوەی بەدەست هات لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت.

## جۆری دووەم

## میراتی باپیرەی سکیی و داپیرەی سکیی[1]

بۆ میراتی وەرگرتنی ئەم جۆرەی دووەم پێویستە ئەم دوو مەرجە بێتە دی:

یەکێکیان: نابێت کۆچکردووەکە جگە لە یەکێك لەژن و مێردەکە هیچ میراتگرێکی خاوەن پشکی دیاریکراو یان خزمی پشتی هەبێت.

دووەمیان: نابێت کۆچکردووەکە هیچ میراتگرێکی هەبێت لەجۆری یەکەم لەخزمانی سکیی[2].

---

[1] زانایانی ئیسلام کۆدەنگن لەناوهێنانی داپیرەی سکیی بە داپیرەی کەوتوو(ساقط) یان داپیرەی خراپبوو(الفاسد)، بەهەمان شێوە ناوی داپیرەی خراپبوو یان داپیرەی کەوتوو لەداپیرەی سکیی ناوە، هەردوو دەستەواژەکە خراپو کەوتوو (فاسد وساقط)، چونکە هەموو مرۆڤێك خوای گەورە لەدوو پێکهاتە دروستی دەکات، ئەوانیش مەنی پیاو، هێلکۆکەی ئافرەت، ئەو دوانەش لەکرۆکی خوێن پێکدێن کەئەویش کرۆکەکەی ئەو خۆراکەیە کەلەخاك پێکدێت، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾ الروم/٢٠. هیچکام لەدوو پێکهاتەش لەوەی دیکەیان جیا نیە تا ئەوەیان کەلەسەری باوکەوەیە بەباپیرەی دروست یان داپیرەی دروست ناوببرێت و، ئەوەی لەسەری دایکەوەیە بە باپیرەی خراپبوو یان کەوتوو یان داپیرەی خراپبوو یان کەوتوو ناوببرێت.

[2] لەسەر چ بنەمایەك کار بە پێوەری نزیکایەتی بکرێت بەوەی هەرە نزیکیان لەکۆچکردووەکەوە پێش بخرێت، بەمەش ریزبەندی میراتی خزمانی سکیی بەهەمان شێوەی ریزبەندی خزمانی پشتە، لەبەر ئەوەی کەسێك لەلایەکی دیکە میراتی بەرناکەوێت بەهۆی هەبوونی کەسێك لەو لایەی کە.. شرح النيل وشفاء العليل٨/٤١٣.

میراتی وەرگرتنی خزمانی سکیی لەسەر شێوازی خزمانی نزیك شێوازی زانایانی حەنەفی بووە کە زۆرینەی یاسا کارپێکراوەکان لەمیان وەرگرتووە، وەك یاسای باری کەسیی سوری کارپێکراو (م٢٩٠ — ٢٩٧) وجەزائیری(م١٥٧—١٦٨).

ئەگەر ئەو دوو مەرجە هاتنە دی ئەوا میراتی وەرگرتنیان بەپێی ئەم بنەمایانە دەبێت:

١- ئەگەر یەك دانە بوو –نێر بێت یان مێ– ئەوا هەموو میراتیەکەی یان ئەوەی پاش بەشی یەکێك لەژنو مێردەکە دەمێنێتەوە بەردەکەوێت.

**میراتگرەکان:** ژن باپیرە(باوکی دایك) یان داپیرە (دایکی باوکی دایك)

پشکە دیاریکراوەکان: ١ /٤ م

پشکەکان: ١ ٣

٢- ئەگەر زیاتر لەیەکێك بوو پلەی خزمایەتیەکەشیان جیاواز بوو ئەوا میراتیەکە دەدرێتە نزیکترینیان لەکۆچکردووەکە ئیدی لەسەری باوکەوە بێت یان لەسەری دایکەوە.

**میراتگرەکان:** باپیرە(باوکی دایك) باپیرە(باوکی دایکی باوك)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

٣- ئەگەر پلەی خزمایەتیشیان وەك یەك بوو، بەڵام رێگەی گەشتنەوەیان بەکۆچکردووەکە جیاوازبوو[1] ئەوا ئەوەیان کەلەرێی خاوەن پشکی دیاریکراوەکە دەگاتەوە بە کۆچکردووەکە لەپێشترە چونکە بەهێزترە لەوەی کەبەهۆی خزمی سکییەوەیە.

**میراتگرەکان:** ژن باپیرە(باوکی دایکی دایك). باپیرە(باوکی باوکی دایك)[2]

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ م ب

پشکەکان: ١ ٣ هیچ

---

[1] بەوەی هەندێکیان بەخاوەن پشکی دیاریکراو ئەوانی تر بە خزمانی سکیی پێی دەگەنەوە.

[2] دایکی دایك خاوەن پشکی دیاریکراوە، باوکی دایکیش لەخزمانی سکیە.

٤- ئەگەر لەپلەی خزمایەتیو رێگەی گەشتنەوەیان وەك یەك بوون بەوەی کە هەریەك لەخزمایەتی باوك یان هەموو خزمایەتیەکی دایك لەمیراتیدا بەشی کوڕ دوو هێندەی کچە.

**میراتگرەکان:** باپیرە(باوکی باوکی دایك) داپیرە (دایکی باوکی دایك)

پشکە دیاریکراوەکان: ٢ /٣ ١ / ٣

پشکەکان: ٢ ١

**میراتگرەکان:** ژن باپیرە (باوکی باوکی دایکی باوك).

داپیرە(دایکی باوکی دایکی باوك)

پشکە دیاریکراوەکان:١/٤ م (بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە)

پشکەکان: ١ ٢ ١٠

٥- ئەگەر لەپلەو بەیەکگەیشتندا وەك یەك بوون، بەڵام لەو لایە (لای خزمایەتی) جیاواز بوون، وەك ئەوەی هەندێکیان لەلای باوکی کۆچکردووەکەوەو ئەوانی تر لەلای دایکەوە بوون: لێرەدا ئەوانەی لەلای باوکەوەن دوو لەسەر سێیان دەدرێتێ، ئەوانی لای دایکەوەن یەك لەسەر سێ، بەوجۆرە هەموو میراتیەکە یان ئەوەی دەمێنێتەوە پاش بەشی ژنو مێردەکە یەکێکیان بە پێی بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە دابەش دەکرێت[1].

**میراتگرەکان:** ژن باپیرە(باوکی دایکی باوك) باپیرە(باوکی دایکی دایك)

پشکە دیاریکراوەکان: ١/٤ م (بەسێ بەش)

پشکەکان: ١ ٢ ١

---

[1] چونکە ئەوانەی لەسەری باوکەوە پێی دەگەنەوە دەچنە جێگەی ئەو، ئەوانەشی لە سەری دایکەوە دەچنە جێی دایکەکە.

پوختەی قسە: پێشخستنی ئەندامەکانی ئەم پێڕە بەمجۆرە دەبێت:

أ- بەپێی پلە.

ب- پاشان ڕێگەی گەیشتنەوە.

ت- لەکاتی وەك یەکی پلەو ڕێگەی گەیشتنەوەو یەکی ئەو سەرەی دەیانگەیەنێتەوە ئەوا میراتیەکە لەنێو خۆیاندا بەش دەکەن بۆ نێر دووهێندەی مێینە دەبێت.

لەکاتی جیاوازی ئەو سەرەی دەیانگەیەنێتەوە ئەوا خزمانی سەری باوك دوو لەسەر سێ و سەری دایك یەك لەسەر سێ یان بەردەکەوێت [1].

**فیقهی جەعفەری:**

لەو حوکمانەی جۆری دووەم کەخرانە روو جیاوازی نیە لەنێوان ئەم فیقهەو بۆچوونی زۆرینەی زانایاندا تەنها لە برگەی (٣)دا نەبێت کە ئەم فیقهە دان نانێت بەدابەشکردن بۆ خاوەن پشکی دیاریکراوو خزمانی سکیی، بەمەش دان نانێت بە جیاوازی ڕێگەی گەیشتنەوە لەڕێی خاوەن پشکی دیاریکراوەوە بێت یان سکیی، وەك ئەوەی لای زۆرینەی زانایان پەیڕەو دەکرێت، لەو نمونەی لەبرگەی (٣) باسکراوە سامانەکە لەنێوان هەردوو باپیرەکەدا بەیەکسانی دابەش دەکرێت [2].

---

[1] هەر ئەمەش هاتووە لە مادە (٣٣)ی یاسای میسریدا: " پێڕی دووەمی خزمانی سکیی ئەوەیان پلەی خزمایەتی نزیکترە لەکۆچکردووەکە لەپێشترە بۆ میراتی بەرکەوتن، خۆ ئەگەر وەك یەکبوون ئەوا ئەوەیان پێش دەخرێت کەبەخاوەن بەشی دیاریکراو پێی دەگاتەوە، یان ئەگەر هەموویان بەخاوەن بەشی دیاری کراو پێی دەگەیشتنەوە، ئەگەر لەپلەو سەری گەیشتنەوەی خزمایەتیش وەك یەکبوون ئەوا هاوبەش دەبن لەمیراتیەکەدا، ئەگەر لەسەری گەیشتنەوەشەوە جیاواز بوون ئەوا دوو لەسەر سێ بۆ خزمانی سەری باوكو یەك لەسەر سێ بۆ خزمانی سەری دایك دەبێت ".

[2] لە (ایضاح الفوائد شرح اشكالات القواعد(٢١٩/٤) هاتووە: "باپیرە بەتەنها بوو سامانەکە دەبات، بەهەمان شێوە داپیرەش ئیدی لەسەری باوك یان سەری دایك بێت، خۆ ئەگەر باپیرەو داپیرە بەیەکەوە هاتنو لەسەری دایکەوە بوون ئەوا یەکسانن، ئەگەر لەسەری باوکەوە بوو ئەوا باپیرە دوو لەسەر سێ داپیرە یەك لەسەر سێ، بۆ باپیرە یان داپیرە کەیەکەمیان لەسەری دایکەوە بێت لەگەڵ باپیرە یان داپیرە یان ←

**میراتگرەکان:** ژن باپیرە(باوکی دایکی دایك)،

باپیرە(باوکی باوکی دایك)

بنچینەی بابەتەکە (٤) و

بە(٨) راست دەکرێتەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ م بەیەکسانی

پشکەکان: ٢ ٣ ٣

چونکە هەردووکیان دەچنە جێگەی دایکی کەسە کۆچکردووەکەو پشکەکەیان بەیەکسانی دابەش دەکەن، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ میراتی ئەمجۆرە جگە لەنەبوونی جۆری یەکەم و نەمانی باوك و دایکی کەسە کۆچکردووەکە مەرجیان دانەناوە.

---

هەردووکیان لەسەری باوکەوە بن سێ یەك هەیە ئەگەر یەك کەس بوو ئەگەر زیاتریش بوو بەیەکسانی بەشی دەکەن و ئەوەشی مایەوە بۆ باپیرە یان داپیرەیە یان بۆ هەردووکیان دەبێت، باوك سێ بەش، خۆ گەر ژن یان مێرد هات لەگەڵیان ئەوا پشکە زۆرەکەیان بەردەکەوێت: نیوە بۆ مێرد، چواریەك بۆ ژن، بۆ باپیرە یان داپیرە یان هەردووکیان کەلەسەری دایکەوەن سێ یەکی بنچینەو ئەوەی مایەوە بۆ باپیرەو داپیرە یان هەردووکیان کەلەسەری باوکەوەن، باپیرەو داپیرە لەسەری باوکەوە بن یان دایکەوە دەبنە رێگری لەهەر کەس کەبەهۆی ئەوانەوە ببێتە خزم لەباوك و باپیریان و منداڵەکانیان کەئەمانەن: مامەکان و پورەکان -خوشکی باوك-، خاڵەکان و پورەکان -خوشکی دایك-، و منداڵەکانیان و نابنە رێگری لەخوشك و براو منداڵەکانیان ".

# جۆری سێیەم
# میراتی منالی خوێش
## (توريث أولاد الحواشي)

بۆ میراتی وەرگرتنی ئەم جۆرە لەخزمانی سکیی مەرجە میراتگری پشتو خاوەن پشکی دیاریکراو-جگە لەیەکێك لەژنو مێرد- لەگەڵی نەهاتبێت، بەهەمان شێوە میراتگری لەهەردوو جۆری یەکەم لەخزمانی سکیی لەگەڵ نەبێت، چونکە ریزبەندی ئەمجۆرانە لەرەوتی خزمایەتیدا وەك ریزبەندی خزمانی پشت وایە، ئەگەر ئەم مەرجانە هاتە دی ئەوا حوکمی میراتی وەرگرتنیان وەك حوکمی میراتی وەرگرتنی جۆری یەکەم (کچەزاو منالی کچی کوڕ) دەبێت، بەم شێوەیە:

**یەکەم:** ئەگەر تەنها یەکێك بوو، ئەوا پاش بەشدانی یەکێك لەژنو مێردەکە هەموو میراتیەکە یان ئەوەی دەمێنێتەوە بەری دەکەوێت.

| **میراتگرەکان:** | مێرد | کچی خوشك |
|---|---|---|
| پشکی دیاریکراو: | ١ /٢ | م |
| بەشەکان: | ١ | ١ |

**دووەم:** ئەگەر زیاتر لەیەکێك بوو ئەوا ئەم حوکمانە پەیرەو دەکرێت:

١- ئەگەر پلەی خزمایەتیان جیاواز بوو ئەوا نزیکترین پلەیان شایستەترە بەمیراتیەکە:

| **میراتگرەکان:** | کچی برا لەسەری دایکەوە | کچی کوڕی برای دایكو باوکی |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب |

٢- ئەگەر پلەی خزمایەتیان وەك یەك بوو بەڵام تێیاندا بوو بـەهۆی كوڕێكـەوە كەپشت بوو دەگەیشتەوە بەكۆچكردووەكە، ئەم لەپێشترە لەمیراتیەكـەدا لەكوڕێك كەبەخزمانی سك بگاتەوە:

**میراتگرەكان:** كچی كوڕی برایەكی دایكو باوكی كوڕی كچی برایەكی دایك و باوكی

پشكەدیاریكراوەكان: هەمووی ب

٣- ئەگەر لەگەیشتنەوەیاندا یان نەگەیشتنەوەیان لەڕێی پشت وەك یەك بوون، لێرەدا میراتیەكە بۆ ئەوەیان دەبێت كەپلەی خزمایەتیەكەی بەهێزترە:

**میراتگرەكان:** كچی برای دایك و باوكی كچی برا لەسەری باوكەوە

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی ب

**میراتگرەكان:** ژن كچی برا لەسەری باوكەوە كچی برا لەسەری دایكەوە

پشكە دیاریكراوەكان: ٤/١ م ب

پشكەكان: ١ ٣ هیچ

**فیقهی جەعفەری،**

١- جۆری سێیەم وەك جۆری دووەم وایە، هەردووكیان لەپلەی دووەمـدان، لەبـەر ئەوە كەسیان ئەویتریان بەشبڕ ناكات:

**میراتگرەكان:** باپیرە(باوكی دایك) كچی برا لەسەری دایكەوە

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی (بەیەكسانی)

٢- منداڵەكانی خوشكو براكان كەلەسەری دایكەوەن دەچنە جێگـای بـرا لەسـەری دایكەوە، ئەگەر تەنها یەكێك بوو شەش یەكی بۆ هەیە، زیاتر بوو سێ یەكی بۆ هەیە.

٣- منداڵەكانی برا دایكو باوكیەكان دەچنە شوێنی برا دایكو باوكیەكەو پشكەكەی ئەو وەردەگرن -كەئەگەر زیندوو بوایە هێندەی وەردەگرت- هەموو میراتیەكە

یان ئەوەی دەمێنێتەوە پاش پێدانی بەشی یەکێك لەژن‌و مێردەکە بەیەکسانی یان بۆ نێرینە دووهێندی مێینە [1].

| میراتگرەکان: | ژن | کچی برا ك | کوڕی برا ك |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | م (بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە) | |
| بەشەکان: | ١ | ١ | ٢ |

٤- منالّی برا دایك‌و باوکیەکان دەبنە هۆی بەشبڕکردنی منالّی ئەو برایانەی کەتەنها لەسەری باوکەوەن، هەریەکەیان وەك لەجێی باوکی بێت وایە، بەلاّم منالّی ئەو برایانەی کەلەسەری دایکەوەن بەهۆی منالّی برای دایك‌و باوکی یان لەسەری باوکەوە بەشبڕ ناکرێن، هەروەها برای دایك‌و باوکی یان لەسەری باوکەوە نابێتە بەشبڕی برا لەسەری دایکەوە.

| میراتگرەکان: | مێرد | کچی برا ك | کچی برا لەسەری باوکەوە |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م | ب |
| بەشەکان: | ١ | ١ | هیچ |

| میراتگرەکان: | کچی برا لەسەری دایکەوە | کچی برا ك |
| --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م |

[1] بەیەکسانی بەشی دەکەن ئەگەر تەنها نێرینە بوون، یان تەها مێینە بوون، ئەگەر نێرینەو مێینەش بەیەکەوە هاتن ئەوا بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە.

# جۆری چوارەم

## میراتی جۆری چوارەم

ئەم جۆرە لەخزمانی سکیی بریتین لە مامەکان لەسەری دایکەوەو پورەکان- خوشکی باوك-و خالۆو پور -خوشکی دایك-و منالەکانیان سەبارەت بە کۆچکردووەکە یان بۆ دایكو باوکی یان بۆ داپیرەو باپیرەی.

ئەگەر دووکەس یان زیاتر لەجۆری چوارەم هەبوون، ئەوا لەیەکێك لەم دوو حاڵەتە بەدەر نیە:

**یەکەمیان:** لەسەری خزمایەتیەوە یەکبن، وەك ئەوەی خزمایەتی هەموویان لەسەری باوکەوە بێت کەئەوانیش مامەکان لەسەری دایکەوە و پورەکان -خوشکی باوك- بەرەهایی، یان لەسەری دایکەوە بن کەئەوانیش خاڵەکانو پورەکان - خوشکی دایك- دەگرێتەوە بەرەهایی، بۆ ئەمەش دوو شێوە هەیە:

أ- لەهێزی خزمایەتیدا جیاواز بن، وەك ئەوەی هەندێکیان لەهەردوو سەری دایكو باوکەوە بێت، هەندێکی تریان تەنها لەسەری باوك یان سەری دایکەوە بێت، لێرەدا بەهێزەکەیان پێش دەخرێت، ئەوەیان کە لەهەردوو سەری باوكو دایکەوەیە دەخرێتە پێش ئەوەیان کەتەنها لەسەری باوکەوەیە، ئەوەشیان کەلەسەری باوکەوەیە دەخرێتە پێش ئەوەیان کەلەسەری دایکەوەیە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | پور ك | پور لەسەری باوکەوە | پور لەسەری دایکەوە |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب | ب |

(بەهێزترە لەوانەی لەگەڵیدان)

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | خاڵ ك | خاڵ لەسەری باوك | خاڵ لەسەری دایك |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب | ب |

(بەهێزترە لەوانەی لەگەڵیدان)

ب- لەهێزی خزمایەتیدا وەك یەك بن، وەك ئەوەی هەموویان لەسەری دایكو باوكەوە یان سەری باوكەوە یان دایكەوە بن، لەم حاڵەتەدا ئەگەر هەموویان نێرینە یان تەنها مێینە بوون لەمیراتیەكەدا بەیەكسانی هاوبەش دەبن، ئەگەر نێرینەو مێینەش بوون ئەوا بۆ نێرینە دووهێندەی مێینە دەبێت:

**میراتگرەكان:** (٣) مامە لەسەری دایكەوە

پشكەدیاریكراوەكان: هەمووی (بەیەكسانی) چونكە لەیەك سەرەوەنو هێزی خزمایەتیان وەك یەكە

**میراتگرەكان:** (٢)پورك

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی

(سامانەكە دەكەنە دوو بەش، یەكی نیوەی دەبەن)

**میراتگرەكان:** (٣) خاڵی دایك و باوكی یان لەسەری باوكەوە یان لەسەری دایكەوە

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی (سامانەكە دەكەنە سێ بەشی وەك یەك).

**میراتگرەكان:** (٣)پور خوشكی دایك- دایكو باوكی یان لەسەری باوكەوە یان لەسەری دایكەوە

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی (سامانەكە دەكەنە سێ بەشی وەك یەك).

**میراتگرەكان:** (٤) پور -خوشكی دایك-

پشكە دیاریكراوەكان: هەمووی

(سامانەكە دەكەنە چوار بەش هەریەكەیان بەشێك).

**دووەمیان:** سەری خزمایەتیەكەیان جیاواز بێت، لەم حاڵەتەدا هێزی خزمایەتی ئەرزشی نیە، بەڵكو دوو لەسەر سێ دەدرێتە ئەوانەی خزمایەتیەكەیان لەباوكەوەیە، یەك لەسەر سێش بەوانەی خزمایەتیەكەیان لەسەری دایكەوەیە، جا دوو لەسەر

سێیەکەی بەسەر خزمانی سـەری باوکدا دابـەش دەکرێـت، یـەك لەسـەر سـێیەکەش بەسەر خزمانی سەری دایکدا، ئەگەر خزمەکانی سەری بـاوك کـەدوو لەسـەر سـێیان بەردەکەوێت جیـاوازبوون لـەهێزی خزماتیـدا، ئـەوا بـەهێزەکانیان دوو لەسـەر سـێکە دەبەن، ئەگەر خزمایەتیەکەشیان لەیەك ئاستدا بوو ئەوا لەدوو لەسەر سـێیەکدا نێـرو مێیان هاوبەش دەبن (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)، ئـەو سـێ یەکەشـی بـەخزمانی سەری دایك دراوە بەهەمان شێوە دابەش دەکرێت:

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | پور—خوشکی باوك— ك | مام لەسەری دایکەوە | پور—خوشکی دایك— لەسەری باوکەوە | خاڵ لەسەری دایکەوە |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٣/٢ | ٣/١ | ٣/١ |

لێرەدا پور—خوشکی باوك—و مام دوولەسەر سێ یان پێ دەدرێـت، خـاڵو پـور—خوشکی دایك— سێ یەکیان بەردەکەوێت، پاش ئەم بەشکردنە پور—خوشکی باوك—کەلەسەری دایكو باوکەوەیە دوولەسەر سێی یەکـە دەبـات چـونکە بـەهێزترە لـەمام کەتەنها لەسەری دایکەوەیە، پور—خوشکی دایك— کەلەسەری باوکەوەیە هەموو یـەك لەسەر سێیەکە دەبات لەبەر ئەوەی بەهێزترە لە خاڵ کەلەسەری دایکەوەیە [1].

[1] پۆلی چوارەم ئەوانەن کە رەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر باپیرەکانی یان داپیرەکانی کەسە کۆچکردووەکە، کەئەوانیش مامەکانن لەسەری دایکەوەو پورەکان —خوشکی باوك— و خاڵەکانو پورەکـان —خوشـکی دایك— پاشان منداڵەکانیانو بەرەوخوارتر، رێسای میراتی بردنیشیان ئەگـەر لەیـەك ئاسـتدا بـوون ئـەوا بەهێزترینیان —نێر بێت یان مێ— لەپێشترە، خۆ ئەگـەر وەك یـەك بـوو خزمایەتیەکـەیان و نێـرو مـێ بوون، ئەوا بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینەیە، ئەگەر شێوەی خزمایەتیەکەشـیان جـودا بـوو ئـەوا هێـزی خزمایەتی ئەرزشی نامێنێت، دوو لەسەر سێ بۆ خزمانی سەری بـاوك و یـەك لەسـەر سـێ بـۆ خزمـانی سـەری دایـك. پاشـان ئـەوەی بـەر هەرلایـەك دەکـەوێت لـەنێوان خۆیانـدا وەك ئـەوەی سـەری خزمایەتیەکەیان یەك بێت بەشی دەکەن.

**میراتی منداڵەکانی جۆری چوارەم و ئەوانەی بەمان دەگەنەوە:**

ئەگەر یەك منداڵی یەکێك لەم جۆرە هەبوو، هیچ کەسی لەجۆرەکانی تر لەگەڵ نەهاتبوو، ئەوا هەموو سامانەکە دەبات، ئەگەر دوو کەس یان زیاتر بوون ئەوا حاڵەکە لەم دووانە بەدەر نیە:

یەکەمیان: پلەیان جیاواز بێت، لەم حاڵەتەدا ئەوەیان پلەی خزمایەتی بەهێزترە پێش دەخرێت، ئیدی لەسەری باوکەوە بێت یان لەسەری دایکەوە..

**میراتگرەکان:** کوڕی پور –خوشکی باوك– کوڕی کوڕی خاڵ

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

سامانەکە هەمووی بۆ ئەوەی یەکەمە لەبەر بەهێزی خزمایەتیەکەی

**میراتگرەکان:** کوڕی پور –خوشکی دایك– کچی کوڕی پور–خوشکی باوك–

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی . ب

سامانەکە هەمووی بۆ ئەوەی یەکەمە لەبەر بەهێزی خزمایەتیەکەی

دووەمیان: پلەی خزمایەتیەکەیان وەك یەك بێت، لەم شێوەیەدا دوو بار هەیە:

١– سەری خزمایەتیەکەیان یەك بێت وەك ئەوەی هەموویان لەسەری باوکەوە بن کەئەوانیش منداڵەکانی پورەکانە –خوشکی باوك– بەرەهاییو، منداڵەکانی مامەکانە لەسەری دایکەوەو، کچەکانی مامەکان لەسەری دایكو باوکەوە یان لەسەری باوکەوەو، کچەکانی منداڵەکانیان، یان هەموویان لەسەری دایکەوە، کەئەوانیش منداڵەکانی خاڵو پور –خوشکی دایك– بەرەهایی، خۆ ئەگەر هێزی خزمایەتیان جیاواز بوو ئەوا بەهێزترینیان پێش دەخرێت، ئەوەیان کەلەسەری دایكو باوکەوەیە لەپێشترە لەوەی کەلەسەری باوکەوەیە، ئەوەشی لەسەری باوکەوەیە لەپێشترە لەوەیان کەلەسەری دایکەوەیە:

**میراتگرەکان:** منالّی پور منالّی پور منالّی پور

—خوشکی باوک— —خوشکی باوک— —خوشکی باوک—

لەسەری باوکو دایکەوە لەسەری باوکەوە لەسەری دایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب ب

خۆ ئەگەر لەهێزی خزمایەتیشدا وەك یەك بوون ئەوا لەسێ شێوە بەدەر نیە:

أ— هەندێکیان منالّی پشت بنو هەندێکی تریان منالّی خزمی سك، لێرەدا منالّی پشت دەخرێتە پێش منالّی خزمی سك:

**میراتگرەکان:** کچی مام کچی پور—خوشکی باوك—

لەسەری باوکەوە لەسەری باوکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی م

ب— هەموویان منالّی خزمانی پشت بوون، لەمیراتیەکەدا یەکسان دەبن:

**میراتگرەکان:** (٢) کچی مام لەسەری باوکو دایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بۆ هەریەکەیان نیوەی میراتیەکە).

پ— هەموویان منالّی خزمانی سکی بن، هەموویان بەنێرو مێیانەوە لەمیراتیەکەدا بەشیان دەبێت:

**میراتگرەکان:** کوڕی خالّ کچی پور—خوشکی دایك—

لەسەری باوکو دایکەوە لەسەری باوکو دایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٣/٢ ٣/١

یەکەم دوو لەسەر سێی بۆ هەیە، دوومیشان یەك لەسەر سێ.

٢— جیاوازی سەری خزمایەتی: بەوەی هەندێکیان لەسەری باوکەوەو، هەندێکیشیان لەسەری دایکەوە بن، لەم جۆرەشدا هێزی خزمایەتیو منالّی خزمی پشت بوون بەهای نابێت، هەموویان شایانی میراتیەکەن، ئەوەیان لەسەری باوکەوە بێت دوو لەسەر سێی بەردەکەوێت، سێ یەکیش بۆ

ئەوەیان دەبێت کەلەسەری دایکەوەیە، ئەوەی بەر هەر لایەکیان دەکەوێت لەنێوان ئەوانەی ئەو لایەدا بەش دەکرێت:

**میراتگرەکان:** کچی مام لەسەری دایکەوە    کوڕی خاڵ لەسەری دایكو باوکەوە

پشکە دیاریکراوەکان:   ٣/٢    ٣/١

کچەکە دوو لەسەر سێی بەر دەکەوێت چونکە خزمایەتیەکەی لەسەری باوکەوەیە، کوڕەکەش یەك لەسەر سێ چونکە خزمایەتیەکەی لەسەری دایکەوەیە.

**منالی مام و پور و خالْ و پور لەفیقهی جەعفەریدا:**

منالْەکانی ئەوانە –لەفیقهی جەعفەریدا– بەپێی ئەم بنەمایانەیە:

١- منالْەکانی مامو پورو خالْو پور لەجێگەی باوك و دایکیان دەبن کاتێك کە ئەوان لەژیاندا نەمابن، هەریەکەشیان بەشی ئەوەی بەر دەکەوێت کە چۆتە جێگای‌و خزمایەتیەکەی لەرێی ئەوەوەیە، منالی پور –خوشکی باوك– ئەگەر کچیش بێت دوولەسەر سێ دەبات، منالی خوشکی دایك ئەگەر کوڕیش بێت یەك لەسەر سێ دەبات:

**میراتگرەکان:** ژن    کچی پور –خوشکی باوك– کچی خاڵ

پشکە دیاریکراوەکان:   ٤/١    م(سێ بەش)

بەشەکان:   ١    ٢    ١

٢- منالْەکانی خالْو پور –خوشکی دایك لەمیراتی وەرگرتندا یەکسان دەبن‌و بنەمای بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ بەسەریاندا جێبەجێ ناکرێت هاوشێوەی باوك‌و دایکیان:

**میراتگرەکان:** (٥) کوڕی پور –خوشکی دایك– و (٤) کچی خاڵ

بنچینەی بابەتەکە(٩)یە

پشکە دیاریکراوەکان:   هەمووی (بەیەکسانی)    بۆ هەر یەکەیان بەشێك

٣- مناڵەکانی مامەو پور -خوشکی باوك- کەلەسەری دایكو باوکەوە بن یان تەنها لەسەری باوکەوە لەکاتی هاتنی نێرینەو مێینەیاندا بەیەکەوە ئەوا بەپێی بنەمای بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ میراتیەکەیان بەسەردا دابەش دەکرێت:

**میراتگرەکان:** ژن کچی پور -خوشکی دایك- کوڕی پور -خوشکی دایك-

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ م (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)

پشکەکان: ١ ٢ ١

٤- مناڵەکانی ئەو مامو پورانەی کەتەنها لەسەری دایکەوەن وەك منالّی خاڵو پورەکان -خوشکی دایك- بەیەکسانی بەشیان دەکەوێت:

**میراتگرەکان:** ژن کوڕی مام لەسەری دایکەوە (٢) کچی مام لەسەری دایکەوە[١]

پشکە دیاریکراوەکان:٤/١ م(بەیەکسانی) بۆ هەریەکەیان بەشێك

پشکەکان: ١ ٣

لەکۆتاییدا وا بەپەسەند دەزانم بۆ ئەوانەی کەدەمارگیری مەزهەبی بینایی کوێر نەکردوون، قسە لەسەر هەندێ لە جێبەجێکردنەکانی خزمانی سکیی بکەم بەمجۆرە:

**یەکەم:** دانانی کچەزا بەخزمی دوورو پێشخستنی مامەکانو منالّەکانیان بەسەریاندا لەمیراتیدا پێچەوانەی دادگەری خوداییە بەپێی ئەم بەڵگانە:

أ- بەڵگەی زمانەوانی: ﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَآؤُكُمْ وَأَبناؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعاً فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيما حَكِيماً﴾[٢].

---

[١] (اللمعة وشرحها) سەرچاوەی پێشوو٢/٣٢٣.

[٢] النساء : ١١

دەستەواژەی (الولد) لەم ئایەتەدا بەمانا زمانەوانیەکەی هاتووە، واتە بەجۆرێکە کورو کچیش دەگرێتەوە، جا بۆچی سەبارەت بەمناڵەکانی کۆچکردووەکە (کوڕوکچی) بەمانا زمانەوانیەکە لێك بدرێتەوە، بەڵام بۆ نەوەکان بەمانا عورفیەکە لێك بدرێتەوە، بەشێوەیەك کوڕەزا و بەرەوخوارتر بگرێتەوە، ئەم گۆڕانە لەلێکدانەوە هیچ پاساوێکی نیە جگە لەکەوتنە ژێر کاریگەری نەریتی نەفامی کە دەڵێت:

بنونا بنو أبناءنا وبناتنا بنوهن أبناء الرجال الأباعد

کوڕەکانمان و کوڕی کوڕەکانمان کوڕمانن

کچەکانمان مناڵەکانیان رۆڵەی پیاوانێکی دوورن

ب- بەڵگەی زانستی: بەڵگە نەویستە کەخوای گەورە مرۆڤ لەدوو پێکهاتە دروست دەکات، یەکێکیان کە تۆوی پیاوە لەرووی زانستیەوە پێی دەوترێت (الحیمن)، دووەمیش هێلکۆکەی ئافرەتە، ئەم دوو پێکهاتەش لە کرۆکی خوێن دروست دەبن کەئەویش لە کرۆکی خواردەمەنی پێکهاتووەو خۆراکەکەش لە پوختەی خاکەوە بەرهەم هاتووە (سلالة من طين)، خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾ (1)، لەئایەتێکی دیکەشدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾ (2).

لەرووی کرۆك و پێکهاتەوکاریگەرییەوە هیچ کامیان لەویان باشتر نیە، ئەوەی خەڵکانی سەردەمی نەفامی وتوویانە: (بنونا بنو أبنائنا، وبناتنا بنوهن أبناء رجال الأباعد) هەڵەیەکە ناکرێت چاوپۆشی لێ بکرێت، هەروەها کەوتنە ژێر کاریگەری بۆچوونەکانی سەردەمی نەفامی لەجیاوازیکردن لەنێوان ئەو دوو پێکهاتەدا پێچەوانەی فەرمایشتی خوای گەورەیە: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾ (3)، واتە: بەرێزترینتان لای

---

1 الروم:٢٠

2 المؤمنون:١٢

3 الحجرات:١٣

خوای گەورە ئەو کەسەتانە کەلەهەمووتان بەتەقوا ترە، بەهەمان شێوە پێچەوانەی فەرموودەی پێغەمبەریشە: ((الناس سواسية كأسنان المشط))، واتە: مرۆڤەکان یەکسانن وەك ددانەکانی شانە.

ج- بەلگەی کۆمەلایەتیو هاوسۆزی گیانی لەرووی خزمایەتیەوە: بۆ نمونە کەسێك شتێکی هەبێت لەپێویستی خۆی زیاتر بێتو بیەوێت بیکاتە دیاری بۆ خزمێکی، لەیەك کاتدا کوڕێکی مامی و کوڕی کچەکەی بێنە سەردانی، کوڕی کچەکەی هەڵدەبژێرێت ئەم دیاریەی پێشکەش بکات چونکە لەرووی خزمایەتی نەسەبیو بەزەیی و پەیوەندی گیانیەوە نزیکترە بۆی.

لەبەر رۆشنایی ئەم بەلگانەدا وای دەبینم ئەوەی زانایانی ئیمامی بۆی چوون کە کچەزا دەچنە جێگەی دایکیانوئەوەی بۆ دایکیان بێت گەر ئەو خۆی لەژیاندا بووایە پێیان دەدرێت لە میراتیەکە بۆ چوونێکی راستو دروستە.

**دووەم:** لە کاریگەریەکانی دیکەی نەفامییە بوترێت کە برای دایكو باوکی دەبێتە بەشبڕی خوشکی دایكو باوکی لەمیراتیدا کاتیّ لەیەك بابەتی میراتیدا بەیەکەوە بێن، بۆ نمونە: کەسێك مرد، میراتگرەکانی تەنها کوڕی برایەکی دایكو باوکی و کچی برایەکی دایكو باوکی بوون، ئەو دووانە خوشكو برای یەك دایكو باوکن، کوڕی برا دایكو باوکیەکە دەبێتە بەشبڕی خوشکە دایكو باوکیەکەی، چونکە ئەم لە خزمانی پشتەو کچەکەش لەخزمانی سکیی یە، ئەمەش پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە کە میراتی تێیدا لەسەر بنەمای خزمایەتیو هاوسەرگیری بڕیاری لەسەر دراوە، نەك لەسەر بنەمای نێرو مێیەتی، یان لەسەر ئەو بنەمایەی میراتگرەکە لەخزمانی پشت بێت یان خزمانی سکیی، لەنزیكو دوور شتێك نەهاتووە ئاماژە بێت بەو جیاوازییە، هەروەها پێچەوانەی دادپەروەرییە، چونکە مێینە بەهۆی پێکهاتەی جەستەییەوە لەپێشترە بەوەی لەبەرچاو بگیرێت چونکە توانای کەمترە بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانی، هەروەك باسمان کرد قورئانی پیرۆزو فەرموودەکان نکوڵیان لە دەمارگیری نەفامیو جیاوازیکردن لەنێوان نێرو مێدا کردووە.

راستتر ئەوەیە کە زانایانی فیقهی ئیمامی بۆی چوون کە کوڕەزاو کچەزا دەچنە جێگای باوکو دایکیان لەمیراتیداو ئەوەی بۆ ئەوان هەبێت گەر لەژیاندا بمانایە بەمان دەدرێت.

**هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی لەریزبەندی میراتگران:**

لەمادە (٨٩)ی یاسای باری کەسیی بەرکاردا هاتووە:

میراتگرانی خزمو چۆنیەتی میراتی وەرگرتنیان:

١- دایكو باوكو منداڵەکانیانو بەرەوخوارتر، بۆ نێر دووهێندەی مێینە.

٢- باپیرەکانو داپیرەکانو براکانو خوشکەکانو منداڵی براو خوشکەکان.

٣- مامەکانو پوورەکان-خوشکانی باوك-و خاڵەکانو پورەکان -خوشکانی دایك-و خزمانی سکیی.

٤- خوشکی دایكو باوکی وەك برای دایكو باوکی دادەنرێت لە بەشبرکردندا.

ئەو ریزبەندییەی لەم مادەیەدا کراوە رووکارەکەی وا دەردەخات کە یاسادانەر بۆچوونی فیقهی جەعفەری وەرگرتووە کە میراتگرەکان بۆ سێ پلە دابەش دەکات:

**پلەی یەکەم:** دایكو باوكو منداڵەکانیانومنداڵی منداڵەکانیانو بەرەوخوارتر.

**پلەی دووەم:** باپیرەکانو داپیرەکانو براکانومنداڵەکانیانو بەرەوخوارتریش، خوشکەکانو منداڵەکانیانو بەرەوخوارتریش.

**پلەی سێیەم:** مامەکانو پورەکان-خوشکانی باوك-و خاڵەکانو پورەکان - خوشکانی دایك-و منداڵەکانی ئەوانەو بەرەوخوارتریش.

هەر پلەیەك بە هۆی پلەکەی پێش خۆیەوە لەمیراتی وەرگرتن بەشبراو دەکرێت، ئەگەر کەسێك لەپەلەی یەکەمدا هەبوو ئەوا هیچ کەس لەپلەی دووەمو سێیەم میراتی بەرناکەوێت، خۆ ئەگەر لەپلەی دووەمدا میراتگرێك هەبوو ئەوا لەپلەی سێیەمدا کەس میراتی پێنادرێت.

بەڵام ئەم رووکارە مەبەست نیەو یاسادانەری عێراقی ریزبەندی فیقهی جەعفەری وەها نەهێناوە لەبەر ئەم هۆیانە:

١- ئەوەی لەبڕگەی (٣)ی مادە (٨٩)دا هاتووە لەگوزارشتی (خزمانی سکیی)، چونکە فیقهی جەعفەری دان بەم زاراوەیەدا نانێتو میراتگرانیش دابەش ناکات بۆ خاوەن بەشی دیاریکراوو پشتو خزمانی سکیی.

٢- هەموارکردنەوەی هەشتەم ژمارە (٣٤)ی ساڵی ١٩٨٣ بڕگەی چوارەمی زیاد کردووە بۆ مادە (٨٩) ئەمەش پێچەوانەی ئەوە، کەوا بوو وەرگرتنی ریزبەندی جەعفەری بەدەرە لەم هەموارکردنەوەیە، چونکە خوشکی دایکو باوکی لەو فیقهەدا هەمان حوکمی برای دایکو باوکی هەیە.

٣- هەمواری دووەمی یاسای باری کەسیی ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٧٨ کەبڕیاریداوە کە کچ وەك کوڕە ئەوکاتەی کوڕ نەبێت، چونکە گەر ریزبەندی فیقهی جەعفەری وەربگرین ئەم هەموارکردنە هیچ پاساوێکی نیە، لەبەر ئەوەی ئەم ریزبەندییە ئەوەی لەهەموارکردنەوەکەدا هاتووە سەبارەت بە دانانی کچی وەك کوڕ کاتێ کوڕ نەبێت تێیدا هاتووە.

٤- بڕیاری دادگای تەمیز ژمارە ١١/کەسیی/١٩٦٤لە ١٩٦٤/٣/٢٨ کە تێیدا جەخت کراوەتەوە یاسادانەری عێراقی بەو دەقە مەبەستی روونکردنەوەی میراتگرانی خزم بووە، مەبەستی دابەشکردنی میراتگران نەبووە بۆ چەند چینێك بەشێوەیەك کە هەر چینێك چینی دوای خۆی بەشبڕاو دەکات.

# بەندی سێیەم
# پرۆسەکانی دیاریکردنی
# بڕی پشکی هەر میراتگرێك

.

چوار باس لەخۆ دەگرێت:

باسی یەکەم: بنچینەی بابەتەکان و ئەوەی بەرزکردنەوە هەڵدەگرێت و ئەوەی بەرزکردنەوە هەڵناگرێت.

باسی دووەم: راستکردنەوەی بابەتەکان و گێڕانەوە تێیاندا.

باسی سێیەم: دەرچوون و سڕینەوە.

باسی چوارەم: گلدانەوە (الاحتیاط) لەدابەشکردنی میراتیەکاندا.

## دەستپێک

پاش دڵنیابوون لەژمارەی ئەو میراتگرانەی شایستەی میراتیەکەن‌و، پلەی خزمایەتیان‌و ئەو سەرەی کەلێیەوە دەگەنەوە بەکۆچکردووەکەو زانینی بڕی پشکەکانیان، ئەمجا دەست دەکرێت بەدابەشکردنی -بەشێوەیەکی تیۆری- بۆ ژمارەیەك بەش، ئەم ژمارەیەش دەبێتە بنچینە بۆ دابەشکردنی میراتیەکە، کە لای زانایان بە "اصل المسألة" یان "اصل الفريضة" بنچینەی بابەتەکە ناودەبرێت، هەر ئەم بنچینەیەش -هەردەم- بچوکترین ژمارەی پشکەکانی میراتیەکەیە، بەجۆرێك کە هەر پێرێك لەمیراتگرەکان دەتوانن پشکەکانی خۆیان ببەن بەبێ ئەوەی هیچی لێ بمێنێتەوە.

هەڵبژاردنی ئەم ژمارەیەش بۆ بنچینەی بابەتەکە شتێکی هەڕەمەکی یان چۆنیەتی نیە، بەڵکو بەپێی بنەما گشتیە چەسپاوەکانی زانستی میراتی دەبێت.

پاشان ئەو بڕەی کە هەریەك لەپێرێك لەپێرەکانی میراتگران شایستەیەتی لەوانەیە دابەش نەکرێت بەسەر ئەندامەکانی ئەو پێرە یان زیاتر بەبێ ئەوەی لێی بمێنێتەوە، ئەمەش وا دەخوازێت دووبارە چاو بەو ژمارەیەدا بخشێندرێتەوە کەهەڵبژێردراوەو گۆڕانی تێدا بکرێت، بەجۆرێك کەبەشی هەر پێرێك بتواندرێت دابەش بکرێت بەسەر ئەندامەکانیدا بەبێ ئەوەی هیچی لێ بمێنێتەوە، ئەم گۆڕانکاری تێدا کردنە بە راستکردنەوەی بابەتەکە "تصحيح المسألة" ناودەبرێت.

لەلایەکی دیکەوە لەوانەیە کورتهێنان لەبەشی هەندێك میراتگردا لەوەی کە خوای گەورە دیاری کردووە رووبدات، گەر میراتیەکە لەسەر بنەمای ژمارە هەڵبژێردراوەکە بۆ بنچینەی بابەتەکە دابەش بکرایە، بۆ دەرباز بوون لەوە پێویستە گۆڕانی تێدا بکرێت بەوەی ژمارەیەکی گەورەتر هەڵبژێردرێت کە ئەو کورتهێنانە پڕ بکاتەوە، ئەم

گۆڕانکاریەش لای زانایان بە: بەرزکردنەوە (العول) ناوبراوە، ئەویش بریتیە لە: زیادکردنی ژمارەی پشکەکانو کەمهێنانی بڕەکەی.

بەپێچەوانەی ئەمەوە لەوانەیە پاش دیاریکردنی بڕە بەشی هەر میراتگرێك بەشی لێ بمێنێتەوە، لێرەشدا دەبێت گۆڕانکاری بکرێتو ژمارەیەکی بچوکتر هەڵبژێردرێت، بەجۆرێك هیچ لەپشکەکان زیاد نەبێت، ئەمەش بە گێڕانەوە (الرد) ناودەبرێت: ئەمیش بریتیە لە: کەمهێنان لەژمارەی پشکەکانو زیادکردنی بڕەکەی، کەوابوو گێڕانەوە پێچەوانەی بەرزکردنەوەیە.

سەرەڕای ئەوە لەوانەیە میراتگرەکان لەنێو خۆیاندا ڕێکبکەون لەسەر دەرچوونی هەندێکیان لەسەر داوای هەندێکی تریان لەبەرانبەر بڕێکی دیاریکراو لەمیراتیەکە یان شتی دیکە، لەم حاڵەتەشدا پێویستە ئەو ژمارەیەی کەبۆ بنچینەی بابەتەکە هەڵبژێردراوە گۆڕانکاری تێدا بکرێت یان ئەوەی کە پێویستە هەڵببژێردرێت گەر ئەو ڕێککەوتنە نەکرایە، ئەمەش لای زانایان بە دەرچوون (التخارج) ناسراوە، ئەویش بریتیە لە: ڕێککەوتنی میراتگرێك یان زیاتر لەسەر ئەوەی لە میراتیەکە دەربچێتو پشکەکەی خۆی تێیدا نەبات بەو مەرجەی لەبەرانبەر ئەوەدا شتێکی لەمیراتیەکە یان لە شتی دیکە پێ بدرێت.

پاشان وا ڕێکدەکەوێت کە هەندێك لەمیراتگرەکان پێش جیاکردنەوەو دابەشکردنی میراتیەکە بەسەر ئەوانەدا کە شایستەینی بمرن، لەوکاتەدا پێویست دەکات گۆڕانکاری لەژمارەی هەڵبژێردراو بۆ بابەتی کۆچکردووی پێشتر بکرێت، بەجۆرێك ئەو حوکمە نوێیانە لەبەرچاو دەگیرێت کەبەهۆی کۆچی دوایی میراتگرەکەی دواتر هاتۆتە ئاراوە بەر لەدابەشکردنی میراتیەکە لەچۆنیەتی میراتگریدا.

ئەم گۆڕانکاریەش بە سڕینەوە (المناسخة) ناودەبرێتو بریتیە لە: "گوێزرانەوەی بەشی هەندێك لەمیراتگرەکان بەهۆی مردنیەوە پێش دابەشکردنی میراتیەکە بۆ میراتگرەکانی".

لەکۆتاییدا لەوانەیە یەکێك لەمیراتگرەکان رەوشـێکی تایبـەتی هـەبێت، بـەجۆرێك ئـاڵۆزیو نادیارییـەك دەورەی دابێـت، بـەهۆی ئـەوەی هێشـتا کۆرپەلەیـەو لـەدایك نەبووە، یان ونبووەو داهاتووی دیار نیە، یان مرۆڤێکی نائاساییە کە رەگەزەکەی دیار نیە نێرە یان مێ یـە.. هـەموو ئەوانـە وا لـەدادوەر دەکـات کـە لـەکاتی دابەشـکردنی میراتیەکەدا گلدانەوە (احتیاط) بکات، بەشـێوەیەك هـیچ کامیـان زیـاتر لـەوانی دیکـە نابات کە شایستەینی.

پاش ئەم دەستپێکە لەسەرمان پێویستە ناونیشـانی دەروازەی کۆتـایی بـۆ چـوار باس دابەش بکرێت:

# باسی یەکەم
# بنچینەی بابەتەکان و ئەوەی بەرزکردنەوە هەڵدەگرێت و ئەوەی بەرزکردنەوە هەڵناگرێت

بنچـــینەی بابەتەکـــە: بریتیـــە لـــەژمارەی پشکەکانی میراتیەکە بـەجۆرێك کـە دەتوانـدرێت هەموو خاوەن بەشێك بەشی خۆی ببات، ئەمەش بەپێی چەند بنەمایەکی دیاریکراو ئەنجام دەدرێت لەوانەشـە گـۆڕانی تێـدا بکرێـت، بـۆ هەریـەك لـە بنچـــینەی بابەتـــەکانو بەرزکردنـــەوەیان دەروازەیەکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین:

# دەروازەی یەکەم

# بنچینەی بابەتەکان

بنچینەی بابەتەکان بەپێی یەکێك لەم سێ ڕیسایە هەڵدەبژێردرێت:

**ڕێسای یەکەم:** ئەگەر لەنێو میراتگرەکاندا یەك خاوەن پشکی دیاریکراو هەبوو، ئەوەی لەپشکەکەی ئەو دەمێنێتەوە کە دیارخەری پشکەدیاریکراوەکەیەتی دەبێتە بنچینەی بابەتەکە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | مێرد | براك | بنچینەی بابەتەکە (٢) |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ١ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | دایك | باوك | بنچینەی بابەتەکە (٣) |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ٢ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | ژن | براك | بنچینەی بابەتەکە (٤) |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ٣ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | دایك | کوڕ | بنچینەی بابەتەکە (٦) |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ٥ | |

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | ژن | کوڕ | بنچینەی بابەتەکە (٨) |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ٧ | |

**ڕێسای دووەم:** ئەگەر لەنێو میراتگرەکاندا زیاتر لەیەك خاوەن پشکی دیاریکراو هەبوو، ئەوا بچوکترین چەندجارەی هاوبەش دەبێتە بنچینەی بابەتەکە:

| **میراتگرەکان:** | مێرد | (٢) برای دایکی | برا ك | بنچینەی بابەتەکە(٦) |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٣/١ | م | |
| پشکەکان: | ٣ | ٢ | ١ | |

| **میراتگرەکان:** | مێرد | دایك | باوك | کوڕ | بنچینەی بابەتەکە(١٢) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٦/١ | ٦/١ | م | |
| پشکەکان: | ٣ | ٢ | ٢ | ٥ | |

| **میراتگرەکان:** | مێرد | دایك | کوڕ | بنچینەی بابەتەکە (١٢) |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٤/١ | م | |
| پشکەکان: | ٣ | ٢ | ٧ | |

| **میراتگرەکان:** | ژن | دایك | باوك | کوڕ | بنچینەی بابەتەکە(٢) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | ٦/١ | ٦/١ | م | |
| پشکەکان: | ٣ | ٤ | ٤ | ١٣ | |

**ڕێسای سێیەم:**

أ- ئەگەر میراتگرەکان هەموویان یەك جۆر بوون، وەك ئەوەی هەموویان کوڕ بن، یان تەنها کچ بن، یان برا لەسەری دایكو باوکەوە، یان برا لەسەری باوکەوە، یان برا لەسەری دایکەوە، یان تەنها کوڕی کوڕ بن، یان تەنها کچی کوڕ بن:

لێرەدا ژمارەی میراتگرەکان دەبێتە بنچینەی بابەتەکە، چونکە موڵکایەتی لێجێماوەکە وەك پشت تەنها بۆ ئەوان دەبێت، وەك ئەوەی لە کوڕەکان یان کوڕەکانی کوڕ و ئەو برایانەی لەسەری دایکەوە نین، یان وەك بەشی دیاریکراوو گێڕانەوە وەك بۆ کچەکانو، کچەکانی کوڕ هەیەو بەیەکسانی بەسەریاندا دابەش دەکرێت:

**میراتگرەکان:** (٥) کوڕ بنچینەی بابەتەکە (٥)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی وەك پشت

پشکەکان: بۆ هەر یەکەیان بەشێك.

**میراتگرەکان:** (٨) کچ بنچینەی بابەتەکە (٨)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی وەك پشکی دیاریکراوو گێڕانەوە

پشکەکان: بۆ هەریەکەیان بەشێك

**میراتگرەکان:** (٦) کچی برا بنچینەی بابەتەکە (٦)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی وەك پشکی دیاریکراوو گێڕانەوە

پشکەکان: بۆ هەریەکەیان بەشێك

**میراتگرەکان:** (٤) برای دایکی بنچینەی بابەتەکە (٤)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی وەك پشکی دیاریکراوو گێڕانەوە

پشکەکان: بۆ هەریەکەیان بەشێك

ب- ئەگەر میراتگرەکان تەنها ئەو نێرینەو مێینانە بوو کە پلەی خزمایەتیان وەك یەکە[1]: لێرەدا پاش دانانی هەر نێرینەیەك بە دووان دەبێتە بنچینەی بابەتەکەو، میراتیەکە بەپێی بنەمای "بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە" دابەش دەکرێت:

**میراتگرەکان:** (٥) کچ (٥) کوڕ بنچینەی بابەتەکە (١٥)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)

پشکەکان: بۆ هەر کوڕێك دوو بەش و هەر کچێك یەك بەش

---

[1] بەو مەرجەی کە مێینەکان ببنە پشت (واتە بەهۆی نێرینەکانەوە) ئەم ڕێسایە بەسەر ئەو براو خوشکانەدا جێ بەجێ ناکرێت کە لەدایکەوەن چونکە مێینەکان بەهۆی نێرینەکانەوە نابنە پشت.

**میراتگرەکان:** (٣) کوڕی کوڕ (٤) کچی کوڕ بنچینەی بابەتەکە(١٠)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)

پشکەکان: بۆ هەر کوڕێك دوو بەش و هەر کچێك یەك بەش

**میراتگرەکان:** خوشك ك برا ك بنچینەی بابەتەکە (٣)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)

پشکەکان: بۆ براکە دوو بەش خوشکەکەش یەك بەش

**میراتگرەکان:** (٤) برا لەباوکەوە، (٣) خوشك لەدایکەوە بنچینەی بابەتەکە(١١)

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە)

. پشکەکان:بۆ هەر نێرینەیەك دوو بەش و هەر مێینەیەکیش یەك بەش

# دەروازەی دووەم
## بەرزکردنەوە[1] و بنچینەی
## ئەو بابەتانەی شیاوە بۆی

جاری وا هەیە کەژمارەی پشکە شایستەکانی میراتگران زیاترە لە بچوکترین چەندجارەی هاوبەشی ژێرەی کەرتەکان، کە رادەی بەشی میراتگرەکان دەردەخات، لەم حاڵەتەدا دادوەر ناچار دەبێت کە ئەم ژمارەیە بەبنچینەی بابەتەکە دابنێت، لەبری بچوکترین چەندجارەی هاوبەش[2].

بەمەش کورتهێنانەکە بەر هەموو میراتگرێك دەکەوێت هەرکەسەو بەپێی رادەی پشکەکەی، ئەم کارەش هاوشێوەی کاری ژمێرارییە کاتێك قەرزەکان زیاتر دەبێت لەوەی کە قەرزارەکە هەیەتی بۆ دانەوەی قەرزەکەی، لێرەشدا لەبەر رۆشنایی دابەشکردنی ئەوەی هەیەتی بەسەر کۆی قەرزەکانیدا بۆ هەر خاوەن قەرزێك کەمتر لەوە دەداتەوە کە لێی قەرز کردووە.

---

[1] لە (الخرشي) (٤/٢١٠) دا هاتووە: " (العول بفتح العين واسكان الولو)بریتیە لەوەی کاتێك سامان کەمتر بوو لەپشکەکانی خاوەن پشکەدیاریکراوەکان بابەتەکە بەرز دەکرێتەوە بەو مانایەی پشکەکان بەرز دەکرێنەوە بەجۆرێك کە کەمهێنانەکە هەمووان بگرێتەوە هەرکەسەو بەپێی بڕی پشکەکەی (واتە بڕی پشکە دیاریکراوەکەی)، چونکە هەر کەسیان ئەگەر بەتەنیا بوایە پشکەکەی خۆی بەتەواوی دەبرد، جا ئەگەر سامانەکە کورتی هێنا پێویستە لەسەریان بەپێی بڕی مافەکانیان وەك خاوەن قەرزو راسپاردن بەشی بکەن ".

[2] خستنە رووی ئاسایی بەرزکرنەوەو گێرانەوە بریتیە لەوەی بەشوێن یەکدا بێن بەوەی یەکێکیان یەکسەر پاشی ئەوەیتریان بێت، چونکە ناوەرۆکی هەر یەکەیان پێچەوانەی ناوەرۆکی ئەویتریانە، بەڵام حوکمەکانی بەرزکرنەوەمان پێش راستکرنەوەی بابەتەکان خستە روو، چونکە بابەتی راستکرنەوە لەگەڵ بەرزکرنەوەکەیدا دەبێت ئەگەر بەرزکرنەوەی تێدا بوو، لەبەر ئەوە واباشە بەرزکرنەوە بزاندرێت پێش دەستکردن بە روونکرنەوەی رێساو حوکمەکانی راستکرنەوەی بابەتەکان.

لەراستیدا ئەم زیادەیەی ژمارەی پشکەکان لە بنچینەی بابەتەکە پاش یەکخستنی ژێرەی کەرتەکانو دۆزینەوەی بچوکترین چەندجارەی هاوبەش بۆی دەزاندرێت، لەم کاتەدا دەردەکەوێت سەرەی کەرتەکە گەورەترە لەژێرەکەی، لێرەشدا سەرەی کەرتەکە–بەبێ ژێرە– دەکرێتە بنچینەی بابەتەکە، ئەم پرۆسەیەش بە بەرزکردنەوە (العول) ناودەبرێت[1].

بەپێی خوێندنەوی زانایان ئەم دیاردەیە تەنها لەسێ بنچینەدا روودەدات، کە ئەوانیش(٦، ١٢، ٢٤) لە هەشت بنچینەکە کە کەبریتین لەم حەوتە (٢، ٣، ٤، ٦، ٨، ١٢، ٢٤) لەگەڵ ژمارەی میراتگرەکان لەو حاڵەتانەی کە ژمارەکەیان دەبێتە بنچینەی بابەتەکە، هەروەك پێشتر لەبنچینەی بابەتەکاندا ئەوەمان بەدرێژی خستە روو.

[1] بابەتێکی میراتی روونەدلوە لەسەردەمی پێغەمبەرایەتیو، سەردەمی فەرمانڕوایەتی ئەبوبەکردا کە بەرزکرنەوەی تێدا بێت، بەلکو لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابدا روویدا، کاتێك بابەتێکی هێنرایە خزمەت کەمیرلتگرەکان تێیدا تەنها مێردو دوو خوشك بوون بەبێ دایك، دیارە لێرەدا بەشی مێردەکە ٦/١ بەشی دوو خوشکەکەش٣/٢ بەمەش ژمارەی پشکە شایستەکان زیاترە لەبنچینەی بابەتەکە (٦). کاتێك راوێژی لەگەڵ هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) کرد عەباسی کوڕی عەبدولموتەڵیبو عەلی کوڕی ئەبوتاڵیب یان زەیدی کوڕی سابت بەپێی گێڕانەوە جیاوازەکان ئاماژەیان بەوەدلوە کار بەبەرزکردنەوە بکات پێوانە بەبەشی خاوەن قەرزەکان، ئەو کەسەی کۆچی دوایی کردو لەپاش خۆی بڕی شەش هەزار دیناری بەجێهێشت، پیاوێك سێ هەزاردینار قەرزی لای بوو، پیاوێکی دیکەش چوار هەزار دیناری قەرزی لای بوو، ئایا سامانەکەی ناکرێتە حەوت بەش؟ لەبەر ئەوە عومەر فەرمانی کرد بەبەرزکردنەوە، زۆرینەی هاوەڵانو شوێنکەوتووانو زۆرینەی پێشەوایانو موجتەهیدەکانیش داوەرییەکانیان بەوجۆرە دەکرد، ئیبن عەباس نەیاری کارکردن بەبەرزکرنەوە بوو و وتی: ئەوەی خوا پێشی خستووە پێش دەخرێت (ئەویش بریتیە لەوانەی کەتەنها بەبەشی دیاریکراو میراتیان بەردەکەوێت، وەك ژنو مێرد، دایك، برای دایکی، داپیرە). ئەوەشی خوا دوای خستووە دوا دەخرێت (ئەویش ئەوانەن کە جارێك وەك خاوەن پشکی دیاریکرلو میرلتیان دەکەوێتو جارێکی تر بە پشت وەك کچ و، کچی کوڕ، خوشکەکان کەلە لەدایکەوە نین). هەر یەك لە تیمی یەکەم بەشی خۆیان بەتەواوەتی دەبەن، کورتهێنانەکە بەشی ئەوانە دەبێت کەلەتیمی دووەمە. بڕوانە: (المحلی ٩/٢٦٢– ٢٦٤). زانایانی جەعفەریو زاهیریش کار بەم بۆچوونە دەکەن.

## ئەو بنچینانەی بەرزکردنەوەیان تێدا دەکرێت:

**یەکەم: ژمارە (٦)، کە چوارجار بەرزکردنەوەی تێدا دەکرێت:**

أ- ٦- ٧

**میراتگرەکان:** <u>مێرد</u> <u>(٢) خوشك ك</u>

پشکە دیاریکراوەکان: ٢/١ ٣/٢ (٢/١+ ٣/٢ =٦/٧)

بنچینەی بابەتەکە (٦) و ژمارەی پشکەکان (٧).

بۆ مێرد ٧/٣ لەبری ٦/٣، بۆ دوو خوشکەکە ٧/٤ لەبری ٦/٤.

ب- ٦- ٨

**میراتگرەکان:** <u>مێرد</u> <u>(٢) خوشك ك</u> <u>دایك</u>

پشکە دیاریکراوەکان: ٢/١ ٣/٢. ٦/١

پشکەکان: (٢/١+ ٣/٢ + ٦/١ = (٣+٤+١)/٦ = ٦/٨)

بنچینەی بابەتەکە ٦، پشکەکان ٨.

بۆ مێرد ٨/٣ لەبری ٦/٣، بۆ دوو خوشکەکە ٨/٤ لەبری ٦/٤، بۆ دایك ٨/١ لەبری ٦/١.

ج- ٦- ٩

**میراتگرەکان:** <u>مێرد</u> <u>(٢) خوشك ك</u> <u>دایك</u> <u>خوشك لەدایکەوە</u>

پشکە دیاریکراوەکان: ٢/١ ٣/٢ ٦/١ ٦/١

پشکەکان: (٢/١+ ٣/٢+ ٦/١+ ٦/١= (٣+٤+١+١)/٦= ٦/٩)

بنچینەی بابەتەکە (٦) پشکەکان (٩)، بۆ مێرد ٩/٣، بۆ دوو خوشکەکە ٩/٤، بۆ دایك ٩/١، بۆ خوشکەکە لەدایکەوە ٩/١.

د- ٦- ١٠

**میراتگرەکان:** میرد (٢) خوشك لەباوکەوە دایك (٢) برا لەدایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٢/١ ٣/٢ ٦/١ ٣/١

پشکەکان: (٢/١+ ٣/٢+ ٦/١+ ٣/٢ (٣+٤+١+٢)/٦ = ٦/١٠)

بنچینەی بابەتەکە (٦) پشکەکان (١٠)، بۆ مێرد ٣/١٠، بۆ دوو خوشکەکە ٤/١٠، بۆ دایك ١/١٠، بۆ دوو براکە٢/١٠.

**دووەم: ژمارە (١٢) سێ جار بەرزکردنەوە تێیدا دەبێت:**

أ- ١٢- ١٣

**میراتگرەکان:** ژن (٤) خوشك ك دایك

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ ٣/٢ ٦/١

پشکەکان: (٤/١+ ٣/٢+ ٦/١ =(٣+٨+٢)/١٢= ١٢/١٣)

بنچینەی بابەتەکە (١٢)، پشکەکان(١٣)، بۆ ژنەکەی ٣/١٣، بۆ خوشکەکان ٨/١٣، بۆ دایك ٢/١٣.

ب- ١٢- ١٥

**میراتگرەکان:** ژن (٢)خوشك لەباوکەوە دایك برایەك لەدایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ ٣/٢ ٦/١ ٦/١

پشکەکان: (٤/١+ ٣/٢+ ٦/١+ ٦/١= (٣+٨+٢+٢)/١٢= ١٢/١٥)

بنچینەی بابەتەکە (١٢) و پشکەکان (١٥)، بۆ ژنەکەی (٣/١٥)، بۆ دوو خوشکەکە (٨/١٥)، بۆ دایك (٢/١٥)، بۆ برا (٢/١٥).

ج- ١٢- ١٧

**میراتگرەکان:** ژن (٤)خوشك لە باوکەوە دایك (٢)برا لەدایکەوە

پشکە دیاریکراوەکان: ٤/١ ٣/٢ ٦/١ ٣/١

پشکەکان: (٤/١+ ٣/٢+ ٦/١+ ٣/١= (٣+٨+٢+٤)/١٢= ١٢/١٧)

بنچینەی بابەتەكە (١٢) و پشكەكان (١٧)، بۆ ژنەكەی( (١٧/٣)، بۆ خوشكەكان(١٧/٨)، بۆ دایك (١٧/٢)، بۆ براكان(١٧/٤).

**سێیەم: ژمارە (٢٤) یەكجار بەرزكردنەوە تێیدا دەبێت:**

(٢٤-٢٧)

| **میراتگرەكان:** | باوك | دایك | (٢) كچ | ژن | چەندجارەی هاوبەش |
|---|---|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | ٦/١ | ٣/٢ | ٨/١ | بچوكترین (٢٤) |

پشكەكان: (٦/١ +٦/١ +٣/٢ +٨/١= (٤+٤+١٦+٣)/٢٤= ٢٧/٢٤)

بنچینەی بابەتەكە (٢٤) و پشكەكان (٢٧)، بۆ باوك (٢٧/٤)، بۆ دایك(٢٧/٤)، بۆ كچەكان(٢٧/١٦)، بۆ ژنەكەی(٢٧/٣).

**فیقهی جەعفەری:**

زانایانی جەعفەری بۆچوونی ئبن عەباسیان وەرگرتووەو لای ئەوان بەرزكردنەوە نیە، بەڵكو وتویانە: ئەوەی خوای گەورە پێشی خستووە پێش دەخرێت، وەك ئەوەی لەپەراوێزەكەدا ئاماژەمان بەدرێژەی ئەمە دا.

پاشان زۆرینەی ئەو بابەتانەی باسمان كرد: تێیاندا دایك دەبێتە بەشبڕی خوشكو برا، چونكە دایك لەپلەی یەكەمە، بەمەش پێشبینی ناكرێت پشكەكان لەبڕی خۆیان كەمتر دەربچن.

وایدەبینم كە بۆچوونی زۆرینەی زانایان تێگەیشتواترو نزیكترە لەدادپەروەرییەوە، چونكە گێڕانەوە لای ئەوان هەمووان دەگرێتەوە —جگە لەژن و مێرد— بەهەمان شێوە پێویستە كورتهێنانیش هەمووان بگرێتەوە.

# باسی دووەم
# ڕاستکردنەوەی بابەتەکان و گێڕانەوە

ڕاستکردنەوەی بابەتەکانی میراتیو پرۆسەی گێڕانەوە تێیاندا دوو بابەتی گرنگن، بۆ هەر یەکەیان دەروازەیەکی سەربەخۆ تەرخان دەکەین.

.

# دەروازەی یەکەم
## راستکردنەوەی بابەتەکان

راستکردنەوەی بابەتەکان: واتە گۆڕینی ژمارەی پشکەکان تێیدا بەژمارەیەکی گەورەتر، بەجۆرێك کەبەشی هەر پێڕێکیان بەسەر ئەندامەکانیدا بەپێی بنەما فیقهیە دیاریکراوەکان دابەش بکرێت بەبێ ئەوەی هیچی لێ بمێنێتەوە.

مایەوەش یان ئەوەتا هی پێڕێکە لەمیراتگران یان زیاتر، بۆ هەر یەکەشیان پێودانگو حوکمی خۆی هەیە.

یەکەم: ئەگەر ئەوەی مایەوە هی یەك پێڕ بوو ئەوا بنچینەیەك لەم بنچینانە پەیڕەو دەکرێت:

أ- ئەگەر لەنێوان پشکەکانو پێڕەکەدا جیاوازی (تباین) هەبوو: بەوەی کە هەردووکیان ژمارەی تاك بوونن، یان یەکێکیان تاك بوو ئەوی دیکەیان جوت بوو: لێرەدا ژمارەی ئەندامانی پێڕەکە لەگەڵ بنچینەی بابەتەکەدا لێك دەدرێت یان لەگەڵ بەرزبووەکەی ئەگەر بەرزبوونەوەی تێدا بوو:

**میراتگرەکان:** باوك دایك (٥)کچ بنچینەی بابەتەکە (٦) راست

پشکە دیاریکراوەکان: ٦/١ ٦/١ ٣/٢ دەردەچێ بەلێکدانی ئەنجامی

پشکەکان: پێش راستکردنەوە ١ ١ ٤ ژمارەی کچەکان (٥×٦)

پاش راستکردنەوە ٥ ٥ ٢٠ = ٣٠

| میراتگرەكان: | ژن | باوك | دایك | (٣)كچ | بنچینەی بابەتەكە (٢٤) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ١/٨ | ١/٦ | ١/٦ | ٢/٣ | بەرزكراوەتەوە بۆ (٢٧)[1] |
| پشكەكان: | | | | | راست دەردەچێت بە لێكدانی |
| پێش راستكردنەوە | ٣ | ٤ | ٤ | ١٦ | ئەنجامی ژمارەی كچەكان |
| پاش راستكردنەوە | ٩ | ١٢ | ١٢ | ٤٨ | تێیدا (٣×٢٧) = (٨١) |

ب- ئەگەر گونجان لەنێوانیاندا هەبوو: ئەگەر خێزان بوو بەپێی گونجان[2] ژمارەی پێرەكە لەگەڵ بنچینەی بابەتەكە یان لەگەڵ بەرزبوو(عول)ەكەی لێك دەدرێت:

| میراتگرەكان: | داپیرە | (٤) برا لەدایكەوە | برا ك | بنچینەی بابەتەكە(٦) |
|---|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ١/٦ | ١/٣ | م | راست دەكرێتەوە بە |
| پێش راستكردنەوە: | ١ | ٢ | ٣ | لێكدانی نیوەی ژمارەكە لەگەڵ براكان لەدایكەوە |
| پاش راستكردنەوە: | ٢ | ٤ | ٦ | (٢×٦)=(١٢) |

| میراتگرەكان: | ژن | دایك | باوك | (٦) كچ | بنچینەی بابەتەكە(٢٤) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ١/٨ | ١/٦ | ١/٦ | ٢/٣ | بەرزكراوەتەوە بۆ (٢٧) |
| پێش راستكردنەوە: | ٣ | ٤ | ٤ | ١٦ | راست بووە بە لێكدان بەپێی |
| پاش راستكردنەوە: | ٩ | ١٢ | ١٢ | ٤٨ | كچەكان تێیدا(٣×٢٧)=(٨١)[3] |

---

[1] پشكە شایستەكان: (١/٨+ ١/٦+ ١/٦+ ٢/٣)= (٣+٤+٤+١٦)/٢٤= ٢٧/٢٤ ئەوا سەرەی كەرتەكە دەكرێتە بنچینەی بابەتەكە لەبری ژێرەكەی.

[2] مەبەست لەگونجاندن بریتیە لە ئەنجامی دابەشكردنی ژمارەكە بەسەر بەشكەری هاوبەشدا. ژمارەی براكان (٤) لەگەڵ پشكەكەیان (٢) پێش راستكردنەوە، گونجان لەنێوانیاندا هەیە بەوەی كە ژمارەیەكی هاوبەش لەنێوانیاندایە كەئەویش ژمارە (٢) گونجاندنی براكان (٤÷٢) لەگەڵ بنچینەی بابەتەكەدا لێك دەدرێت (٢×٦)= (١٢).

[3] پشكە شایستەكان: (١/٨+ ١/٦+ ١/٦+ ٢/٣)= (٣+٤+٤+١٦)/٢٤= ٢٧/٢٤ سەرەی كەرتەكە (پشكە شایستەبووەكان) دەكرێتە بنچینەی بابەتەكە لەبری ژێرە (چەندجارەی هاوبەش).

دووەم: ئەگەر شکانەوە (الانکسار) لەبەشی دوو پێڕی میراتگراندا روویدا: بەشی هەر پێڕێك بەژمارەکەیان بەراورد دەکرێت:

أ- ئەگەر گونجان هەبوو لەنێوانیاندا ئەوا پێڕەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ گونجانەکەی[1].

ب- ئەگەر نەگونجان ئەوا پێڕەکە وەك خۆی وازی لێدەهێندرێت.

پاشان دوای ئەو بەراوردەی خرایە روو هەر پێڕێك لەگەڵ ئەوی دیکەدا قبوڵ دەکرێت:

أ- ئەگەر هەردووکیان هاوشێوە بوون ئەوا یەکێکیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت یان لەگەڵ بەرزبووەکەی(بعولها) ئەگەر بەرزبوونەوەی تێدا بوو:

| **میراتگرەکان:** | دایك | (٦) برا لەدایکەوە | (١٢) خوشك | ك بنچینەی بابەتەکە(٦) |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/١ | ٣/٢ | بەرزکراوەتەوە[2] بۆ (٧) |
| پێش راستکردنەوە: | ١ | ٢ | ٤ | راست دەردەچێت بە (٢١)[3] |
| پاش راستکردنەوە: | ٣ | ٦ | ١٢ | |

---

[1] ئەگەر گونجانیان لە نیوە دابوو بەوەی هەردووکیان بەسەر (٢)دا دابەش دەبوون، ئەوا هەریەکەیان دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر نیوەی، ئەگەر لە سێیەکیش دەگونجان واتە دەکرا دابەش بکرێن بەسەر (٣)دا، ئەوا دەگەڕێنرێنەوە بۆ سەر سێیەکیان، ئەگەر گونجانەکەیان لە چواریەك دەبوو دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەر چوار یەکیو بەوشێوەیە.

[2] پشکە شایستەکان: (٦/١+ ٣/١+ ٣/٢)= (١+٢+٤)/٦= (٦/٧) سەرە بنچینەیە، ئەو برایانەی لەدایکەوەن دەگەڕێنرێنەوە بۆ نیوە (٣) لەبەر گونجانیان لەگەڵ ژمارەی پشکەکانیان پێش راستکردنەوە بەنیوە. ژمارەی خوشکەکانیش دەگەڕێندرێتەوە بۆ چواریەکیان (٣) لەبەر گونجانی چوار یەك لەگەڵ پشکەکانیان.

[3] ئەوەش ئەنجامی لێکدانی یەکێك لەدوو جۆرە هاوشێوەکەیە پاش بەراوردو گێڕانەوە لەو بابەتەی بەرزکرنەوەی تێدایە.

| میراتگرەکان: | دایك | (٥) برا لەدایکەوە | (٥) برا لەباوکەوە | بنچینەی بابەتەکە(٦)[1] |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/١ | م | ڕاست دەردەچێت بەئەنجامی |
| پێش ڕاستکردنەوە: | ١ | ٢ | ٣ | لێکدانی یەکێك لەو دوو پۆلە |
| پاش ڕاستکردنەوە: | ٥ | ١٠ | ١٥ | لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە |

(٥×٦)=٣٠

ب- ئەگەر بەیەکدا چوون لەنێوانیاندا هەبووئەوا زۆرەکەیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە یان بەرزبووەکەی(بعولها) لێك دەدرێت ئەگەر بەرزبوونەوەی تێدا بوو:

| میراتگرەکان: | دایك | (٨)برا لەدایکەوە | (٨)خوشك لەباوکەوە | بنچینەی بابەتەکە(٦)[2] |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/١ | ٣/٢ | بەرزکراوەتەوە بۆ (٧) ڕاست |
| پێش ڕاستکردنەوە | ١ | ٢ | ٤ | دەردەچێت بەلێکدانی ئەنجامی |
| پاش ڕاستکردنەوە | ٤ | ٨ | ١٦ | ژمارە گەورەکەیان لەبابەتەکەدا |

(٤×٧)= ٢٨

| میراتگرەکان: | مێرد | (٥) برا لەدایکەوە | (١٠)برا ك | بنچینەی بابەتەکە(٦) |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٣/١ | م | ڕاست دەردەچێت بەلێکدانی |
| پێش ڕاستکردنەوە | ٣ | ٢ | ١ | گەورەترین ژمارە لەبابەتەکەدا |
| پاش ڕاستکردنەوە | ٣٠ | ٢٠ | ١٠ | (١٠×٦) = ٦٠[3] |

---

[1] بەهۆی بوونی جیاوازی لەنێوان هەر جۆرێکو ژمارەی پشکەکانی، جۆرەکە وەك خۆی دەهێڵدرێتەوە، لەبەر ئەوەش دوو جۆرەکە هاوشێوەن یەکێکیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێك دەدرێت.

[2] پشکە شایستەکان (٦/١+ ٣/١+ ٣/٢)= (٦/٧) سەرە بە بنچینەی بابەتەکە دادەنرێت لەبری ژێرە، لەنێوان ژمارەی براکانو پشکەکانیاندا پێش ڕاستکردنەوە بەچواریەك گونجان هەیە بۆیە چواریەکیان وەردەگیرێت (٢). پاش ئەم کارە هەردوو جۆرەکە بەیەکدادەچن (٤، ٢) ئەمجا گەورەکەیان لەبابەتە بەرزبووەکە دەدرێت(٤×٧)=(٢٨) بەمەش بابەتەکە ڕاست دەکرێتەوە.

[3] لەبەر هەبوونی جیاوازی لەنێوان هەر جۆرێکو پشکەکانیدا پێش ڕاستکردنەوە ئەوا هەر جۆرەو وەك خۆی وازی لێ هێنراوەو ژمارە گەورەکەیان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێکدراوە (١٠×٦)= (٦٠).

ت– ئەگەر گونجاو بوون، ئەوا گونجانی یەکێکیان لەگەڵ تەواوی ئەوەی دیکەیان دەدرێت، پاشان ئەنجامەکەی لەبنچینەی بابەتەکە یان بەرزبووەکەی(بعولها) دەدەین ئەگەر بەرزبوونەوەی تێدا بوو:

| میراتگرەکان: | دایك | ١٢ برا لەدایکەوە | ١٦ خوشك ك | بنچینەی بابەتەکە(٦) |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/١ | ٣/٢ | بەرزکراوەتەوە بۆ(٧) |
| پێش راستکردنەوە | ١ | ٢ | ٤ | راست دەردەچێت بە (٨٤)[1] |
| پاش راستکردنەوە | ١٢ | ٢٤ | ٤٨ | |

| میراتگرەکان: | (٢) ژن | ژ(٨) برا ك | بنچینەی بابەتەکە(٤) |
|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٣/١ | م | راست دەردەچێت بە(٣٢)[2] |
| پێش راستکردنەوە | ١ | ٣ | |
| پاش راستکردنەوە | ٨ | ٢٤ | |

بۆ هەر ژنێکیان چوار بەش، بۆ هەر برایەکیش سێ بەش.

---

[1] پشکە شایستەکان (٦/١+ ٣/١+ ٣/٢)= (١+٢+٤)/٦= (٦/٧).
سەرە بەبنچینە دادەنرێت لەنێوان براکان و پشکەکانیاندا پێش راستکردنەوەی گونجان بەنیوە بۆیە نیوەیان وەردەگیرێت (٦)، لەنێوان خوشکەکان و پشکەکانیاندا پێش راستکردنەوەی گونجان بەچواریەك، بۆیە چواریەك وەردەگرن (٤)، هەردوو ژمارەی (٦، ٤) بەنیوە دەگونجێن، بۆیە نیوەی یەکێکیان لەتەواوی ئەوی دیکەیان دەدرێت، پاشان ئەنجامەکەی لەگەڵ بنچینەی بابەتە بەرزکراوەکە لێك دەدرێت (٢×٦) أو (٤×٣)= (١٢)، (١٢×٧)= (٨٤).

[2] بەهۆی جیاوازی نێوان هەر جۆرەو پشکەکەی پێش راستکردنەوە هەر جۆرە وەك خۆی لێدەگەڕێین و بەهۆی گونجان لەنێوانیاندا بەنیوە، نیوەی یەکێکیان لەگەڵ ئەوی تردا لێك دەدەین و ئەنجامەکەی لەبابەتەکە دەدەین (١×٨) أو (٢×٤)= (٨). (٨×٤)= (٣٢) بەوەش راست دەکرێتەوە.

پ- ئەگەر دوو پێڕ بەیەکەوە جیاواز بوون، ئەوا یەکێکیان لەوەی دیکەیان دەدرێت، پاشان ئەنجامەکەی لە بنچینەی بابەتەکە دەدرێت بە بەرزبووەکەی(بعولها) ئەگەر بەرزبوونەوەی تێدا بوو:

| **میراتگرەکان:** | (٣) کچی برا | (٤) برا ك | بنچینەی بابەتەکە(٣) |
|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٣/٢ | م | راستدەکرێتەوە بە (٣٦) [1] |
| پێش راستکرنەوە | ٢ | ١ | |
| پاش راستکردنەوە | ٢٤ | ١٢ | |

بۆ هەر کچی کوڕێك هەشت بەش و هەر برایەکیش سێ بەش.

سێیەم: ئەگەر شکانەوە لەسەر سێ پێڕ یان چوار پێڕ بوو بەپێی شکانەوە لەسەر دوو پێڕ پێوانە دەکرێتو هەمان بنەماکانی پێشوو پەیڕەو دەکرێت.

چوارەم: بۆ زانینی بەشی هەر میراتگرێك لەبابەتە راستکراوەکە، پشکەکەی لە بابەتەکە پێش راستکردنەوە لێکدەدرێت لەوەی لەگەڵی لێکدرا، ئەنجامەکەی = پشکەکەی لەبابەتەکەدا پاش راستکردنەوە.

[1] هەردوو جۆرەکە وەك خۆیان لێیان دەگەڕێن بەهۆی ئەو جیاوازییەی هەیە لەنێوانیاندا لەگەڵ پشکەکانداو یەکێکیان لەگەڵ تەواوی ئەوی تریان لێکدەدەینو ئەنجامەکەی لەگەڵ بابەتەکە لێکدەدەین (٣×٤)=(١٢)، (١٢×٣)= (٣٦).

# دەروازەی دووەم

## گەڕاندنەوە لەبابەتەکاندا

گەڕاندنەوە (الرّد) پێچەوانەی بەرزکردنەوە( العول)یە، چونکە بریتیە لە کەمبوونی ژمارەی پشکەکانو زیاد بوونی برەکەیان و خەرجکردنی زیادەکە لە پشکە دیاریکراوەکان بۆ ئەوانەی شایستەی ئەو زیادەیەن، هەریەکەو بەپێی بەشی دیاریکراوی خۆی پێی دەدرێت ئەگەر میراتگرێکی پشت نەبوو کەشایستەی ئەوە بێت کەماوەتەوە.

گەڕاندنەوەش لەو بابەتە میراتیانەیە کە را جیاییان تێدایە، بەهۆی نەبوونی دەقێکی روونەوە کە چارەنووسی ئەوەی لەمیراتیەکە ماوەتەوە پاش پێدانی پشکە شایستەکان دیاری بکات [1].

---

[1] هەندێك -لەسەروی هەموویانەوە عوسمانی کوڕی عەفان- وتوویانە: زیادەکە بۆ میراتگرەکان دەگەڕێنرێتەوە کە ژنو مێردەکەش بگرێتەوە، چونکە ئەوانیش لەحاڵەتی بەرزکردنەوەدا دەیانگرێتەوە، پێویستە بەپێی رێسای"الغنم بالغرم" زیادەکەش بیانگرێتەوە.

هەندێکی دیکەش- دیارترینیان هاوەڵی بەناوبانگو ناسراو بەشارەزایی لەزانستی میراتیدا زەیدی کوڕی سابت- وتوویانە: زیادەکە بو بەیتولماله (خەزێنەی گشتی) چونکە میراتگری هەر میراتگرێك پشکی دیاریکراوی خۆی بردووە، بۆیە شایستەی زیاتر لەوەی بۆی هەیە نیە، زانایانی مالیکیو شافیعیش هەمان شتیان وتووە ئەمە ئەگەر بەیتولمال رێکخراو بوو کە داهاتەکەی لەبەرژەوەندی گشتیدا بەکاربێت.

هەندێکی دیکە -لەپێش هەموویانەوە عەلی کوڕی ئەبو تالیب- وتوویانە: زیادەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ میراتگرەکان -جگە لەژنو مێرد- هەریەکەو بەپێی رادەی پشکە دیاریکراوەکەی، چونکە کەسە نزیکەکان لەخزمانی سکێنو تەنها لەحاڵەتی نەبوونی میراتگری خاوەن پشکی دیاریکراو و خزمی پشتدا، بەیتولمالیش میراتگری ئەوانەیە کەمیراتگریان نیە.

هەندێ لەزانایانی موتەئەخیرینی حەنەفیش فەتوایان داوە کەژنو مێرد ئەگەر یەکێکیان مردو میراتگری نەبوو گەڕانەوەی پێ دەدرێت. ئیبن عابدینیش لە کتێبی (رد المحتار على الدر المختار وشرح تنوير
←

بۆچوونی زۆرینەی زانایانیش وا چەسپاوە کە: ئەو زیادەیە دەگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەن پشکە دیاریکراوەکان ئەگەر پشت نەبوو -هەر کەسەو بەپێی بەشی دیاریکراوی خۆی-، جگە لە ژنو مێرد کەتەنها ئەوەیان بۆ هەیە کەدیاریکراوە بۆیان وەك نیوە یان چوار یەك یان هەشت یەك.

بەڵام گیانی شەریعەتی ئیسلامو دادپەروەری وا دەخوازن کە بۆچوونی گەورەمان عوسمانی کوڕ عەفان وەربگیرێت کە بریتیە لە: گەڕاندنەوە بۆ خاوەن پشکە دیاریکراوەکان بەجۆرێك کە ژنو مێردیش بگرێتەوە، چونکە هەریەکەیان بەشدارە لەپێکهێنانی ئەو لێجێماوەدا، جا نا دادپەروەریو بێ ویژدانیە کەسێك لەو سامانە بێ بەش بکەیت کەبەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ رەنجی کێشاوە لەپێکهێنانیدا، هەروەها لەبەر ئەوەی بابەتەکە میراتیە ئەگەر بەرزکردنەوە بوایە ئەوا کەمهێنانەکە هەموویانی دەگرتەوەو ئەگەر شتێکیش بمێنێتەوە پێویستە زیادەکەش

---

الأبصار ٦/٧٨٨) لەبارەی ئەو بابەتەوە وتوویەتی: "فەتوا دەدرێت بە گەڕانەوەی زیادەکە بۆ ژنو مێرد لەم سەردەمەدا بەهۆی خرپی بەیتولمالەوە".

لە (زیلعی) لە (النهایە) دەگێڕێتەوە: "ئەوەی زیاد بوو لەبەشی ژنو مێرد یەکێکیان بۆی دەگەڕێنرێتەوە، کچیش بەهەمان شێوە، هەروەها کوڕی شیریش، لە (المستصفی)شدا هاتووە: فەتوای ئەمڕۆ وایە دەگەڕێنرێتەوە بۆ ژنو مێرد. احمدی کوڕی یەحیای کوڕی سەعدی تەفتازانیش وتوویەتی: زۆرێك لەزانایانمان فەتوایان داوە کە گەڕانەوە ژنو مێریش دەگرێتەوە ئەگەر جگە لەوان خزمی دیکە نەبوو". لە (المستصفی)شدا هاتووە: فەتوای ئەمڕۆ ولیە کە گەڕانەوە ژنو مێرد یەکێکیان دەگرێتەوە کاتێ کەسی شایستەی تر نەبێت".

لەوەی باسمان کرد وانیارە راجیاییەکە لەسەر بەیتولمالە (خەزێنەی گشتی) و ژنو مێرد یەکێکیان: "کامیان شایانترە بەوەی ماوەتەوە؟ ئەولنە دەیانەوێن ژنو مێرد یەکێکیان پێش دەوڵەت بخەن کەمیراتگری ئەولنەیە کەمیراتگریان نیە". یاسادانەری میسریش ئەم ئاراستەیەی وەرگرتووە لەمادە (٣٠)ی یاسای میراتیدا کەئەمە دەقەکەیەتی: "ئەگەر خاوەن پشکە دیاریکراوەکان لێجێماوەکە نغرۆ نەکەنو خزمانی پشت نەبێت، ئەوەی مایەوە دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەن پشکە دیاریکراوەکان جگە لەژنو مێرد هەریەکەو بەرادەی پشکەکەیان، ئەگەر خزمانی پشتو خاوەن پشکی دیاریکراوی خزم یاخود یەکێك لەخزمانی سکی نەبوو ئەوا ئەوەی لە میراتیەکە مایەوە دەدرێتە ژنو مێردەکە یەکێکیان".

بۆ هەمووان بێت چونکە(الغنم بالغرم)[1].

## مەرجەکانی گەڕاندنەوە:

بۆ گەڕاندنەوەی بەشی زیادە ئەم مەرجانە هەیە:

١- هەبوونی میراتگری خاوەن پشکی دیاریکراو.

٢- مانەوەی زیادەیەك لە میراتیەکە پاش دابەشکردنی بەشی خاوەن پشکە دیاریکراوەکان.

٣- نەبوونی میراتگری پشت، چونکە خزمی پشت ئەوەی بمێنێتەوە دەبات.

## بنەماکانی جێبەجێکردنی گەڕاندنەوە:

بنەماکانی جێبەجێکردنی گەڕاندنەوە بەگوێرەی هەبوون و نەبوونی ژن و مێرد یەکێکیان دەگۆڕدرێت.

بنەماکانی جێبەجێکردنی گەڕاندنەوە بەگوێرەی نەبوونی یەکێك لە ژن و مێرد:

١. ئەگەر تەنیا یەك میراتگر هەبوو، ئەوا هەموو میراتیەکە دەبات بەپێی پشکی دیاریکراو و گەڕاندنەوە.

[1] زانایانی جەعفەری لە (ایضاح الفوائد ٤/٢٣٧) دەڵێن: " مێرد لەگەڵ منالّدا هات کوڕ بێت یان کچ یان کوڕی کوڕ و بەرەو خوارتر بەهەمان شێوە چواریەکی بۆ هەیە، لەکاتی نەبوونیاندا نیوەی لەگەڵ هەموو میراتگرەکاندا کۆ دەبێتەوە و ئەوەی مایەوە بۆ کەسی نزیکە ئەگەر هەبوو، ئەگەر نەبوو ئەوا بۆ سەرپەرشتی، ئەگەر ئەویش نەبوو ئەوا بۆ زامنکاری کردەوە تاوانکارییەکە، ئەگەر نەبوو وتراوە بۆ دەگەڕێنرێتەوە وتراویشە دەدرێتە ئیمام ئیدی چوبێتە پەردە یان نا، بۆ ژنەیش لەگەڵ کوڕ یاخود کوڕی کوڕ و با بەروخوارتریش بێت هەشت یەك هەیە، ئەگەر نەبێت ئەوا چواریەکی بۆ هەیە لەگەڵ هەموو میراتگرەکاندا، ئەوەشی مایەوە بۆ ئەوانەیە کەلەخزمانی رەچەڵەکیەتی، ئەگەر ئەوانیش نەبوو ئەوا بۆ خاوەن چاکەیە لەگەڵی، ئەویش نەبوو بۆ زامنکاریەتی، ئەویش نەبوو بۆی دەگەڕێنرێتەوە و وتراویشە بۆ ئیمامە، هەروەها وتراوە بۆی دەگەڕێتەوە لەکاتی دیارنەماندا ئیدی کربێتیە پەردە یان نا".

٢. ئەگەر لەیەك زیاتر بوون بەلاَم هەموویان یەك پێڕ بوون، هەموو میراتەكە لەنێوانیاندا بەیەكسانی دابەش دەكرێ بەپێی پشكی دیاریكراوو و بە گەڕاندنەوە.

**میراتگرەكان:** (٥) كچ

پشكەدیاریكراوەكان: (٣/٢) بەپێی پشكی دیاریكراو + م بەگەڕاندنەوە

**میراتگرەكان:** (٦) برای دایكی

پشكەدیاریكراوەكان: (٣/١) بەپێی پشكی دیاریكراو + م بەگەڕاندنەوە

**میراتگرەكان:** (٢) داپیرە (دایكی دایك، دایكی باوك)[1]

پشكەدیاریكراوەكان: (٦/١) بەپێی پشكی دیاریكراو + م بەگەڕاندنەوە

٣.ئەگەر زیاتر لەیەك پێڕ بوون ئەوا زیادەكە بۆ هەموویان دەگەڕێندرێتەوە هەریەكەیان بەپێی پشكی دیاریكراوی خۆی، ئەگەر بەشی شایستەی خۆی نیوە بوو ئەوا نیوەی ئەوەشی كەماوەتەوە پێی دەدرێت، ئەگەر پشكەكەی سێ یەك بوو ئەوا سێ یەكی مایەوەكەشی دەدرێتێ، ئەگەر شەش یەكیش بوو ئەوا شەش یەكی ئەوەی ماوەتەوە دەیدرێتێو بەو شێوەیە.

لەشێوەی دووەمدا: كۆی پشكە شایستەكان دەكرێتە بنچینەی بابەتەكە، واتە سەرەی گریمانەكراوی كەرتەكان دەگۆڕێت بۆ بنچینەی بابەتەكە لەبری ژێرەكەی.

**میراتگرەكان:** دایك خوشك ك

پشكەدیاریكراوەكان: ٣/١ ٢/١

پشكە شایستەكان: (٣/١+ ٢/١)= (٦/٢+ ٦/٣)= (٦/٥)

بابەتەكە (٦) دەگەڕێندرێتەوە بۆ (٥) دایك دوو بەشو خوشك سێ بەش.

**میراتگرەكان:** دایك كچی كوڕ

پشكەدیاریكراوەكان: ٦/١ ٢/١

پشكە شایستەكان: (٦/١+ ٢/١)= (٦/١+ ٦/٣)= ٦/٤

---

[1] لای جەعفەریەكان ٣/١ لێجێماوەكە بۆ دایكەو ئەوەی مایەوە بۆ باوكیەكەیە.

بابەتەکە(٦) دەگەڕێندرێتەوە بۆ(٤) بۆ دایك یەك بەش و کچی کوڕ سێ بەش.

**میراتگرەکان:** خوشك ك خوشکی دایکی

پشکەدیاریکراوەکان: ٢/١ ٦/١

پشکە شایستەکان: (٢/١ +١/٦)= (٦/٣+٦/١)= (٦/٤)

بابەتەکە (٦) دەگەڕێندرێتەوە بۆ (٤) بۆ خوشکی دایکی یەك بەش، خوشکی دایكو باوکیش سێ بەش.

## بنەماکانی جێبەجێکردنی گەڕاندنەوە لە حاڵەتی بوونی یەکێك لەژن و مێرددا:

یەکەم: ئەگەر تەنیا یەك میراتگر لەگەڵ ژنو مێرد یەکێکیاندا هەبوو، ئەوا هاوسەرەکە بەشی خۆی دەدرێتێ، ئەوەی مایەوە دەدرێتە میراتگرەکەی تر بەپشکی دیاریکراو و بە گەڕاندنەوە.

**میراتگرەکان:** ژن خوشك ك

پشکەدیاریکراوەکان:٤/١ م بەپێی پشکی دیاریکراوو بەگەڕاندنەوە

پشکەکان: ١ ٣

**میراتگرەکان:** مێرد دایك

پشکەدیاریکراوەکان: ٢/١ م بەپێی پشکی دیاریکراوو بەگەڕاندنەوە

پشکەکان: ١ ١

دووەم: ئەگەر ئەوانەی گەڕانەوەیان بەسەردا دەکرێ لەیەکێك زیاتر بوونو هەموویان یەك پێڕ بوون:

أ- ئەگەر ئەوەی مایەوە بەسەریدا دابەش دەکرا ئەوا دەردەکەوێت:

**میراتگرەکان:** مێرد (٣) کچ

پشکەدیاریکراوەکان: ٤/١ م

پشکەکان: ١ ٣

ب- بەڵام ئەگەر ئەوەی مایەوە بەسەریاندا دابەش نەدەکرا:

١- ئەگەر گونجان هەبوو لەنێوان ئەوەی ماوەتەوەو ژمارەی پێرەکان ئەوا بەپێی ژمارەکەیان لەگەڵ ژێری بەشی ئەوەی گەڕاندنەوەی بۆ نیە لەیەك دەدین:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | <u>مێرد</u> | <u>(٦) کچ</u> | ژمارەی کچەکان(٦) لەگەڵ ئەوەی مایەوە(٣) |
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٤/١ | م | بەسێ یەك دابەش دەبن لەگەڵ سێ یەکی |
| پێش راستکردنەوە: | ١ | ٣ | ژمارەکەیان لێك دەدرێت لەجێی بەشی |
| پاش راستکردنەوە: | ٢ | ٦ | دیاریکراوی پیاوەکە(٢×٤)=(٨) |

٢- ئەگەر ئەوەی ماوەتەوە دابەش نەدەکرا بەسەر ژمارەی پێرەکەو ناهەمواری لە نێوانیاندا هەبوو، واتە گونجاویان لەنێواندا نەبوو، تەواوی ژمارەکە لەگەڵ ژێری بەشی ئەوەی گەڕانەوەی بەسەردا نیە لێك دەدرێت:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | <u>ژن</u> | <u>(٥) کچ</u> | ژمارەی کچەکان(٥) لەگەل ئەوەی مایەوە(٧) |
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٨/١ | م | تاکن ژمارەکەیان لەژێرەی پشکی دیاریکراوی |
| پێش راستکردنەوە: | ١ | ٧ | ژنەکە دەدرێت (٥×٨)=(٤٠) |
| پاش راستکردنەوە: | ٥ | ٣٥ | بۆ هەریەکەیان (٧) |

سێیەم: ئەگەر ئەوەی گەڕاندنەوەی بەسەردا دەکرێت لەپێرێك زیاتر بوون ئەوا ئەم پێودانگانە کاری پێدەکرێت:

١. بابەتێك کەلەبەشی ئەوەی گەڕاندنەوەی بۆ سەر نیە (ژن و مێرد یەکێکیان) وەرگیرابێت بەگریمانە دادەنرێت.

٢. دوای دیار کردنی بەشی ئەوانەی بەسەریاندا ناگەڕێتەوە ئەوەی ماوەتەوە میراتێکی سەربەخۆیە، هەروەها ئەوانەی بۆیان دەگەڕێتەوە بەمیراتگرانێکی سەربەخۆ دادەنرێن لەوانەی کەبۆیان ناگەڕێندرێتەوە.

٣. گریمانەی بابەتێکی دیکە دەکرێت کەئەویش چەندجارەی هاوبەشە بۆ ژێرەی ئەوانەی بەسەریاندا دەگەڕێتەوە.

٤. هەردوو بابەتە گریمانە کراوەکان دەکرێنە یەك بابەت بەلێکدانی بنچینەی دووەم (پاش گەڕاندنەوە) لە بنچینەی یەکەم، ئەنجامی کۆی هەردوو بابەتەکە دەبێتە بنەمای دابەشکردنی میراتیەکە بەسەر هەمووواندا .

بۆ زانینی بەشی هەر میراتگرێك لەبابەتە هاوپشکەکەدا ئەم دوو بنەمایە جێبەجێ دەکرێت:

أ. ئەوەی گەڕاندنەوە نایگرێتەوە ئەوا بەشی خۆی لەبابەتی یەکەم دەبات بەوەی کەلەگەڵی لێکدراوە.

ب. ئەوەی گەڕاندنەوە دەیگرێتەوە ئەوا بەشی خۆی لەبابەتی دووەم دەبات بەلێکدانی لەگەڵ ئەوەی ماوەتەوە لەبەشی ئەوەی کە گەڕاندنەوە نایگرێتەوە لەبابەتی یەکەمدا.

ئەم پێوادنگو بنەمایانە لە جێبەجێکردنەکانی فیهقی هەڵێنجراوە.

**جێبەجێکردنەکانی:**

| **میراتگرەکان:** | ژن | دایك | کچی کوڕ |
|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٨/١ | ٦/١ | ٢/١ |

**بابەتی یەکەم** (٨) ژێرە بەشی ژنەکەیە.

٨–١= ٧ ئەوەی مایەوە پاش بەشی ژنەکە.

**بابەتی دووەم** (٦) چەندجارەی هاویەش — دایك، کچی کوڕ

دوو بەش دەمێنێتەوە بەهەمان ڕێژە بەسەریاندا دابەش دەکرێت[1] ٦/١ ٢/١

بۆ دایك چوار یەکی، بۆ کچی کوڕیش سێ لەسەر چوار، بۆیە دەگۆڕدرێت لە (٦) ەوە بۆ (٤)

---

[1] ڕادەی بەشی دایك لە پشکە شایستەکان ٤/١ و بەشی کچی کوڕ ٤/٣، چونکە پشکە شایستەکان چوارن، بۆ دایك یەك بەشیانو بۆ کچی کوڕ سێ بەشیان.

بابەتە کۆوەبووەکە (٨×٤)= (٣٢)

بەشی ژنەکەی لەهەمووی (١×٤)= (٤)

بەشی دایك لەهەمووی (١×٧)= (٧)

بەشی کچی کوڕ لە هەمووی (٣×٧)= (٢١)

ئەنجام: = ٣٢

**میراتگرەکان:** ژن خوشك ك خوشکی باوکی

پشکەدیاریکراوەکان: ٤/١ ٢/١ ٦/١

**بابەتی یەکەم** (٤)

٤–١= ٣ ئەوەی مایەوە پاش بەشی ژنەکە خوشك ك خوشك ب

٢/١ ٦/١

**بابەتی دووەم** (٦)

دوو بەش دەمێنێتەوە بەهەمان رادە بۆیان دەگەڕێتەوە خوشکی دایكو باوکی سێ لەسەر چوار، برای باوکیش یەك لەسەر چوار، لەبەر ئەوە دەگۆڕدرێت لە (٦)ەوە بۆ(٤).

بابەتە کۆوەبووەکە (٤×٤)= ١٦

بەشی ژنەکە (١×٤)= ٤

بەشی خوشکی ك (٣×٣)= ٩

بەشی خوشکی باوکی (١×٣)= ٣

ئەنجام: = ١٦

**میراتگرەکان:** مێرد کچ کچی کوڕ

٤/١ ٢/١ ٦/١

بابەتی یەکەم (٤) ٤–١= ٣ ئەوەی مایەوە پاش بەشی مێرد

بابەتی دووەم (٦) کچ کچی کوڕ

٣/١ ٦/١

دوو بەش دەمێنێتەوە بەهەمان رادە بۆیان دەگەڕێتەوە بۆ کچ ٤/٣ و کچی کوڕ ٤/١ بابەتی یەکەم دەگەڕێندرێتەوە لە(٦)ەوە بۆ (٤).

| | |
|---|---|
| بابەتە کۆوەبووەکە | (٤×٤)= ١٦ |
| بۆ ژنەکە | ١×٤ =٤ |
| بۆ کچەکە | ٣×٣ = ٩ |
| بۆ کچی کوڕ | ١×٣ = ٣ |
| ئەنجام | = ١٦ |

**میراتگرەکان:** ژن ٢/١ — داپیرە ٦/١ — برای دایکی ٦/١

بابەتی یەکەم (٢) ٢–١= ١ ئەوەی مایەوە پاش بەشی مێرد

بابەتی دووەم (٦) داپیرە ٦/١ — برای دایکی ٦/١

چوار بەش دەمێنێتەوە بەهەمان رادە بۆیان دەگەڕێتەوە بۆیە دەگۆڕدرێت لە (٦)ەوە بۆ (٢).

| | |
|---|---|
| بابەتە کۆوەبووەکە | (٢×٢) = ٤ |
| بۆ مێرد | (١×٢) = ٢ |
| بۆ داپیرە | (١×١) = ١ |
| بۆ برای دایکی | (١×١) = ١ |
| ئەنجام | = ٤ |

**گەڕاندنەوە لەفیقهی جەعفەریدا:**

أ– ئەم فیقهە هاوڕای زۆرینەی زانایانە لەچەند بابەتێکی پەیوەنددار بەگەڕاندنەوە، لەوانە:

١. مەرجەکانی گەڕاندنەوە.

٢. بێ بەشکردنی ژن و مێرد لەوەرگرتنی زیادە پاش ئەوەی پشکی دیاریکراوی خۆیان دەبەن؛ بۆچوونی وایە کەنابێت بەپێی رادەی پشکە دیاریکراوەکەیان لەگەڵ خاوەن پشکەدیاریکراوەکانی دیکە لەزیادەکەیان بەریکەوێت.

ب- هەردوو فیقهی جەعفەری‌و سوننیش لەچەندین بابەتدا بۆچوونیان جیاوازە، لەوانە:

١. چوارچێوەی گەڕاندنەوە لەفیقهی جەعفەریدا فراوانترە لەچوارچێوەکەی لەفیقهی سوننیدا، ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك دەگەڕێتەوە، لەوانە کارکردن بەسیستەمی پلەبەندی‌و بڕیاردان لەسەر ئەوەی هەرکەس لەپلەی یەکەمدا بێت، چ نێر بێت یان مێ، یەك کەس بێت یان زیاتر، دەبێتە هۆی بەشبڕانی هەموو ئەوانەی کەلەپلەی دووەم‌و سێیەمدا دێن‌و، هەموو میراتیەکە دەبات بەپشکی دیاریکراوو گەڕاندنەوە، ئەمە ئەگەر هاتوو میراتگری دیکەی هەمان پلەی خۆی لەگەڵ نەهاتبوو کە بەشبڕاو نەبێت، بەهەمان شێوە مامەڵە دەکرێت لەگەڵ ئەوانەی کەلەپلەی دووەمدا دێن لەئاست ئەوانەی کەلەپلەی سێیەمدان.

بۆ نمونە: کەسێك کۆچی دوایی کرد، پاش خۆی دایکی یان کوڕی کچی یان کچی کچی لەپاش بەجێما، لەگەڵ هەر یەك لەمانەدا هیچ کام لەباپیرەو داپیرەکان‌و خوشك‌و براکان‌و مامەکان‌و کەسانی تر میراتیان ناکەوێت.

ئەم ئاڕاستەیە بە بۆچوونی ئێمە یەکناگرێتەوە لەگەڵ مەبەستەکانی گوێزرانەوەی لێجێماو بۆ میراتگران، کەیەکێك لەمەبەستەکانی گوێزرانەوەی میراتی بەشبوونیەتی‌و دابەشکردنی بەسەر زۆرترین کەسدا کە بکرێت لەپێناوی زاڵبوون بەسەر سیستەمی چینایەتیدا کەئیسلام ڕەتی دەکاتەوە.

٢. گەڕاندنەوە بەر دایك ناکەوێت ئەگەر ژمارەیەك خوشك‌و برای لەگەڵدا هاتبوو هەرچەند ئەوانە لەمیراتی بەرکەوتن بەشبڕاو کرابن، ئەگەر کەسێك کۆچی دوایی کردو پاش خۆی دایك‌و باوك‌و کچێك‌و ژمارەیەك خوشك‌و برای دایك و

لەوانەیە بەهەمان شێوە مێردیش بگرێتەوە بەوە پاساوی بۆ هێناوەتەوە کەدەترسن ئافرەتێك بکەنە هاوبەش لەگەڵ میراتگرانێکی دیکەدا کەرقیان لێی دەبێتەوە.

ئەم جیاوازییە لەنێوان خودی منالّو کەسانی دیکەدا پێچەوانەی گشتی دەقەکانی قورئانی پیرۆزو دەربڕینە روونەکانیەتی، لەوانە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَكُمْ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُمْ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾[1].

ئەم دەقانە بەشێوەیەکی گشتیو رەها هاتوونو جیاوازی ناکات لەنێوان ئەوەی منالّی هەیە لەگەڵ کەسانی دیکەدا لەبابەتی میراتیدا، هیچ بەڵگەیەکی شەرعی چەسپاویش نیە لەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەردا(ﷺ) کە تایبەتی بکاتو یان کۆتی بخاتە سەرو جیاوازی بکات لەنێوان ئەو ژنەی منالّی هەیە لەگەڵ ئەوەی منالّی نیە.

چەندین نمونەی جێ بەجێکردنی گەڕاندنەوە هەیە لەفیقهی ئیمامیدا، ئەوەی ویستی زیاتر ئاگادار بێت دەتوانێت سەیری کتێبە پشت پێ بەستووەکانی ئەم فیقهە بکات[2].

---

لە (ایضاح الفوائد ٤/٢١٦) هاتووە: (ئەگەر برا جیاوازەکان بەیەکەوە هاتن ئەوا ئەوەیان کەنزیکیەکەی بەهۆی دایکەوەیە شەش یەکی بۆ هەیە ئەگەر تەنها یەکێك بوو، ئەگەر زیاتر لەیەکێکیش بوو ئەوا دوو لەسەر سێی بۆ هەیە بەیەکسانی، ئەوەشی مایەوە بۆ ئەو برایانەیە کەلەدایكو باوکەوەن، بۆ نێر دوو هێندەی مێو ئەوەشیان خزمایەتیەکەی بەهۆی باوکەوە بوو بەشی پێنەدرا).

[1] سورەتی النساء/ ١٢.

[2] لەوانە: ایضاح الفوائد في شرح القواعد للحلي ٤/٢١٢ لاپەڕەکانی دواترو، کتێبی (الخلاف في الفقه)ی شیخ الطائفة محمد بن الحسن الطوسی ٢/٥٠ لاپەڕەکانی دواترو، (الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية)ی العاملي ٢/٢٩٥ لاپەڕەکانی دواتر.

**بەڵگەكانی ناڕەوایەتی جیاوازیكردن لەنێوان ژن و مێردو خاوەن پشكە دیاریكراوەكانی دیكەدا:**

ئەو بنەماو جێ بەجێكردنانەی سەبارەت بە بەشنەدانی ژن و مێرد لەگەڕاندنەوە باسمان كرد بەپێی بیروبۆچوون و ئیجتیهادی زۆرێك لەزانایان بوو، بەڵام لەراستیدا ئەم جیاوازی كردنە لەگێڕانەوەی زیادەكە بەسەر میراتگراندا كە ژن و مێردو خاوەن پشكە دیاریكراوەكانی دیكە بن لەبەر ئەم هۆیانە كارێكی ناڕەوایە:

١. گشتگیری و روونی دەقەكانی قورئانی پیرۆزو سوننەتی پێغەمبەر كە هاوسەرێتی و خزمایەتی بەشێوەیەكی رەهاو گشتی بەهۆكاری میراتی گرتن داناوە، بەبێ ئەوەی ئاماژە بەجیاوازی لەنێوان ئەو دوو هۆكارەدا بكات، نەلەرووی هێزەوە نەلەرووی جێكەوتەوە، لەو بنەمایانەشی كەلەزانستی (علم الاصول)دا هاوڕایی لەسەر ئەوەیە كە نابێت بە هۆی ئیجتیهادەوە دەقیكی گشتی تایبەتمەند بكرێت و رەها.كۆت و پێوەند ناكرێت، مەگەر ئەو ئیجتیهادە پشت ببەستێت بەدەقێكی راشكاوی چەسپاو یان بەرژەوەندی گشتی یان پێویستی، تا ئێستاش هیچ كام لەم سیانە نەسەلێنراوە.

٢. بنەمای شەرعی چەسپاو لەسەر زاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) (الغنم بالغرم)ە، كە زانایانی ئیسلام كۆدەنگن لەسەر كاركردن بەپێی ئەم بنەمایە، ئەمەش وا دەخوازێت كەجیاوازی نەكرێت لەنێوان میراتگراندا مەگەر لەشتانێكدا كە دەقی لەبارەوە هاتبێت لەقورئانی پیرۆز یان سوننەتی پێغەمبەر یان كۆدەنگی زانایاندا، ئەمانەش سەبارەت بە جیاوازیكردن لەنێوان ژن و مێردو میراتگرانی دیكە لەگەڕاندنەوەدا نەسەلمێندراوە، جا لەبەر ئەوەی ژن و مێرد كورتهێنان دەیانگرێتەوە لەكاتی بەرزكردنەوەداو كەمكردنەوە لەئەستۆ دەگرن، بەهەمان شێوە پێویستە زیادەو گەڕاندنەوەش بیانگرێتەوە.

٣. ئەو میراتیەی بەسەر میراتگراندا دابەش دەكرێت بەرهەمی رەنج و ماندووبوونی ژن و مێردەو لەنێو میراتگراندا تەنها ئەوان بەشدار بوون لەپێكهێنانیدا، هەر

ئەوان هاوبەشی ژیان بوون لەخۆشیو ناخۆشیدا، هەر ئەوان بوون هاریکاری یەکبوون لەکۆکردنەوەی ئەو سامانەی ئێستا بۆتە لێجێماو لەکۆچکردووەکەیان، جا بەچ شێوەیەك کەسەکانی دیکە دەخرێنە پێش ئەمانەوە لەشتێکدا کەبەرهەمی هەوڵی ئەمان بووە؟!

٤. بەهێزترین پەیوەندی نێوان مرۆڤێكو یەکێکی دیکە لەژیانی کرداریدا بریتیە لەپەیوەندی هاوسەرێتی لەژیانی ژنو مێردایەتیدا، ئەم پەیوەندییە زۆر بەهێزترە لەپەیوەندی خزمایەتی، جا چۆن پاش مردن بەبێ بوونی دەقی شەرعی لەقورئانی پیرۆز یان سوننەتی پێغەمبەر کە ئاماژە بێت بەمە ئەو پەیوەندییە دەپچڕێندرێت.

٥. ئەو هاریکارییەی هەر یەك لەژن یان مێرد پێشکەشی ئەوی دیکەیانی دەکات لەنەخۆشینی سەرەمەرگداو نارەحەتیەکانی نەخۆشیە درێژخایەنەکانی لەخۆ دەگرێت کە تووشی کۆچکردووەکە بوو بوو پێش مردنی، هیچ کەسێکی دیکەی نزیکی ئامادە نیە بیکات هەرچەند پلەی خزمایەتیشی نزیك بێت.

ئەمانەو چەندەها بەڵگەی دیکەی نەقڵیو عەقڵی بەروونی هەڵەی ئەو ئیجتیهادە دەردەخەن کەبڕیاری بێ بەشکردنی ژنو مێردی لەگەڕانەوە داوە.

لەبەر ئەوەو بگرە زیاتریش لەوە داوا لەیاسا دانەرانی وڵاتانی ئیسلامی دەکەم ئەو بۆچوونە وەربگرن کە وتوویەتی جیاوازی نیە لەنێوان ژنو مێردو خاوەن پشکە دیاریکراوەکانی دیکەدا لەشایستەبوونی گەڕاندنەوە، لەپێش هەموو ئەوانەوە جێنشینی سێیەمی راشیدین عوسمانی کوڕی عەفان (ﷺ) وای وتوە.

# باسی سێیەم
# لێدەرچون و سڕینەوە
# (التخارج والتناسخ)

ئەم بابەتە بۆ دوو دەروازە دابەش دەکەین:

یەکەمیان تایبەت دەکەین بە لێدەرچوون، دووەمیش بە سڕینەوە.

## دەروازەی یەکەم
## لێدەرچوون[1]

**لێدەرچوون**: بریتیە لە گرێبەستێك بەپێی ئەوە یەكێك لەمیراتگرەكان لە پشكەكەی خۆی دەست هەڵبگرێت بۆ میراتگرانی هاوبەشی لەمیراتیەكەدا، بەرامبەر بە قەرەبوویەكی دیار لەسامانەكەی یان لە لێجێماوەكە[2].

ئەم گرێبەستە چەندین تایبەتمەندی هەیە، لەوانە:

---

[1] بۆ ئەم بابەتە بڕوانە ئەم سەرچاوانە: فتح القدير ٤٣٩/٨ لاپەڕەكانی دواتر، حاشية الطحاوي ٣٥٩/٣ لاپەڕەكانی دواتر، حاشية السراجية ص٢٣٦، التركة والميراث للدكتور محمد يوسف موسى ص٣٧٢ لاپەڕەكانی دواتر.

[2] یاسای تۆماری خانوویەری عێراقی ژمارە (٤٣) ی ساڵی ١٩٧٠/ مادەی ٢٤٦، بەمجۆرە ناساندویەتی: "مەبەست لە لێدەرچوون رێككەوتنی هەموو یان بەشێك لەمیراتگران یان خاوەنانی مافی گوێزرانەوەیە لەسەر لێدەرچوونی هەندێكیان لەمیراتیەكە یان گوێزرانەوەكە بەرانبەر بەقەرەبوویەكی دیاریكرلو لە لێجێماوەكە یان شتێكی دیكە".

مەبەست لەمافی گوێزرانەوە مافی گوێزرانەوەی زەویو زاری میریە یان كشتوكاڵیە كە بنەماكەی موڵكی دەوڵەتەو، وەبەرهێنانی بۆ ئەو كەسەیە كەكاری تێدا دەكات، ئەم مافەش دەگوازرێتەوە بۆ میراتگران بەبێ جیاوازیكردن لەنێوان نێرو مێدا، كە بەپشتیوانی خوا لەجێگەی خۆیدا زیاتر لەمە دەدوێین..

١. بۆ دروستی ئەم گرێبەستە مەرج نیە خودیماڵەکە دیار بێت بۆ هەردوو لایەنی گرێبەستەکە، یان لەگرێبەستەکەدا بەروونی و تەواوی دەست نیشان کرابێت.

٢. گرێبەستی لێدەرچوون تەنها لەمیراتگرێکەوە دەبێت بۆ میراتگرێکی دیکە.

٣. ئەگەر خانووبەرەش بوو مەرج نیە تۆمار بکرێت.

**مەرجەکانی لێدەرچوون:**

بۆ ئەوەی لێدەرچوون راست و دروست بێت، پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێتە دی:

١. رەزامەندی: لێدەرچوون رێگەپێدراو نیە بەبێ رەزامەندی تەواوی هەموو لایەنەکانی، بەتایبەت ئەو میراتگرەی لە لێجێماوەکە دەردەچێت، خۆ ئەگەر هەر پاڵەپەستۆ یان زۆرلێکردنێکی مادی یان ئەدەبی لەسەر بوو ئەوا لێدەرچوونەکە بەتاڵ دەبێت.

بەڵام دەرکردنی هەندێ میراتگر وەك کچی کەسە کۆچکردووەکە یان خوشکی یان ژنەکەی بەبێ بەرانبەر یان بەرانبەر شتێکی کەم و بەبێ رەزامەندی تەواوی، ئەمە پێچەوانەی شەرعە و لێدەرچوونەکە بەتاڵە، چونکە هەمان نەریتی سەردەمی نەفامییە کە ئافرەتیان لەمیراتی بێبەش دەکرد.

٢. لێجێماوەکە پێش دانەوەی لە قەرزدا نغرۆ نەبووبێت، یان یەکێك لەمیراتگران بەڵێنی دابێت لەماڵی تەواوی خۆی بیداتەوە، یان خاوەن قەرزەکان دەستبەرداری قەرزەکەیان بووبن، چونکە هەرچەندە لێجێماوەکە پاش مردنی میراتیلێگیراوەکە خاوەندارێتیەکەی گوێزراوەتەوە بۆ میراتگرەکانی لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەرادەی قەرزەکان بێت هەڵس و کەوتی پێ ناکرێت.

٣. هەموو لایەنەکانی لێدەرچوونەکە هاوشانیەتی (اهلیە) گرێبەست ئەنجامدانیان هەبێت.

**رەوايەتی لێدەرچوون:**

بەڵگە لەسەر رەوایەتی لێدەرچوون ئەو گێڕانەوەیە کە (تماضر)ی هاوسەری عەبدولرەحمانی کوڕی عەوف رێککەوتنیان لەگەڵ کرد لەسەر (٨٣) یان (٨٠) دینار یان درهەم هەروەك لەگێڕانەوە جیاوازەکاندا هاتووە، لەکاتێکدا کە چوار خێزانی هەبوو، بەشی ئەم چارەکی هەشت یەك بوو، واتە ٣٢/١ بەشی لەمیراتیەکە.

خۆ ئەگەر لێدەرچوون بە پێکهاتن (صلح) دابنرێت ئەوا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵگەیە لەسەر رەوا بوونی: (كل صلح جائز بين المسلمين، إلا صلحا أحل حراما أو حرّم حلالا). [1] واتە: رێککەوتن دروستە لە نێوان موسڵماناندا تەنیا رێککەوتنێك نەبێت کەحەرامێك حەڵاڵ بکات یان حەڵاڵێك حەرام بکات.

ئەگەر واش لێکدرایەوە فرۆشتنە ئەوا ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە دەیگرێتەوە: ﴿وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ﴾ [2] واتە: کڕین و فرۆشتنی حەڵاڵ کردووە.

**شێوازەکانی لێدەرچوون:**

لێدەرچوون بەپێی سروشتەکەی سێ شێوازی هەیە:

**شێوازی یەکەم:** بریتیە لەدەرچوونی یەکێك لە میراتگرەکان لەگەڵ میراتگرێکی دیکەدا بەجۆرێك کەهێندەی پشکەکەی خۆی لەلایەن میراتگرەکەی دیکەوە لەماڵی ئەو بدرێتێ، لەم حاڵەتەدا میراتیەکە وەك خۆی دابەش دەکرێت بەسەر هەموو میراتگرەکانداو بەشی دەرچووەکە دەدرێت بەو میراتگرەیان کە برە پارەی دەرچوونەکەی داوە، چونکە لەراستیدا پشکەکەی خۆی بەرانبەر بەو ماڵە پێی دراوە فرۆشتووە، بۆیە ئەوەیان کە کڕیوەتی لەمیراتیەکە دووبەشی دەبێت، پشکەکەی خۆی و بەشی کەسە دەرچووەکە.

---

[1] نصب الراية ١١٢/٤، سنن ابن ماجة ٧٨٨/٢.

[2] البقرة : ٢٧٥.

لەنمونەکانی ئەم شێوازە: ئەگەر کەسێك مرد، میراتگرەکانی کچێكو سێ کوڕ بوو، بۆ نمونە بڕی (٧٠) دۆنم زەوی کشتوکاڵی بەجێهێشتبوو کەزەوی میری —امیریە— نەبوو، یەکێك لەکوڕەکان لەگەڵ کچەکە (خوشکەکەی) وا ڕێککەوت کەدەست لەپشکەکەی خۆی هەڵبگرێت بەرانبەر بە بڕێك پارە کە ئەم پێی دەدات، لەم حاڵەتەدا بەشکردنی میراتیەکە بەمجۆرە دەبێت:

بنچینەی بابەتەکە (٧)ە، کە بریتیە لەژمارەی میراتگرەکان پاش ئەوەی هەر کوڕێکمان بەدوو کچ دانا. ٧٠÷ ٧ = ١٠ بەشی کچەکە.

٢×١٠= ٢٠ بەشی هەر کوڕێك.

ئەو کوڕەشیان کە لێدەرچوونەکەی بۆ کراوە ٢٠+١٠=٣٠ دۆنم دەبێت.

**شێوازی دووەم:** ئەمەش باوترین شێوازی لێدەرچوونە، ئەویش بریتیە لە ڕێککەوتنی یەك لە میراتگرەکان لە گەڵ هەموو میراتگرەکانی تر کە شتێکی دیار کراو لە میراتیەکە وەك ئۆتۆمبێل یان خانوو یان پارچە زەویەك یان هەر شتێکی دیکە بۆ ئەم بێت و لێی بچێتە دەرەوە و ئەوی تر بەسەر میراتگرەکانی دیکەدا دابەش بکرێت، هەرکاتێك ئەم ڕێککەوتنە کرا ئەوا لێدەرچووەکە دەبێتە خاوەنی ئەو پشکە دیاریکراوە بۆ خۆی، ئەوی دیکەشی بەسەر میراتگرەکانی دیکەدا دابەش دەکرێت هەرکەسەو بەپێی بەشی خۆی، بەبێ ئەوەی ئەو پشکەی بۆ لێدەرچووەکە بووە لەبەرچاو بگیرێت، بەڵکو وا دادەنرێت کەسە دەرچووەکە لەمیراتگرەکان نەبووەو ئەو پشکەشی کە بردویەتی وەك ئەوە دادەنێن کە بەشێك لەمیراتیەکە نەبووە.

**لەجێ بەجێکردنەکانی ئەم شێوازە:**

ئەگەر ژنێك بمرێت و میراتگرەکانی مێردەکەی و کوڕێکی و کچێکی بن، ئەوەی لێی جێماوە (٣٠) دۆنم باخو خانوویەك بێت، مێردەکە لەگەڵ کوڕو کچەکەی ڕێك بکەوێت لەسەر ئەوەی کە خانوەکە بۆ ئەم بێت و ئەوی مایەوە لێی بچێتە دەرەوە بۆ میراتگرەکانی دیکە بێت، لەم کاتەدا خانووەکە بۆ ئەم دەبێتو باخەکە لەنێوان کوڕو

کچەکەدا دەکرێتە سێ بەش، دوولەسەر سێی بۆ کوڕەکەو، سێ یەکی بۆ کچەکە دەبێت.

**شێوازی سێیەم:** بریتیە لە دەرچوونی یەکێك لەمیراتگرەکان‌و ڕێککەوتنی لەگەڵ میراتگرەکانی دیکە کە هەریەکە بە ڕێژەی بەشی میراتی خۆی لەدەرەوەی میراتیەکە بەرامبەری بداتێ بۆ کڕینەوەی پشکەکەی، لەم شێوەیەدا یان ئەوەتا هەرکەسەو بەپێی بەشیان لەمیراتیەکەدا بەش بەلێدەرچووەکە دەدەن، وەك ئەوەی ئەو میراتگرەی سێ یەکی هەیە، سێ یەکی بەشی لێدەرچووەکەش بدات، ئەوەشی چوار یەکی میراتیەکەی بەردەکەوێت چوار یەکی بەشی لێدەرچوونەکە بداتو بەو جۆرە، یان ئەوەتا هەموویان بەیەکسانی لەپێدانی بەشی لێدەرچووەکەدا بەشدار دەبن بەبێ ڕەچاوکردنی رادەی پشکەکانیان لەمیراتیەکەدا، یان هەر کەسەیان بەکەمتر یان زیاتر لەرادەی پشکەکەی لەمیراتیەکەدا بەشدار بووە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم سێ جیاوازیەی کە لەم شێوازەدایە سێ حاڵەتی هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** وەك شێوەی دووەمی کەئێستا باسکرا، میراتیەکە بەرێژەی بەشی هەریەکەیان دابەش دەکرێت، پاشان بەشی لێدەرچووەکە بەسەر ئەواندا دابەش دەکرێت بەپێی رادەی بەشی هەریەکەیان لەمیراتیەکە، چونکە بەپێی ئەو ڕێژەیەیان هەریەکەیان بەشداربووە لە پێدانی بەشی لێدەرچووەکەدا.

بۆ نمونە: ئەگەر میراتگرەکان تەنها ژنەکەی‌و دوو برای دایکی‌و برایەکی دایك‌و باوکی بوو، لێجێماوەکەش (٣٦) دۆنم زەوی بوو:

بنچینەی گریمانەکراوی بابەتەکە (١٢) دەبێت.

بۆ ژنەکەی چوار یەك (٣÷١٢)= (٣٦×٣÷١٢)= ٩.

بۆ ئەو دوو برایەی لەدایکەوەن سێ یەك (٤÷١٢)= (٣٦÷١٢×٤)=١٢.

ئەوەشی مایەوە بۆ برا دایك‌و باوکیەکەیە (٥÷١٢)= (٣٦÷١٢×٥)= ١٥.

بەڵام ئەگەر ژنەکە لێی دەرچووە دەرەوە بەرامبەر بڕێك پارە کە میراتگرەکانی دیکە هەر کەسە بە پێی ڕێژەی بەشی خۆی (٤،٥) پێی بدەن، بەشی هەر دوو

پێرەکـە لەبەشـی ژنەکـەش بەهـەمان رێـژە دەبێـت، بـەجۆرێك بـرا دایکیـەکان (١٢+٤=١٦)بۆ هەریەکەیان (٨) بەش هەیە، بۆ برا دایكو باوکیەکەش (١٥+٥=٢٠).

**حاڵەتی دووەم:** هەموو میراتگرەکان لەم حاڵەتـەدا بەیەکسـانی هاوبـەش دەبـن لەپێدانی بەشی لێدەرچووەکەدا، لەم کاتەشدا بەشی کەسە دەرچووەکە لە میراتیەکە بەیەکسانی لەنێوانیاندا دابـەش دەکرێـت، پـاش ئـەوەی هەرکەسـەیان بەشـی خـۆی بەرادەی ئەوەی بەری دەکەوێت تێیدا برد، بەوجۆرەی کە کەس لێی دەرنەچووە، بۆ نمونە ئەگەر وامان دانـا میراتگرەکـانو میراتیەکـە وەك نمونەکـەی حاڵـەتی یەکەمـە، بەشی برا دایکیـەکان (١٢+٤.٥=١٦.٥)، بـۆ هەریەکـەیان (٨.٢٥)، بەشـی بـرا دایـكو باوکیەکەش (١٥+٤.٥=١٩.٥).

**حاڵەتی سـێیەمو کۆتـایی:** لـەم حاڵەتـەدا میراتگرەکـانی دیکـە حـەقی کەسـە لێدەرچووەکە نادەن، نـە بـەپێی رێـژەی بەشـی دیاریکراویـان وەك حاڵـەتی یەکـەم، نەبەیەکسانی وەك لەحاڵەتی دووەمدا هەبوو، لەم کاتەدا بەشی کەسـە لێدەرچـووەکە بـەپێی ئـەوەی هەرکەسـەیان بەچـەند لەپێـدانی حـەقی ئـەودا بەشـدار بـووە بەشـی دەکەوێت، جا ئەوە کەسەیان کە سێ یەکی داوە لەبەشی لێدەرچووەکەش سێ یـەك دەبات، ئەوەشی چواریەکی داوە ئـەوا چـواریەکی بەشـی کەسـە دەرچـووەکەی بـەر دەکەوێتو بەوجۆرە.

**گونجاندنی شەرعی (یان یاسایی) لێدەرچوون:**

هەندێك لەزانایان گرێبەستی لێدەرچـوونیان بـەجۆرێك سـازاندووە کـە گرێبەسـتی رێککەوتنە(صلح)، لەبەر ئەوە وا پێناسەیان کردووە کە رێککەوتنی میراتگرانە لەسەر ئەوەی هەندێکیان لە پشکە میراتیەکەی دەربچێت بەرانبـەر بەشـتێکی دیـاریکراو [1]، ئەم سازاندنەش بـەو رەهاییـە هەڵەیـە، چـونکە لێدەرچـوون لەهـەموو شـێوازەکانیدا

---

[1] لە (تكملة فتح القدير ٨/٤٩٣)دا هاتووە: (لێدەرچوون ویستی دەرچوونە، ماناکەشی بریتیـە لـە پێکهـاتنی میراتگران لەسەر لێدەرچوونی هەندێکیان لەمیراتیەکە بەرانبەر شتێکی زانراو)..

ڕێککەوتن نیە، بەڵکو بەگرێبەستی فرۆشتن دەگونجێندرێت، وەك ئەوەی لە شێوازی یەکەمدا هەبوو، بەگرێبەستی بەشکرانیش دادەنرێت وەك لە شێوازی دووەمدا بینرا، گرێبەستی ڕێککەوتنیش بوو لە شێوازی سێیەمدا ئەگەر هاتوو لێدەرچوونەکە پێشتر ناکۆکی لەسەر بوو، بەدەر لەمە وەك گرێبەستی فرۆشتن دادەنرێت، چونکە گرێبەستی ڕێککەوتن بریتیە لەهەبوونی ناکۆکی لەسەری[1] ، خۆ ئەگەر لێدەرچوونەکە پێشتر لەنێوان میراتگرەکاندا ناکۆکی لەسەر نەبوو ئەوا نابێت ناوبنرێت ڕێککەوتن.

**بەرهەمی ڕاجیاییەکە لەسەر گونجاندنی لێدەرچوون:**

بەرهەمەکەی لەم خاڵانەدا دەردەکەوێت:

١- ئەگەر بەفرشتن دانرا ئەوا ئەو میراتگرەی کە کڕیارە یان ئەو میراتگرانەی کە کڕیارن وەك هەر کڕیارێکی بێگانە دەبن، جا ئەوەی بۆ بێگانەکە بێت لە ماف بۆ ئەمانیش بەهەمان شێوەیەو ئەو پابەندیانەی لەسەر ئەو بێت بەهەمان شێوە لەسەر ئەمانیشە، خۆ ئەگەر کڕیارەکە یەك میراتگر بوو بەپارەی خۆی کڕی، لێرەدا شایستەی پشکە فرۆشراوەکەی میراتگرە لێدەرچووەکەیەو ئەم دەچێتە شوێنی ئەو لە میراتیەکەدا.

خۆ ئەگەر کڕیارەکە هەموو میراتگرەکان بوون یان چەند میراتگرێك بوونو بەشی پارەکەیان لە سامانی خۆیان داو، لە گرێبەستی لێدەرچوونەکەشدا شێوازی دابەشکردنی لەنێوانیاندا دیاری نەکرابوو، لێرەدا ئەو پشکە بەیەکسانی لەنێوانیاندا بەش دەکرێت.

٢- ئەگەر لێدەرچوون وەك گرێبەستی بەشکردن لێکدرایەوە، ئەوا هیچ مافو پابەندیەکی لێ ناکەوێتەوە، بەڵکو دەریاندەخات، چونکە ئەم مافە یان ئەو

---

[1] بڕوانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ٤٠٣/٨ ، کتاب الصلح.

پابەندیە لەرێگەی میراتیـەوە پـێش لێدەرچوونەکە هـەبووە ، جا ئەگـەر یـەکێك لـەمیراتگرەکان لێدەرچـوو بەرانبـەر بەشـێك لێـی بـۆ نمونـە ئۆتۆمبێلێـك یـان خانویەك یان پارچە زەوییەك، لێرەدا لێدەرچووەکە لەسەرەتاوە بە رێگەی میراتی بەخاوەنی دانراوە، بەڵام بەشکردنەکەی ئەم خاوەندارێتیەی دەرخستووە.

بەهـەمان شـێوە ئەگـەر بەرێککـەوتن دانـرا ئـەوا لێدەرچـوون دەبێتـە دەرخـەری مافەکە یـان پابەندیەکـە نـەك دروسـتکەریان ئـەو کاتـەی لێدەرچـووەکە دەبێتـە خاوەنی ئەو سامانە وەك بەشی خۆی بەو پێیەی هەر لەسەرتاوە بەرێگەی میراتی وا بووە، لەبەر رۆشنایی دانانی لێدەرچوون بەدەرخەری مافی لێدەرچووەکە نـەك دروستکاری ئەو مافە بۆی، پێویست بەوە ناکات لەفەرمانگەی تایبەتمەند تۆماری بکات ئەگەر هاتوو بابەتەکە خانوو بوو، بەڵام پاش جیاکردنەوەی بۆ کەسی دیکە پێویستە تۆماری بکات ئەمە ئەگەر خانوو بوو.

٣- ئەگـەر لێدەرچـوون بـە گرێبەسـتی رێککـەوتن لێکدرایـەوە، لێـرەدا ئـەم دوو جێکەوتەی دەبێت:

أ- گرێنتی: لەگرێبەستی رێککەوتندا میراتگرە دەرچووەکە گرێنتی خەسڵەتی میراتگربوونی ناکرێت، لەکاتێکا ئەو بانگەشـەی ئـەوە دەکـات کـەمیراتگرە لەهـەمان کاتـدا لەسـەر ئـەوە ناکۆکیـان هەیـە لەگـەڵی و پاشـان لەگـەڵی رێکدەکـەون لێـی دەربچـێت، لێـرەدا لێدەرکرانەکـە رێککەوتنـە بـۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکە، نابێت پاش ئەوە ناکۆکیەکە دروست ببێتەوە، ئەگەر پاش رێککەوتن دەرکـەوت کـە دەرچـووەکە لـە بنچینەدا میراتگـر نەبووە، بەپێچەوانەی ئەوەی وا لێکبدرێتـەوە کـە گرێبەسـتی دابەشـکردن یان گرێبەستی فرۆشتنە.

لـەو دوو حاڵەتـەدا لێدەرچـوو پارێزگـاری لەخەسـڵەتی میراتگرێتـی خـۆی دەکـات، خـۆ ئەگـەر دەرکـەوت کـە میراتگرێکـی راسـتەقینە نیـە لێـرەدا

لێدەرچوونەکە بەتاڵ دەکرێتەوە، هیچ جیاوازیەکی نیە بە گرێبەستی فرۆشتن دانرابێت یان بە گرێبەستی دابەشکردن.

ب- بەشخوران (الغبن): لە رێککەوتندا میراتگرە دەرچووەکە داواکاری بەشخوران لەدژی میراتگرەکان بەرز ناکاتەوە، بەو بیانوەی ئەوەی بردویەتی لە میراتیەکە کەم بووە، چونکە دەبێت لێدەرچوونەکە رێککەوتن بووبێتو ئەو میراتگرەی لێی دەرچووە بەرێگەی رێککەوتن، جگە لەوەی لەکاتی رێککەوتنەکەدا رازی بووە پێیو پێی دراوە شایانی هیچی تر نیە، ئیدی ئەوە کەم بێت یان زۆر، ئەمە بەپێچەوانەی گرێبەستی دابەشکردن کە ئەو کەسەی هەستی بەبەشخورانی کرد مافی ئەوەی هەیە کە بسەلمێنێت ئەو مافخورانەی نارەوا بووە -غبن فاحش- واتە زیاترە لەپێنج یەك، لێرەدا مافی ئەوەی هەیە داوای هەڵوەشاندنەوەی بکات، میراتگرەکانی دیکەش دەتوانن رێگری بکەن لەهەڵوەشاندنەوەی بەشکردنەکە بەوەی ئەوەی کەم دراوە بەو بۆی تەولو بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەداوای هەڵوەشاندنەوەدا رەچاوی ئەم دوو کارە بکرێت:

یەکەمیان: بۆ زانینی ئەوەی بەشخورانەکە زیادە رەوی تیا کراوە یان نا مەزەندەی بەهای میراتیەکە هی کاتی دابەش کردنەکە دەبێت.

دووەمیان: پێویستە داوای هەڵوەشاندنەوە بەر لە تێپەربوونی ساڵێك بەسەر لێدەرچوونەکەدا پێشکەش بکرێت، هەروەك لەیاسای مەدەنی وڵاتانی عەرەبیدا هاتووە [1].

---

[1] هەروەك لەمادە (٨٤٥)ی (القانون المدني المصري الجديد) هاتووە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: الوسيط للسنهوري ٤/٢٦١.

# دەروازەی دووەم

# سرینەوەکان

# (المناسخات)

سرینەوە (المناسخە) لەزمانی عەرەبیدا لە(نسخ)ـەوە وەرگیراوە، ئەم وشەیەش لە رووی زمانەوانیەوە واتە بەتاڵکردنەوەی شتو لابردنی، وەك دەوترێت خۆر سێبەری نەهێشت بەمانای لایداو شوێنی ئەوی گرتەوە[1].

لە رووی زاراوەی فیقهیشەوە: بریتیە لە گوێزرانەوەی بەشی هەندێك لە میراتگرەکان بەهۆی مردنیەوە پێش دابەشکردنی میراتیەکە بەسەر میراتگرەکانیدا[2]، ئەگەر کەسێك مردو میراتگرانێکی لەپاش بەجێما، یەکێك لەو میراتگرانەی پێش ئەوەی میراتیەکەیان بەسەردا دابەش بکرێت ئەمیش مرد، لێرەدا پشکەکەی دەگوێزرێتەوە بۆ ئەوانەی میراتی لێدەگرن.

بۆیە ناوی نراوە یەکترسرینەوە (مناسخە) چونکە هەر دوو بابەتی مردووی یەکەمو دووەم دەسرێتەوەو نامێنێت ئەمیان بەهۆی ئەوی دیکەیانەوە، یەك بابەتی لێ پێکدێت کەبە کۆبووەوە (الجامعە) دەناسرێت، ئەم بابەتەش سەرەڕای گرنگێتیەکەی بەڵام لەزۆربەی دانراوە نوێیەکانی زانستی میراتیدا فەرامۆش کراوە، چونکە لەبابەتە ئاڵۆزەکان دانراوە.

---

[1] القاموس المحيط ٢٧١/١.

[2] مغني المحتاج للشربيني ٣٦/٣.

#### پێودانگەکانی چارەسەری بابەتەکانی سڕینەوە:

ئەگەر کەسێك مردو چەند میراتگرێکی لەپاش بەجێما، یەکێکیان یان زیاتریان پێش جیاکردنەوەی پشکەکەیو دابەشکردنی میراتیەکە مرد، لێرەدا ئەم پێودانگانە دەگیرێتە بەر:

یەکەم: ئەگەر مردووەکەی دووەم میراتگرەکانی هەمان میراتگرانی مردووی یەکەم بوون، میراتی وەرگرتنیان لەم بەهەمان شێوەی میراتی وەرگرتنیان بوو لەمردووی یەکەم، دووەمیان وا دادەنرێت کە هەر نەبووەو، میراتیەکە لەنێوان ئەوانەی دیکەدا دابەش دەکرێت، ئەم حاڵەتە بۆ ئەو میراتگرانە دەبێت کەلەیەك پێڕنو بنچینەی بابەتەکانیان ژمارەی خۆیانە، وەك کوڕی و کوڕی کوڕیو، برای دایکو باوکی یان لەباوکەوە یان لەدایکەوە، یان لەدوو پێڕ بن بەڵام یەك پلەی خزمایەتیان هەبێت، لێرەدا بەپێی بنەمای (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە) میراتی دەبەنو، بنچینەی بابەتەکانیان ژمارەی خۆیان دەبێت پاش ئەوە کە نێرینە بەدوو بەش دانرا [1].

دووەم: ئەگەر میراتی مردووی دووەم میراتگرەکانی تەنها هەمان میراتگرەکانی مردووی یەکەم نەبوون، بەهۆی ئەوەی میراتگرەکان کەسی تر بن یان کەسانی دیکە هاوبەشی بن تێیدا، یان لەواندا کۆبووبێتەوە، بەڵام رێژەی بەشیان لەمردووی یەکەم جیاواز بێت لە رادەی بەشیان لەمردووی دووەم، لەم کاتەدا هەریەك لە بابەتی مردووی یەکەم بەجیاو مردووی دووەمیش بەجیا دیاری دەکرێتو بەمجۆرە سەیری دەکرێت:

أ- ئەگەر پشکە میراتی مردووی دووەم کەلەیەکەم پێی براوە بەهۆی هاوشێوەیی

---

[1] ئەگەر کەسێك مردو پاش خۆی پێنج کوڕ یان پێنج برا بەجێما، یەکێك لەوانە پێش دابەشکردنی میراتیەکە مرد، میراتیەکە بەسەر چواردا دابەش دەکرێت لەبری پێنج، پێنجەمیان کە مردووە وەك ئەوەی هەر نەبووبێت دادەنرێت، ئەگەر کەسێك بمرێتو سێ کوڕو سێ کچی لەپاش بەجێمابێت، ئەگەر یەکێك لەکچەکان بمرێت، میراتیەکە بەسەر هەشتدا دابەش دەکرێت لەبری نۆ، پاش ئەوەی هەر کوڕێك بەدوو بەش دانرا.

یان بەیەکداچوونەوە بەسەر بابەتەکەیدا دابەشکرا، لێرەدا تەنها بابەتی یەکەم بەسە:

**میراتگرەکان:** مێرد (٢) خوشك ك. یەکێك لەکچەکان مرد لەگەڵ کچی کوڕدا

بابەتی یەکەم:

**میراتگرەکان:** مێرد (٢) خوشك ك

پشکە دیاریکراوەکان:١/٢ ٢/٣ بابەتەکە (٦)ەو بەرز کراوەتەوە بۆ (٧)

پشکەکان: ٣ ٤ بۆ هەر خوشکێك دوو بەش.

بابەتی دووەم:

**میراتگرەکان:** کچی کوڕ خوشك ك بابەتەکە (٢)ە

پشکە دیاریکراوەکان:١/٢ م. لەبەر ئەوەی بەهۆی کەسی ترەوە بۆتە پشت

پشکەکان: ١ ١

تەنها بابەتی یەکەم بەسە، چونکە بەشی مردووی دووەم دابەشکردن بەسەر بابەتەکەیدا قبوڵ دەکات.

ب– ئەگەر بەشی مردووی دووەم لە مردووی یەکەم دابەش نەدەکرا بەسەر بابەتەکەیدا ئەوا ئەم بنەمایانە پەیڕەو دەکرێت:

**ڕێسای یەکەم:** بابەتی مردووی یەکەمو دووەم هەریەکەیان بەجیا دیاری دەکرێت، ئەگەر ڕێژەی نێوان پشکەکانی مردووی دووەمو بابەتەکەی گونجان هەبوو، ئەگەر ئەو گونجانە بەنیوە بوو[1] ، ئەوا نیوەی بابەتی دووەم لەگەڵ تەواوی بابەتی یەکەم لێك دەدرێت، ئەگەر گونجانەکەش بە سیّ یەك بوو[2]، ئەوا سیّ یەکی لەگەڵ بابەتی یەکەم لێکدەدرێت، ئەگەر گونجانەکەش بەچواریەك بوو [3] ئەوا چواریەکی لەگەڵ

[1] بەوەی هەریەکەیان دابەش دەبێت بەسەر ژمارە (٢)دا وەك (٦) و (٤).

[2] بەوەی هەریەکەیان دابەش دەبێت بەسەر ژمارە (٣) دا وەك (٩) و (٦).

[3] بەوەی هەریەکەیان دابەش دەبێت بەسەر ژمارە (٤) دا وەك (١٢) و (٨).

بابەتی یەکەم [1] لێکدەدرێت و بەوجۆرە.

لەهەموو ئەم شێوازانەدا ئەنجامی لێکدانەکە دەبێتە کۆی هەردوو بابەتی یەکەمو دووەم.

بۆ زانینی بەشی هەر میراتگرێك لەبابەتە کۆوەبووەکە کار بەم دوو پێوەرە دەکرێت:

١- ئەو کەسەی بەشێکی لەبابەتی یەکەم هەبوو، لە هەمان ئەوە دەدرێت کە ئەو لەگەڵی لێکدراوەو، بەوشێوەیە وەریدەگرێت.

٢- ئەو کەسەی شتێکی لەدووەم هەبێت ئەوا پاش لێکدانی لەگەڵ گونجاوی پشکەکەی مردووی دووەم لەیەکەم دەبیات.

وەك لەم نمونانەدا خراوەنەتە روو:

أ- سازان (توافق) بەنیوە: وەك ئەوەی کەسێك دەمرێتو پاش خۆی ژنەکەیو دایکیو برایەك لەباوکەوە بەجێ دەمێنێت، دایکەکەش دەمرێتو ئەویش پاش خۆی برایەکی باوكو دایکیو برایەك لەدایکەوە بەجێ دەمێنێت:

بابەتی یەکەم:

| **میراتگرەکان:** | ژن | دایك | برای باوکی | بنچینەی بابەتەکە(١٢) |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٣/١ | م | |
| پشکەکان: | ٣ | ٤ | ٥ | |

بابەتی دووەم:

| **میراتگرەکان:** | برای دایکی | برای باوكو دایکی. | بنچینەی بابەتەکە (٦) |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م | |
| پشکەکان: | ١ | ٥ | |

---

[1] بەبەرزکرانەوەی یان پاش راستکردنەوەی ئەگەر بەرزکراوە یان راستکراوە بوو.

کۆوەبووی بابەتەکە: لەنێوان بەشی مردووی دووەم لەیەکەم کە ژمارە (٤)ەو بابەتەکەی (٦)و سازان (توافق) بە نیوەیە، گونجاوی (نیوە) بابەتەکەی لە تەواوی یەکەم دەدرێت (٣×١٢=٣٦) بابەتە کۆوەبووەکەیە.

بۆ ژنەکەی(٣×٣)= ٩ هەردووکیان میراتگری مردووی یەکەم بوون.

بۆ برا ب (٣×٥)= ١٥

بۆ برا ك (٢×٥)= ١٠ هەردووکیان میراتگری مردووی دووەمن.

بۆ برا د (٢×١)= ٢

ب- سازان بە سێ یەك: وەك ئەوەی کەسێك دەمرێتو پاش خۆی دایکیو کچێك، کچی کوڕەکەش دەمرێتو پاش خۆی مێردەکەیو دایکیو کوڕێك بەجێ دەمێنێت:

بابەتی یەکەم:

**میراتگرەکان:** دایك کچی کوڕ بابەتەکە(٦)ە دەگەڕێندرێتەوە بۆ (٤)[1]

پشکە دیاریکراوەکان:١/٦ ١/٢

پشکەکان: ١ ٣

بابەتی دووەم:

**میراتگرەکان:** مێرد باپیرە کوڕ بابەتەکە راست دەردەچێت بە(١٢)

پشکە دیاریکراوەکان: ١/٤ ١/٦ م

پشکەکان: ٣ ٢ ٧

---

١ پاش بەشی هەریەکەیان دوو بەش دەگەڕێندرێتەوە بۆیان بەپێی رێژەی پشکەکانیان، بۆ دایکەکە چواریەکی ئەوەی ماوەتەوە، چونکە پشکەکەی ئەو کۆی پشکە شایستەکانە، بۆ کچی کوڕەکەش سێ لەسەر چواری دوو پشکەکە لەبەر هەمان هۆ، بابەتەکە بابەتەکە دەگۆڕدرێت لە (٦)ەوە بۆ (٤) بۆ دایکەکە ١/٤ بۆ کچی کوڕەکەش ٣/٤.

بابەتــە کۆوەبووەکــە: لــەنێوان بەشــی مــردووی دووەم لەبەشــی یەکــەم (٣)و بابەتەکەی (١٢)و گونجان بەسێ یەکە، ٣/١ ی بابەتی دووەم لەگەڵ تـەواوی یەکـەم لێکدەدرێت پاش گەڕاندنەوە (٤×٤=١٦). (بابەتە کۆوەبووەکە)

دایکەکـە لـەمردووی یەکـەمو دووەمـیش میراتـی بـەر دەکـەوێت، لەبـەر ئـەوە پشکەکەی ئـەو لەبابەتـە کۆوەبووەکـە دەبێـت (١×٤)+ (٢×١)=٦.[1] ، مێردەکـەش میراتــی لــەدووەم بــەر دەکــەوێتو لەیەکــەم هیچــی بەرناکــەوێتو پشــکەکەی لەکۆوەبووەکە (٢×١)=٢. کوڕەکەش لـەمردووی دووەم بەشـی دەکـەوێتو لەیەکـەم نایکەوێتو پشکەکەی لەکۆوەبووەکە (٧×١=٧).

**ڕێسـای دووەم:** بابـەتی مـردووی یەکـەمو دووەم بـەجیا دیـاری دەکـرێن، ئەگـەر ڕێژەی نێوان پشکەکانی مردووی دووەمو بابەتەکەی ناگونجاوی هەبوو، وەك ئـەوەی ژمارەکە خۆبەش بـوو وەك (٣)و (٥) یـان یـەکێکیان خۆبـەش بـوو وەك (٧)و ئـەوی دیکـەیان دابـەش وەك (٨)، تـەواوی بابـەتی دووەم لەگـەڵ تـەواوی بابـەتی یەکـەم لێکـدەدرێن[2] ئــەنجامی لێکدانەکــەش دەبێتــە بنچــینە بــۆ دابەشــکردنی میراتــی هەردووکیان، ئەم بنچینەش بە کۆوەبووی بابەتەکە ناوزەبرێتو بۆ زانینی بەشی هەر میراتگرێك لەبابەتەکەدا ئەم دوو پێوەرە بەکار دەهێندرێت:

١- ئەو کەسەی بەشی لەبابەتی یەکەمدا هەیە ئەوا پشکەکەی لەگەڵ ئەوەی کـە لێکدراوە دەبات.

٢- ئەو کەسەی لەبابەتی دووەمـدا بەشـی هەیـە ئـەوا پـاش لێکـدانی لەتـەواوی پشکەکانی بەشی مردووی دووەم لە هی یەکەم دەبیات.

---

[1] ئەم دایکە لەبابەتی دووەمدا هەمان دایکی بابەتی یەکەمە، لەبابـەتی یەکەمدا یـەك بەشـی هەیـە، لەگـەڵ ئەوەی کە هەیە لێك دەدرێت (١×٤=٤) لەبابەتی دووەمیش دوو بەشی هەیە، ئـەم دووپشـکەی لەگـەڵ گونجاوی (٣/١) بەشی دووەم لەیەکەم لێکدەدرێت (٢×١=٢).

[2] بەبەرزکردنەوەی یان پاش ڕاستکردنەوەی ئەگەر بابەتەکە بەرزکراوە یان ڕاستکراوە بوو.

لەجێبەجێکردنەکانی:

پیاوێك دەمرێتو پاش خۆی ژنەکەیو (٣) کوڕو کچێك بەجێ دەمێنێت، کچەکەی پێش دابەشکردنی میراتیەکە دەمرێتو پاش خۆی دایکیو (٣) برای دایكو باوکی بەجێ دەمێنێت.

بابەتی یەکەم:

| میراتگرەکان: | ژن | (٣) کوڕ | کچێك | بابەتەکە (٨)م |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٨/١ | م | | (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە) |
| پشکەکان: | ١ | ٧ | | بۆ هەر کوڕێك دووبەشو کچەکەش یەك بەش |

بابەتی دووەم:

| میراتگرەکان: | دایك[1] | (٣) برا ك.[2] | بابەتەکە(٦)ە[3] |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م | راست دەردەچێت بە (١٨)[4] |
| پشکەکان: | ٣ | ١٥ | بۆ هەر برایەك (٥) |

بابەتە کۆوەبووەکە: بەو پێیەی بەشی مردووی دووەم (کچەکە) لەمردووی یەکەم یەك پشکەوئەوەش نەگونجاوە لەگەڵ بابەتەکەی کە(٨)ە، لەگەڵ تەواوی بابەتی یەکەم لێکدەدرێت(١٨×٨)=١٤٤بابەتە کۆوەبووەکەیە، بەشی ژنەکە (١×١٨)+(٣×١)= ٢١.[5]

بۆ هەر کوڕێك لەیەکەم وەك کوڕی دووبەشیان بۆ هەیەو (٢×١٨)= ٣٦.

---

[1] هەمان ژنە لەبابەتی یەکەمدا.

[2] هەمان ئەو کوڕانەی بابەتی یەکەمن.

[3] هەمان پایەی بەشی دایکە (٦/١).

[4] چونکە بەشی براکان (٥)ەو بەسەریاندا دابەش نابێت، ژمارەی ئەوان لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لێکدەدرێن (٣×٦)=١٨.

[5] چونکە ژن لەبابەتی یەکەمدا هەمان دایکە لە دووەمدا، لەیەکەم وەك هاوسەر یەك بەشی بەر دەکەوێت، ئەویش لەگەڵ بابەتی یەکەم لێکدەدرێن (١×١٨)=١٨ بەشی لەدووەم (٣) پشکەو لەگەڵ بەشی مردووی دووەم لێکدەدرێن (٣×١)=٣، ١٨+٣=٢١ بەشیەتی لە بابەتە کۆوەبووەکە.

| | |
|---|---|
| لەدووەمیش وەك برا | (۱×٥)= ٥. |
| ٣٦+٥= ٤١ | بەشی هەریەکەیان. |
| ٤١×٣= ١٢٣ | بەشی هەر سێکیان. |
| ١٢٣+ ٢١= ١٤٤. | (پشکە کۆوەبووەکە) |

**ڕێسای سێیەم:** ئەگەر سێیەم کەس پێش دابەشکردنی میراتی یەکەمو دووەم مرد، هەمان ئەو کارەی لەبابەتی مردووی دووەمدا ئەنجامدرا بەو جۆرەی کە خرایە روو ئەو کارە بۆ ئەمیش دەکرێت، ئەگەر بابەتی یەکەمو دووەم راستکرابوونەوەو کرابوونە یەك بابەتی کۆوەبوو، لێرەدا ئەو بابەتە کۆوە بووە بە بابەتی یەکەم دادەنرێتو راستکراوەی بابەتی سێیەمیش بە بابەتی دووەم دادەنرێت، ئەگەر پشکەکانی مردووی سێیەم لەبابەتە کۆوەبووەکە کەبەبابەتی یەکەم دانرا بۆ ئەم درا، ئاشکرایە تەنها بابەتی یەکەمی پێویستە، دەنا ئەگەر لەنێوان پشکەکەیو بابەتەکەیدا گونجان هەبوو ئەوا بەپێی ڕێسای یەکەم کار دەکرێت، خۆ ئەگەر نەگونجان هەبوو ئەوا بەپێی ڕێسای دووەم کار دەکرێت، ئەگەر ژنێك مردو پاش خۆی مێردەکەیو دایکیو سێ کچی بەجێما، پاشان مێردەکەی مردو دوو کچی پاش بەجێما، پاشان دایکەکە مردوو برایەکو خوشکێکی باوکی پاش بەجێما، هەرسێ بابەتەکە لەیەك بابەتی کۆوەبوودا یەکدەخرێت بەمجۆرە:

بابەتی یەکەم:

| | | | |
|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | مێرد | دایك | (۳) کچ |
| بنچینەی بابەتەکە (١٢)یە بەرزکراوەتەوە بۆ١٣ راست دەبێت بە ٣٩ | | | |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٤ | ١/٦ | ٢/٣ |
| پێش راستکردنەوە | ٣ | ٢ | ٨ |
| پاش راستکردنەوە | ٩ | ٦ | ٢٤ بۆ هەریەکەیان (٨) |

بابەتی دووەم:

**میراتگرەکان:** (٢) کوڕ          بنچینەی بابەتەکە (٢)  بۆ هەر کوڕێك بەشێك

بەشی مردووی دووەم لەیەکەم (٩) دابەشکردن قبوڵ ناکات بەسەر بابەتەکەیداو لەگەڵیدا ناگونجێت

لەبەر ئەوە دووەم لەگەڵ یەکەم لێك دەدرێن (٢×٣٩)= ٧٨ (بابەتە کۆوەبووەکە)

هەر کەس لەیەکەمیان شتیکی هەبوو ئەوا لەگەڵ بەشی مردووی دووەم لێك دەدرێن، لەسەر ئەو بنەمایە دایك لەیەکەم (٦) ، بەشی کۆوەبووی دەبێتە (٦×٢)= ١٢.

بۆ هەر کچێك لەیەکەم (٨) و بەشی کۆوەبووی (٨×٢)= ١٦.

بۆ هەر کوڕێکیش لە دووەم یەك بەش هەیە، پشکە کۆوەبووەکەشی دەبێتە(١×٩)= ٩.

بابەتی سێیەم:

**میراتگرەکان:** برای باوکی   خوشکی باوکی   بنچینەی بابەتەکە(٣)

بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە

بەو پێیەی بەشی مردووی سێیەم لەبابەتە کۆوەبووەکە (١٢)یە، بەسەر بابەتەکەیدا دابەش دەبێت (٣)، بۆ برا(٨) بۆ خوشکیش(٤)، هەر سێ بابەتەکەش راست دەرچوون بەو شێوەی کە دۆوانەکەی یەکەم راستبوون، بەمجۆرە تەنها بابەتە کۆوەبووەکە بەسە بۆ دابەشکردنی میراتیەکە بەسەر میراتگرەکانی ئەو سێ کەسەی کە مردوون.

ئەگەر چوارەمیش مرد ئەوا بابەتە یەکخراوەکانی پێشوو دەبێتە بابەتی یەکەمو بابەتی مردووی چوارەمیش دەبێتە بابەتی دووەمو هەمان ئەو رێسایانە پەیڕەو دەکرێت کە لەدابشکردنی میراتیدا باسمان کردن.

# باسی چوارەم
# گلدانەوە لەکاتی دابەشکردنی میراتیدا
## (الإحتياط في توزيع التركات)

هەنـدێك جـار وا رێكدەكـەوێت لـەنێوان میراتگرەكانـدا كۆرپەیەك هەبێت كەهێشتا لەدایك نـەبووەو نازانرێـت كـوڕ دەبێت یـان كـچ، ژمـارەی چـەندە، یەكێكـە یـان زیـاتر؟ یاخود ونبووەیەك هەیە كە تا ئەو كاتـە چارەنووسـی دیـار نیە كە ئایا لەژیاندایە یان مردووە، یـان كەسـێكیان تێدایـە ناوێزەیە -شاذ- رەگەزی روون نیە كەئایا كوڕە یان كچە؟ جا لەبەر ئەوەی چارەنووسی هەموو ئەوانە گومانی تێدایە، لەسەر دادوەر پێویستە لـەكاتی دابەشـكردنی میراتیەكـەدا بەرژەوەندی ئەوانە رەچاو بكاتو بەشـی ئەوانـە لەبەرچـاو بگرێت.

بەپێی ئەم سێ تێڕوانینە ئەم باسە بۆ سێ دەروازە دابەش دەكەین:

# دەروازەی یەکەم

# کۆرپەلە و گلدانەوە بۆی لەکاتی دابەشکردنی میراتیدا

## (الجنین والإحتیاط في توزیع الترکة)

کۆرپەلە لەسکی دایکیدایە ئەگەر هۆکاری خزمایەتی هەبوو لەگەڵ مردووەکەدا بەجۆرێك کە ئەگەر لەدایبوویەکی زیندوو بوایە میراتی لێی بەربکەوێت، بەهۆی پەیوەندی خزمایەتیەکەیەوە وەك میراتگر دادەنرا، ئەمەش بەهۆی فەرموودەی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کەدەفەرمووێت: (إذا استهلّ المولود ورث)[1]، واتە: ئەگەر کۆرپەلە لەدایکبوو میراتی دەدرێتێ.

هەروەها گێڕاویانەتەوە کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لا یرث الصبي حتی یستهل).[2] واتە: منداڵ کە لەدایکبوو میراتی دەدرێتێ.

پاڵپشت بەم دوو فەرموودە پیرۆزەو فەرموودەی دیکەش، زانایانی شەریعەت کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کۆرپەلە بەیەکێك لەشایستەبووانی میراتیەکە دابنرێت ئەگەر هاتوو هۆکاری میراتگرتنی تێدا هاتبووە دیو هیچ ڕێگریەکی لەسەر نەبوو، هەروەها ئەم دوومەرجەی تێدا بوو[3]:

---

[1] السنن الکبری ٦/٢٥٦. عون المعبود ٨/١٣٤، نیل الأوطار ٦/٧٦، التاج ٢/٢٥٤.

[2] نیل الأوطار ٦/٧٦.

[3] کۆرپەلە بازیانیشی دڵنیا نەبێت لەکاتی مردنی میرات لێگیراوەکەدا، لەگەڵ ئەوەشدا بەپێی بەزیندوو ئەژمار دەکرێت بەپێی ئیعتیباری ئاییندە، چونکە بوونی بەڕێوەیە کە کەسێکی زیندووی هێدی هێدی لێ پەیدا ببێت، بۆیە بریاری ژیاوی پێدەدرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی با ئەگەری ژیانو مردنیشی هەبێت لەکاتی مردنی میراتلێگیراوەکەدا، لەگەڵ ئەوەدا لایەنی ئەوەیان کە دەژی پێش دەخرێت، چونکە خودای کاربەجێ بەرانبەر بەلەناوبردنی ئەو کۆرپەلەیە سزایەکی دارایی لەسەر بکوژ داناوە کەپێی دەوترێت (غرّة) ئەگەر مەبەستی تاوانکاری لەکارەکەیدا هەبێت، کە دەکەوێتەسەر ئەوکەسەی لە ←

مەرجی یەکەم: لەکاتی مردنی میراتلێگیراوەکەدا ئەم لەسکی دایکیدا بێت، لای زانایانی شەریعەتی ئیسلامی تێکەڵ بونێك هەیە لەدیاریکردنی پێوەرێکی بابەتی بۆ زانینی هەبوونی کۆرپەلەکە یان نەبوونی لەکاتی مردنی میراتلێگیراوەکەدا، بۆ دوورخستنەوەی ئەو را جیایانە کە تەنها لەسەر بنەمای ئیجتیهاد بوون، زانستی نوێی پزیشکی ئەوەی سەلماندووە زۆرێك لەو پێوەرانە هەڵەن.

پێویست دەکات بابەتەکە لەبەر رۆشنایی ئەم خاڵانەدا بخەینە روو:

١. میراتی پێدانی کۆرپەلە وەك راسپاردن بۆ کراو نیە، چونکە مەرج نیە راسپاردن بۆ کراو کە بەرێگای خزمایەتی یان هاوسەرگیری بگاتەوە بەمردووەکە، هەروەها مەرج نیە وەك میرات لەسەر یەك ئاین بن، چونکە راسپاردن لەسەر بنەمای دەستەبەری کۆمەڵایەتیو ئابووری نێوان کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بنیات نراوە، بەچاوپۆشی لەوەی کە راسپاردنکار موسڵمان بێتو راسپاردن بۆکراو نا موسڵمان بێت، هەروەها دەکرێت راسپاردن بۆ کراو خزمایەتی یان هاوسەرگیری هەبێت لەگەڵ راسپاردنکاردا، یان کەسێکی بێگانە بێت، یان لەکاتی راسپاردنکاریەکەدا لەوێ بێت یان لەوێ ئامادە نەبێت ئەگەر خودی خۆی دیاری نەکرێت.

٢. هەندێ لەزانایان زیادە رۆییان کردووە لە درێژترین ماوەی دووگیانیدا، هەیانە[١] وتویەتی درێژترین ماوەی دووگیانی دووساڵە، هەندێکی دیکە[٢] وتویانە چوار ساڵە، هەیانە وتویەتی[٣] پێنج ساڵە، هەشیانە [١]وتویەتی حەوت ساڵە، بەڵام

---

پشتێتی(عاقلة) ئەگەر کوشتنەکە بەهەڵە بوو، ئاشکرایە ئەم سزایە لەکاتی دەستدرێژی کردنە سەر ژیاندا نەبێت پێویست نیەو کەواتە لایەنی ئەوەی کەکۆرپەلەکە دەژی لای خوای گەورە لەبەرچاو گیراوە بەزیندوو مەزەندە دەکرێت لەکاتی مردنی میراتلێگیراوەکەیدا.

١ وەك حەنەفیەکان.

٢ وەك شافیعیەکان.

٣ وەك مالیکیەکان. حاشیة الدسوقي ٢/٤٧٤.

ئێستا زانستو پزیشکی سەردەم بەشێوەی زانستی یەکلاکەرەوە سەلماندویانە کە کۆرپەلە زیاتر لەیەك ساڵی شەمسی (٣٦٥) ڕۆژ لەسکی دایکیدا نامێنێتەوە.

ڕوون و ئاشکرایە ئەوەی شەریعەتی ئیسلام هێناویەتی دژیەك نیە لەگەڵ گۆڕانکاریو بابەتە زانستیەکاندا، چونکە شەریعەتی زانستو شەریعەتی سروشتی پاکە.

١. هەروەها ناکۆکن لەدیاریکردنی کەمترین ماوەی سکپڕیدا، هەندێك وتویانە شەش مانگە، ئەمەش قورئان ئامـاژەی پێداوە بەکۆکردنەوەی هەردوو فەرمایشتی خوای گەورە: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلاثُونَ شَهْرًا﴾[2]، هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ﴾[3]..

لەبەر ئەوەی ماوەی هاتوو لەئایەتی دووەمدا ئەگەر ئەو ماوەی لێ دەربکرێت کەلەئایەتی یەکەمدا هاتووە ئەوا شەش مانگ دەمێنێتەوە، زانستی نوێو پزیشکی هاوچەرخیش ئەم ڕاستیەیان دووپات کردۆتەوە، لەکاتێکدا هەندێك لەزانایان[4] بۆ ئەوە چوون کەکەمترین ماوەی دووگیانی نۆ مانگە.

٢. هەندێکی دیکە [5]جیاوازیان کردووە لەنێوان ئەوەی سکەکە لەمیراتلێگیراوەکە بێت لەگەڵ ئەوەی لەکەسێکی تر بێتو، وتویانە:

---

[1] وەك زەهری. سەرچاوەی پێشوو.

[2] سورەتی الأحقاف/١٥

[3] سورەتی لقمان /١٤

[4] وەك پێشەوا (أحمد) و(ابن تيمية) و(الظاهرية).

[5] هەروەك لەکتێبی (التركة والميراث في الإسلام)ی دکتور محمد یوسف موسى ص٣٢٦ ولاپەڕەکانی دواتر هاتووە.

مادة (٢٢٩) الجريدة الرسمية اليمنية، وشرح قانون الأحوال الشخصية للدكتور أحمد علي الخطيب، ص١٦٩ ولاپەڕەکانی دواتر. تێیدا هاتووە: "ئەگەر سکەکە لەکەسێکی دیکە بوو جگە لەمیرات ←

أ.ئەگەر سکەکە لەهەمان مردوو نەبووو لەکاتێکدا کەهاوسەرگیریەکەیان درێژەی هەبوو مرد، ئەگەر لەکاتی مردنەکەوە بەماوەی کەمتر لە شەش مانگ لەدایکبوو ئەوا روونە کە لەو بووە، لێرەدا هەر کاتێك لەدایك ببێت شایستەی میراتیە، خۆ ئەگەر لەو ماوەیە زیاتری پێچوو لەدایکبوونەکەی، بەتەواوی روون نەبوو کەلەکاتی مردنەکەدا ئەم هەبووە، لێرەدا نابێتە میراتگری، بەڵام ئەگەر مردو ئافرەتەکە لەماوەی چاوەڕوانی –عیدە–دا بوو لێی، پاشان لەکاتی جیابوونەوەکەیانەوە دوای دووساڵ یان کەمتر لەدایکبوو، ئەوا رەچەڵەکەکەی لەو دەسەلمێندرێت بەپێی ئەو بۆچوونەی پێی وایە درێژترین ماوەی سکپڕی دووساڵە، ئەمە ئەگەر دانی بەوەدا نەنابوو خۆی کە ماوەی چاوەڕوانی لەو پیاوە مردووە بەر لەوە کۆتایی هاتبوو.

ب. ئەگەر سکەکەی لەکەسێکی تر بوو، وەك ژنی باوکی یان هی کوڕی یان کەسێکی دیکەی نزیکی کە کۆرپەلەکەی میراتی لێی دەکەوت، ئەگەر رەچەڵەکی سەلمێندراوو بەزیندووی لەدایکبوو، رەچەڵەکەکەی بەوە دەسەلمێندرێت کە ئەگەر میراتلێگیراوەکە مرد هاوسەرگیری بەردەوام بوو لەنێوان سکپڕەکەو مێردەکەیداو منداڵێکی شەش مانگە یان کەمتری بوو لەکاتی مردنیەوە، ئەمە دەبێتە میراتگری، چونکە بەتەواوەتی دەرکەوت کە ئەو لەسکی دایکیدا بووە کاتی مردنەکە، نابێتە میراتگر ئەگەر پاش شەش مانگ زیاتر لەدایك بوو، با پێش تێپەڕبوونی دووساڵیش بێت، بۆیە لەم حاڵەتەدا ناکرێت بڕیار بدرێت بەوەی بەتەواوەتی ئەو لەسکی دایکیدا بووە

---

لێگیراوەکەو پاش شەش مانگ یان کەمتر لەدایك بوو، هاوسەرگیریشیان بەردەوام بوو، شایستەی میرات وەرگرتنە بەڵام ئەگەر پاش شەش مانگ لەدایکبوو ئەوا نابێتە میراتگر، ئەگەر میراتلێگیراوەکە مردو ژنە سکپڕەکە لەماوەی چاوەڕوانیدا بوو لەمێردەکەی کە مردووە یان بەشێوەی لێکترازان–بائن–تەلاقی داوە، ئەو ئافرەتە ئەگەر سکەکەی بەدرێژترین ماوەی سکپڕی دیارە دووساڵە لەدایکبوو، میراتی لێدەگرێت تا کۆتایی ".

کاتی مردنەکە، بەڵام ئەگەر میراتلێگیراو مردو ژنەکە لەماوەی چاوەڕوانیدا بوو لەمێردەکەی کە مردووە ئەگەر بەشێوەی لێکترازان–بائن– تەڵاقیشی دابێت، لەم کاتەدا ئەگەر سکەکەی لەدرێژترین ماوەی سکپڕیدا بوو لەکاتی مردنی مێردەکەیەوە یان لەکاتی تەڵاقی لێکترازانەکەوە، لێرەدا میراتی لێدەگرێت چونکە بەپێی شەرع لەکاتی مردنی ئەودا بوونی ئەم سەلمێندراوە، خۆ ئەگەر بەزیاتر لەدرێژترین ماوەی سکپڕی لەدایك بوو ئەوا نابێتە میراتگری.

بەبۆچوونی من ئەو پێوەرانەی باسکران گونجاو نین، چونکە ژنی چاوەڕوانکار لەتەڵاقی گەڕاوە هەمان حوکمی هاوسەرگیری راستەقینەی هەیە لەسەلماندنی رەچەڵەکدا، هەروەها لەوانەیە مێرد لەسەر یەك سەرجێ نەبێت لەگەڵ ژنەکەیدا، تا بوترێت منالّ بۆ سەرجێ یە، بەڵکو لەوانەیە بمرێتو چەندین مانگ یان سالّ بێت لەگەڵی نەخەوتبێت، وەك ئەو کەسەی لەدەرەوەی وڵات یان بەندیخانە دەمرێت یان سزای لەسێدارەدانی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت پاش بەسەر بردنی ماوەیەك لەبەندکردن، یان ئەوەتا لەسەر یەك جێگا بەیەکەوە بن بەڵام پیاوەکە تووشی نەخۆشیەك بووە توانای سەرجێی نیە لەگەڵ ژنەکەیدا، لێرەدا لەبەرچاوگرتنی بەرواری مردن راست نیەو لەگەڵ واقیع یەك ناگرێتەوە، لەبەر ئەم تێبینیانەو سەرنجی دیکەش، وایدەبینم دەستەڵاتی هەڵسەنگاندنی سەلماندنی رەچەڵەکی کۆرپەکە بدرێتە دادوەر، ئیدی لەمیرات لێگیراوەکە بێت یان لەکەسی دیکە، ئەویش پەنا بۆ کەسانی خاوەن ئەزموون لەپزیشکانی پسپۆڕ دەبات، تا هەر حالّەتێك بەجیا لەبەر رۆشنایی ئەو رەوشە تایبەتەی هەیەتیو توانینی بەیەك گەیشتنی ژنو مێردەکە پێش مردنەکە لێی بکۆڵدرێتەوە، لەگەڵ لەبەرچاوگرتنی ئەم چەند پێودانگە:

١– کەمترین ماوەی دووگیانی شەش مانگە.

٢– زۆرترین ماوەی دووگیانی یەك ساڵی هەتاویە (٣٦٥) رۆژ.

٣– بەزیندووی لەدایك ببێت.

لەکاتی هەبوونی ناکۆکیدا دادوەر پەنا بۆ پزیشکانی پسپۆڕ دەبات.

**چۆنیەتی کارکردن گلدانەوە لای زۆرینەی زانایان:**

سەرەڕای هاودەنگی زانایان لەسەر شیاوی کۆرپـە بـۆ بەرکـەوتنی میراتـی ئەگـەر هاتوو ئەو دوو مەرجەی کەباسمان کرد تێیـدا هاتـە دی، لەگـەڵ ئەمەشـدا سـەبارەت بەدابەشکردنی میراتیەکە را جیان لەدیاریکردنی شێوازی گلدانەوەکەدا، کە ئایا هەموو میراتیەکە رابگیرێت تا کۆرپەکە لەدایك دەبێت یاخود بەسەر ئەو میراتگرانەی کەهـەن دابەش دەکرێت، ئەگەر کۆرپەکـەش بەزینـدووی لـەدایکبوو ئـەوا میراتیەکـە دووبـارە دابەش دەکرێتەوە.

یاخود بەشێك بۆ کۆرپەکە دەهێڵدرێتەوە تا ئەو کاتـەی لەدایك دەبێـت، کەئـەوە دەبات یـان لـەوە بەشـی خـۆی دەبـاتو، ئـەوەی مایـەوە دەگەڕێندرێتـەوە بـۆ ئـەو میراتگرانەی کەبەهۆی راگرتنی بەشی کۆرپەکەوە پشکەکانی ئەوان کەم بۆتەوە.

تێگەیشـتوانەترینی ئـەو بۆچـوونانەش بۆچـوونی زانایـانی حەنـەفی خـەڵکی سەمەرقەندە، بۆچوونی ئـەمان وایـە ئەگـەر وادەی لەدایکبوونەکـەی نزیـك بـوو ئـەوا دابەشکردنی میراتیەکە رابگیرێت تا کاتی لەدایکبوونی کۆرپەکە، خۆ ئەگەر دوور بـوو ئەوا دابەشکردنەکە راناگیرێتو چاوەڕوانی لەدایکبوونی ناکرێت، بەهۆی ئەو زیانانـەی بەمیراتگرەکانی دیکە دەکەوێت.

ئەگەر پێش لەدایکبوونی بڕیاری دابەشـکردنی درا، ئـەوا بۆچـوونی پەسـەند کـراو ئەوەیە پشکی کوڕێك یان کچێك بهێڵدرێتەوە، هەرکام لـەو دووپشـکە زیـاتر بـوو ئـەوا ئەوەیان هەڵدەگیرێت بۆی، چونکە بەزۆری ئافرەت بەیەك سك تەنها یەك منداڵی کـوڕ یان کچی دەبێت، حوکمەکـەش لەسـەر ئـەو بنەمایـە دەدرێت، ئەمـە ئەگـەر بـەهۆی ئامێری پزیشکیەوە پێەوانەی ئەوە نەسەلمێندرا بوو، لەگەڵ رەچاوکردنی ئەم خاڵانە:

١- ئەگەر بەهۆی میراتگرێکی بەهێزترەوە بەشبڕاو دەبوو: ئەوا هیچی بۆ دانانرێتو، وەك نەبوو دادەنرێت.

| **میراتگرەکان:** | دایکێك سکی هەیە | کوڕ | سك[1] |
| --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م | ب |
| پشکەکان: | ١ | ٥ | هیچ |

٢- ئەگەر مەزەندەکردنی بەوەی بەزیندوویی لەدایك بێت دەبووە هۆی بەشبڕانی هەموو **میراتگرەکان:** لەم حاڵەتەدا هەموو میراتیکە رادەگیرێتو هیچی لێ دابەش ناکرێت، ئەگەر بەزیندووی لەدایکبوو ئەوا هەمووی پێدەدرێت، ئەگەر بەزیندوویش لەدایك نەبوو ئەوا دەدرێت بەمیراتگرەکانی دیکە.

| **میراتگرەکان:** | سکی ژنی کوڕ | (٥) برا لەدایکەوە[2] |
| --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | هەمووی | ب |

٣- ئەگەر بەهەردوو شێوە مەزەندە کردنەکە (کوڕ بێت یان کچ) پشکەکەی جیاوازی نەبوو: ئەو پشکەی کەبەدەق بۆی تەرخان کراوە بۆی دادەنرێت:

| **میراتگرەکان:** | (٢) خوشك | دایکی سکی هەیە | لەباوکی کۆچکردووەکە نیە | سکەکە[3] |
| --- | --- | --- | --- | --- |
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٣/٢ | ٦/١ | | ٦/١ |
| پشکەکان: | ٤ | ١ | | ١ |

---

[1] چونکە سکەکە وامەزەندە دەکرێت بەزیندووی لەدایك بێت، یان ئەوەتا برا یان خوشکی مردووەکەیە، لەهەردوو حاڵەتەکەشدا بە هۆی کوڕەوە بەشبڕاو دەبێت.

[2] چونکە ئەگەر بەزیندووی لەدایکبوو، یان ئەوەتا کچی کوڕ یان کوڕی کوڕە، لەهەردوو ئەگەرەکەشدا ئەوا براکان بەهۆیەوە بەشبڕاو دەبن.

[3] چونکە سکەکە یان ئەوەتا برا لەدایکەوە یان خوشك لەدایکەوەیە، لەهەردوو حاڵەتەکەشدا پشکەکەی بەشەش یەك دیاریکراوە.

٤– ئەگـەر بـەکوڕ مەزەنـدە بکرێـت میراتـی نەکـەوێت: لـەم کاتـەدا وەك کـچ دادەنرێتو بەشی خۆی بۆ دادەنرێـت، کاتیّ لەدایکبوو ئەگەر کچ بوو ئەوا پشـکەکەی خۆی دەبات، ئەگەر کوڕیش بوو ئەوا هیچی ناکەوێتو پشکەکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکانی دیکە:

| **میراتگرەکان:** | میّرد | خوشك ك. | (٢) برای دایکی | سکی ژنی باوك |
|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ١/٢ | ٢/١ | ٣/١ | ٦/١ |

بنچینەی بابەتەکە(٦)[1] بەرزکراوەتەوە بۆ ٩

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| پشکەکان: | ٣ | ٣ | ٢ | ١ |

٥– ئەگەر بەکچ مەزەندە کردنـی بـووە هـۆی میراتـی بەرنەکـەوتنی: ئـەوا بـەکوڕ دادەنرێتو بەشی خۆی بۆ دادەنرێت، کاتیّ لەدایکبوو ئەگەر کوڕ بوو ئەوا پشـکەکەی بۆی دانراوە دەبات، ئەگەر واش نەبوو ئەوا دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکانی دیکە:

| **میراتگرەکان:** | دایك | (٢) کچی کوڕ | سکی ژنی کوڕی کوڕ[2] |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٣/٢ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٣ | ١ |

٦– ئەگەر مەزەندەکردنی بەوەی کوڕە میراتی زیاتری بـەر بکـەوێت: ئـەوا بـەکوڕ دادەنرێتو پشکە زۆرەکەی بۆ دەهێڵدرێتەوە، کاتیّ لەدایکبوو ئەگـەر کـوڕ بـوو ئـەوا هـەموو ئـەوەی بـۆی دانـراوە دەیبـات، ئەگـەر نـا جیاوازییەکـە دەگەڕەندرێتـەوە بـۆ میراتگرەکانی دیکە:

---

[1] پشکە بەرکەوتەکان: (١/٢+ ١/٢+ ١/٣+ ١/٦)= (٣+٣+٢+١/٦)= (٩/٦)، بەرزکرلوەتەوە بۆ (٩)، ئەگەر لەدلیکبوو کوڕ بوو ئەوا بەهۆی نغرۆبوونەوە بەشبڕاو دەبێت.

[2] ئەگەر لەدایکبوو کچ بوو ئەوا دوو کچەکەی کوڕ دەبنە بەشبڕی و ئەگەر کوڕ بوو ئەوا ئەوەی دەمێنێتـەوە وەك خزمی پشت بەری دەکەوێت.

| **میراتگرەکان:** | باوک | سکی ژنی کوڕەکەی[1] |
|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٦/١ | م |
| پشکەکان: | ١ | ٥ |

٧- ئەگەر مەزەندەکردنی بەوەی کچە وا بکات بەشی زیاتری بەر بکەوێت، ئەوا وا مەزەندە دەکرێت کچەو پشکە زۆرەکەی بۆ دەهێڵدرێتەوە، کاتێ لەدایکبوو ئەگەر کچ بوو ئەوا ئەو پشکەی کە بۆی دانراوە هەمووی پێی دەدرێت، ئەگەر واش نەبوو ئەوا جیاوازیەکە بۆ میراتگرەکانی دیکە دەگەڕێندرێتەوە:

| **میراتگرەکان:** | مێرد | برای دایکی | دایکێك سکی هەیە لەباوکە مردووەکە | سکەکەی |
|---|---|---|---|---|
| بنچینەی[2] بابەتەکە(٦) | | | | |
| پشکە دیاریکراوەکان: | | | بەرزکرایەوە بۆ(٨) | |
| | ٢/١ | ٦/١ | ٦/١ | ٢/١ |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | ١ | ٣ |

لەم جێبەجێکردنانەوە تێدەگەین کە گلدانەوە لەهەموو حاڵەتەکاندا لەبەرژوەندی سکەکەیە، هەردەم ئەوەی باشە بۆی ئەوەی بۆ دەهێڵدرێتەوە.

شایانی باسە کە راجیایی نیە لەنێوان فیقهی سوننیو جەعفەریدا لەدووبابەتەکەی یەکەمدا، بەپێچەوانەی بابەتەکانی دیکەوە، کەفیقهی جەعفەری بەهۆی ئەوەی کار بە پلەبەندییەکان دەکات لەگەڵ فیقهی سوننە جیاوازە.

---

[1] ئەگەر لەدایکبوو کوڕ بوو ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە وەك خزمی پشت دەیبات، کەئەویش پێنج پشکە، ئەگەر لەدایکبوو کچ بوو ئەوا نیوەی میراتیەکە دەباتو ئەوەی مایەوە (جیاوازیەکە) لەفیقهی سوننەدا بۆ باوکەکە دەبێت وەك خزمە پشت، لەفیقهی جەعفەریشدا بەهۆی ئەوەی دەچێتە شوێنی باوکی لەبەر ئەوە جیاوازی نیە لەنێوان کوڕو کچدا، بۆیە بەشی باوکەکە کاتێ لەژیاندا بوولیە پێی دەدرێت.. ایضاح الفوائد ٢١٢/٤.

[2] پشکە بەرکەوتەکان: (٢/١+٦/١+٦/١+٢/١)= (٣+١+١+٣/٦)= (٨/٦) بەرزکراوەتەوە بۆ (٨). ئەگەر لەدایکبوو کوڕ بوو ئەوا ئەوەی دەمێنێتەوە وەك خزمی پشت بەری دەکەوێت، کەئەویش یەك پشکە، ئەوەی دیکەی دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکانی دیکە.

# دروازەی دووەم

## گلدانەوە بۆ ونبوو لەکاتی دابەشکردنی میراتیدا

## (المفقود والإحتياط في توزيع التركة)

بەلەبەرچاوگرتنی بنەما ئوصولیە شەرعیە گشتیەکان کە دەڵێت: (اليقين لا يرتفع إلا باليقين) واتە: دڵنیا بوو تەنها بەدڵنیابوو هەڵدەگیرێتو، بنەمای: (الأصل بقاء ما كان على ما كان)[1] واتە: راستتر مانەوەی ئەوەیە وەك خۆی کەبووەو، (الأصل في الصفات العارضة العدم)[2] واتە: بنچینەی خەسڵەتە چاوەڕوان نەکراوەکان نەبوونە، هی دیکەش، ئەگەر کەسێك ونبوو ئەوا سەبارەت بە مافی لەداراییەکەیی ژنەکەیدا بەزیندوو دانانە، ماڵەکەی نابێتە میراتی، وەك ئەوەی کەلەژیانی راستەقینەی یەقینیدا بێت، تا ئەو کاتەی چارەنووسی بەبەڵگە روون دەبێتەوە یان بڕیاری دادوەر بەوەی کە بەشێوەیەکی شەرعی مردووە، چونکە یەکێك لەمەرجەکانی میراتی مردنی میراتلێگیراوەکەیە بەشێوەیەکی راستەقینە یان بەبڕیاری دادوەر، کۆدەنگی زانایای شەریعەتی ئیسلامیش لەسەر ئەمە جێگیر بووە.

ئەگەر بڕیاردرا کەبەشێوەیەکی شەرعی مردووە ئەوا ئەو رۆژەی تێیدا مردنی ونبووەکە چەسپا دەبێتە بەرواری مردنەکەی، خۆ ئەگەر دادگا نەیتوانی بەرواری مردنەکەی بزانێت، ئەوا رۆژی دەرچوونی بڕیاری مردنەکەی دەبێتە بەرواری مردنی.

---

[1] الأشباه والنظائر لأبن نجيم ٨٧/١. مجلة الأحكام العدلية المادة (٥).

[2] الأشباه والنظائر لأبن نجيم ٦٢/١، هەموو ئەم رێسا گشتیانە تایبەتمەندە کە پێچەوانەکەی بەبەڵگەی شەرعی ناچەسپێت.

**بڕیاردان بەمردنی ونبوو و جێکەوتەکانی:**

زانایـانی شـەریعەت راجیـان لـەدیاریکردنی ئـەو ماوەیـەی کەپێویسـتە بەسـەر دیارنەمانی کەسە ونبووەکەدا تێبپەڕێت تا دادوەر بتوانێت بڕیار بـدات کـە مـردووەو، لەم بارەیەوە بۆچوونی جیایان هەیە، کە لێرەدا بواری باس کردنیان نیە، هەرچـەندە یاسادانەری عێراقی تێپەڕبوونی ماوەی دووساڵی پاش راگەیاندنی ئاگاداری ونبوونەکە دیاریکردووە لەبارودۆخە جیاکاندا – الظروف الإستثنائية– کەئەگەری تیاچوون تێیـدا زیـاترەو، مـاوەی چـوار سـاڵ بەسـەر راگەیانـدنی ئاگـاداری ونبووەنەکـەدا ئەگـەر لەبارودۆخی ئاساییدا ونبوو، لەدەقەکانی یاسای چاودێری نەوجەوانانداا[1] کـە هەنـدێ لە حوکمەکانی ونبووی روونکردۆتەوە هاتووە:

"ونبوو ئەو دیار نەماوەیە کەهەواڵی نیەو، نازانرێت ماوە یان مردووە"(م٦٨)[2].

"بەبڕیاری دادگا حاڵەتی ونبـوون رادەگەیـەنرێت، سـەبارەت بـە ئەنـدامانی هێـزە چەکدارەکانو هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ بڕیاری وەزیری بەرگری یان وەزیری نـاوخۆ لەجێی بڕیاری دادگایە، ئاگادارییەکە بەتاڵ دەبێتـەوە ئەگـەر بەڵگەیـەك لەسـەر ژیـانی ونبووەکە دەرکەوت". (م ٨٧).[3]

" بۆ دادگا هەیە بڕیار بدات بەمردنی ونبوو لەیەکێك لەم حاڵەتانەدا:

یەکەم: ئەگەر بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە هەبوو لەسەر مردنی.

دووەم: ئەگەر چوار ساڵ تێپەڕی بەسەر راگەیاندنی ونبوونیدا.

---

[1] ژمارە(٧٨)ی ساڵی ١٩٨٠.

[2] هاوشێوەی مادە(١/٧٠)ی پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ یە.

[3] یاسـادانەر تـەنها (م٢/٧٠) دادگـای بـاس کـردووە، تێیـدا باسـی بڕیـاری وەزیـری بـەرگری یـان نـاوخۆی نەکردووە.

سێیەم: ئەگەر لەبارودۆخێکدا ونبوو کە تێیدا گریمانەی تیاچوونی زیاتر بوو، دوو ساڵیش بەسەر ڕاگەیاندنی ونبوونیدا تێپەڕی". (م٩٣) [1].

"لەهەموو بارەکاندا لەسەر دادگا پێویستە بەهەموو شێوە لەبەر دەستدا بوەکان بگەڕێت تا بزانێت کە لەژیاندایە یان مردووە بەر لەوەی بڕیار لەسەر مردنی دەربکات". (م٩٤) [2].

"ڕۆژی دەرچوونی بڕیاردان بەمردنی ونبووەکە بەرواری مردنیەتی ".(م٩٥). [3] ئەگەر لەبڕیارەکەدا ئاماژە بەبڕیاری دیکە نەکرابوو.

"میراتیەکەی ئەو ونبووەی بڕیاردەرچووە کەمردووە بەپێی مادە (٩٥)ی ئەم یاسایە دابەش دەکرێت بەسەر میراتگرەکانی لەکاتی بڕیاردان بەمردنی". (م٩٦).

"ماڵو سامانی دیارنەماو یان ونبوو لەکاتی هاتنەوەیدا دەگەڕێنرێتەوە بۆی یان دەدرێتە میراتگرەکانی لەکاتی چەسپاندنی مردنیدا بەشێوەیەکی دروست یان بەبڕیاری دادگاو، حوکمەکانی مادە (٩٥)ی ئەم یاسایەی بەسەردا جێبەجێ

---

[1] مادە (٧٤)ی پرۆژەکە وردترە، دەقەکەشی: دادگا لەیەکێك لەم بارودۆخانەدا بڕیار لەسەر مردنی ونبوو دەدات:
یەکەم: ئەگەر بەڵگەیەکە یەکلاکەرەوە هەبوو لەسەر مردنی.
دووەم: ئەگەر لەبارودۆخێکدا ونبوو کەئەگەری تیاچوونی زیاتر بوو، دووساڵیش بەسەر ڕاگەیاندنی ونبوونیدا تێپەڕ بوو.
سێیەم: ئەگەر چوار ساڵ بەسەر ونبوونیدا تێپەڕی".
بڕیاردان لەلایەن دادوەرەوە بەبۆچوونی یاسادانەر بەرزترە، بەڵام یاسای نەوجەوانان دەستەڵاتی هەڵسەنگاندنی داوەتە دادوەر لەبڕیاردان یان ڕەت کردنەوەی داواو تێیدا هاتووە "للمحکمە" واتە بۆ دادگا هەیە، لێرەدا "ل" بۆ سەرپشککردنە هەروەك چۆن "علی" واتە لەسەر بۆ زۆرلێکردنە، لەم یاسایەدا نەبوتووە لەسەر دادگا.

[2] هاوشێوەی مادە (٧٣)ی پرۆژەکەیە.

[3] پرۆژەکە وردترە، کە لەمادە (٧٥) یدا هاتووە: " ئەو ڕۆژەی مردنی ونبوەکەی تێدا دەچەسپێت بە بەرواری مردنی دادەنرێت، ئەگەر دادگا بۆی نەدەکرا بەرواری مردنەکەی بزانێت ئەوا ڕۆژی دەرچوونی بڕیاری مردنەکەی دەبێتە بەرواری مردنی".

دەكرێت".(م٩٧).

لەم دەقانەوە ئەم حوكمانە وەردەگیرێت:

١- هەموو مافەكانی ونبوو پارێزراو دەبێت بۆی تا ئەو كاتـەی دادگـای تایبەتمەنـد بڕیار دەدات كە مردووە.

٢- پێویستە سـەبارەت بـەونبوونی ئاگادارییـەك لەلایـەن دادگـاوە بـەرەهایی یـان وەزیـری بەرگریـەوە یـان وەزیـری نـاوخۆوە سـەبارەت بەئەنـدامانی هێـزە چەكدارەكانو هێزی ئاسایشی ناوخۆ هەبێت[1].

٣- لەسەر دادگا پێویستە بەهەموو ڕێگا بەردەستەكان لەهۆكارەكانی ڕاگەیانـدنو هۆكارەكانی دیكە بەدواداچوون سەبارەت بەونبووەكە بكات بەر لەوەی بڕیاری مردنی دەربچێت.

٤- پێویستە ماوەیەك بەسەر ڕاگەیانـدنی ونبوونیـدا تێبپـەڕێت كـە كـەمتر نـەبێت لەدووسـاڵ سـەبارەت بـەو كەسـەی كەلـە بارودۆخێكدا ونبـووە كـە ئەگـەری تیاچـوونی زیـاترە، وەك بـارودۆخی جـەنگو لافـاوو زەمـین لـەرزەو ئاگركەوتنەوەو، چوار ساڵیش سـەبارەت بـەو كەسـەی كەلەحاڵـەتی ئاسـاییدا ونبووە، وەك كەسێك بچێت بۆ خوێنـدن یـان بازرگـانی یـان گەشـتو گـوزار و سۆراغی نەبێت.

٥- میراتیەكە لەو ڕۆژەوە كە مردنـی ونبووەكـەی تێـدا دەچەسـپێت ئەمـە ئەگـەر حوكمەكـە ئامـاژەی بەبـەروارێكی پێشـتر نـەكردبوو بەسـەر ئەوانـەدا دابـەش دەكرێـت كەمـەرجو پایـەو هۆكارەكـانی میراتگریـان تێـدا دێتـە دیو هـیچ ڕێگریەكیان تێدا نیە، دەنا لـەڕۆژی دەرچـوونی حـوكمی مردنەكەیـەوە، ئـەم درێژەیەش لە مادە (٧٥)ی پڕۆژە یاسای مەدەنی نوێ وەردەگیرێـت، چـونكە

---

[1] لە (م٧٠/٢) پڕۆژەكەدا تەنها ڕاگەیاندنی ونبونەكـەی لـەدادگا بـاس كـراوەو باسـكردنی بڕیـاری وەزیـری ناوخۆ یان بەرگری فەرامۆش كراوە.

یاسای چاودێری نەوجەوانان (م٩٤) بەتەنها ڕۆژی دەرکردنی حوکمەکەی باس کردووە.

٦- ئەگەر دەرکەوت ونبووەکە زیندووە ئەوا پێویستە سامانەکەی بۆ بگەڕێندرێتەوە، ئەوەی زانراوە ئەوەی دەبێت بگەڕێنرێتەوە بریتیە لەوەی کەماوەتەوە لەدەستی میراتگرەکانیدا یان ئەو کەسانەی کە ئەو سامانەیان بەبێ بەرانبەر پێدراوە، ئەم خستنە ڕووەش لە پرۆژە یاساکەدا (م٧٦) هاتووەو یاسای چاودێری نەوجەوانان فەرامۆشی کردووە، بەپێی (م٩٧) دەقەکە ڕەهایەو پێویستە کۆتو بەند بکرێت بەوەی کەلە پرۆژە یاساکەدا هاتووە، چونکە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ بۆچوونی زۆرینەی زانایانی موسڵمان.

٧- ئەگەر پاش تێپەڕبوونی چوار ساڵ بەسەر ئاگاداری ونبوونیدا هیچ میراتگرێکی ونبووەکە دەرنەکەوت، پاش بەدەستهێنانی ڕەزامەندی وەزیری داد سامانەکەی بە حسابێکی سەربەخۆ تۆمار دەکرێت لەسەر ئەو بنەمایەی دوڵەت میراتگری هەر کەسێکە کەمیراتگری نەبێت، ئەوەشی بۆ دەگەڕێنرێتەوە یان بۆ ئەو کەسەی نوێنەری ئەو بێت یان بۆ میراتگرەکانی ئەگەر دەرکەوت لەژیاندایە یان میراتگری شەرعی هەیە، ئەمە ئەگەر پێنج ساڵ بەسەر بڕیاری تۆمارکردنەکەدا تێنەپەڕیبوو.

**میراتی بەرکەوتنی ونبوو لەکەسانی دیکە:**

پێویست وایە ونبوو لەکەسانی دیکە میراتی نەکەوێت، چونکە مەرجی لەژیاندا بوونی پاش مردنی میراتلێگیراوەکە تێدا نایەتە دی‌و، لەبەر ئەوەی (الاستصحاب) بەبەڵگە دادەنرێت-لای زۆربەی زانایان- بۆ مانەوەی ئەوەی هەبووە وەك خۆی لەمافە درایی‌و نادارایییەکان‌و، هیچ پاساوێك گونجاو نیە بۆ بەدەستهێنانی مافی نوێ، لەسەر ئەم بنەمایە زۆرینەی زانایان وتوویانە پشکەکەی لەمیراتیەکە ڕادەگیرێت‌و لای

کەسێکی سپاردە پارێز دادەنرێت تا ئەو کاتەی چارەنووسەکەی روون دەبێتەوە، هاوشێوەی ئەوەی بۆ کۆرپەلە هەبوو:

أ- ئەگەر دەرکەوت زیندووە ئەوا پشکەکەی خۆی دەبات.

ب- ئەگەر مردنەکەی پاش مردنی میراتلێگیراوەکە چەسپا ئەوا پشکەکەی دەدرێتە میراتگرەکانی.

ت- ئەگەر بەنادیاری مایەوە تا ئەو کاتەی بڕیاردرا مردووە وەك ئەوەی باسمان کرد، ئەوا حوکمەکە بە کاریگەری پێشخۆیی - أثر رجعی- دادەنرێت تا رۆژی ونبوونەکەی سەبارەت بەبەدەستهێنانی مافی نوێ، بۆیە شایستەی ئەو میراتیە نیە کەبۆی هەلگیراوە، لەبەر ئەوەی دیار نیە پاش مردنی میراتیلێگیراوەکەی مردووە.

پ- ئەگەر بڕیاردرا مردووەو دواتر دەرکەوت زیندووە، ئەوا بڕیاری گەڕانەوەی پشکەکەی لەلای میراتگرەکان وەك بڕیاری گەڕانەوەی سامانە دابەشکراوەکەی بەسەر میراتگرەکانیدا دەبێت، واتە تەنها داوای ئەوەیان لێدەکات کەلەدەستیاندا ماوە، یان بەبێ بەرانبەر دراوە بەکەسێکی ترو، هیچ کەسیان قەرەبووی لەسەر نیە بۆ ئەوەی کەلەبەردەستیدا تیاچوبێت یان خراپ بووبێت.

**گلدانەوە لەکاتی دابەشکردنی میراتی میراتلێگیراوی ونبوودا:**

لەسەر دادوەر پێویستە لەکاتی دابەشکردنی میراتیەکدا کەیەکێك لە شایستەبووانی میراتیەکە ونبوو بوو بەشی گلبداتەوەو رەچاوی ئەم بنەماو حوکمانە بکات:

یەکەم: ئەگەر ونبووەکە تاکە میراتگر بوو یان لەو کەسانە بوو کەبتوانێت میراتگرەکانی دیکە بەشبڕاوی تەواو (حجب حرمان) بکات، هەموو میراتیەکە رادەگیرێت تا ئەو کاتەی چارەنووسی ونبووەکە روون دەبێتەوە.

**میراتگرەکان:** کوڕ ونبوە

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی

**میراتگرەکان:** کوڕ ونبوە براو خوشك، یان مام یان کوڕە مام

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

**میراتگرەکان:** باوك ونبوە براو خوشك، یان مام یان کوڕە مام

پشکە دیاریکراوەکان: هەمووی ب

پاشان ئەگەر چەسپا مردنەکەی پاش مردنی میراتلێگیراوەکە بوو، ئەوا ئەو یان میراتگرەکانی شایستەی هەموو میراتیەکەن، دەنا دەگەڕێنرێتەوە بۆ ئەوانەی بەریان دەکەوێت.

دووەم: ئەگەر ونبووەکە نەدەبووە بەشبڕی تەواوی کەسانی تر بەڵکو بەشبڕی ناتەواو بوو، ئەوا بۆ ئەو کەسەی دیکە پشکە کەمەکەی دەدرێتێ:

| **میراتگرەکان:** | کوڕ ونبوە | باوك | دایك | ژن | بنچینەی بابەتەکە(٢٤) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | م | ٦/١ | ٦/١ | ٨/١ | |
| پشکەکان: | | ٤ | ٤ | ٣ | |

ئەگەر دەرکەوت زیندووە یان پاش مردنی میراتیلێگیراوەکەی مردووە، ئەوا ئەو یان میراتگرەکانی شایستەی ئەو پشکەن کەبۆی ڕاگیراوە، دەنا دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکانی دیکەو بەشی ئەو میراتگرەشی کەبەناتەواوی درابوو تەواو دەکرێتو، پشکە زۆرەکەیانی دەدرێتێ، لەم بابەتەدا بۆ ژن چوار یەكو بۆ دایك سێ یەكو بۆ باوك ئەوەی مایەوە هەیە.

سێیەم: ئەو میراتگرەی کەپشکەکەی بەهۆی ژیان یان مردنی ونبووەوە کاریگەری لەسەر دروست دەبێت، خراپترینی دووحاڵەتەکەی بۆ دادەنرێت، ئەو کەسەیشی بەپێی مەزەندە کردنێ میراتی بیدرێتێو بەمەزەندەکردنێکی دیکە نەیدرێتێ ئەوا هیچی نادرێتێ.

# دەروازەی سێیەم
# نێرەموکی تێکەڵ و گلدانەوە بۆی لەکاتی دابەشکردنی میراتیدا
# (الخنثى المشكل والإحتياط في توزيع التركة)

نێرەموك لەرووی زمانەوانیەوە: بەوە دەوترێت لایەنی دوو رەگەزیی تێدا زۆر بێت.

لەرووی زانستی فیقهی و پزیشکیشەوە: مرۆڤێکی ناوازەیە کەسروشتی نائاسابیە، ئەندامی نێرینەو مێینەی هەیە یان هیچ کامیانی نیە. واتە: مرۆڤێکی ناوازەیە دیار نیە نێرە یان مێ.

**جۆرەکانی نێرەمووك:**

نێرەمووك دووجۆری هەیە:

١- نێرەمـووکی راسـتەقینە hermaphroditism True : ئـەم جۆرەیـان هەردوو ئەندامی زاوزێی نێرینەو مێینەی هەیەو لەرووی پزیشکیەوە جۆرێکی دەگمەنـەو، زانیـاریش لەبارەیـەوە کـەمو ئـاڵۆزە، بەشـێوەیەکی ئاسـایی کرۆمۆسۆماتی مێینەی لەجۆری(٤٦ XX) هەیە.

٢- نێرەمووکی ناراستەقینە Pseudo-hermaphroditism: ئەم جۆرەیان ئەندامی نێرینەو مێینەی نیە، بەڵکو دەرەچەیەکی هەیە کەلەئەندامی نێرینـە یان مێینە ناچێتو میزی لێوە دێتە دەر، ئەم جـۆرە نێرەمووکـە زۆر بـڵاوە، شێوەکەشی لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، بەشێوەیەکی ئاسایی ئەندامی میزەڕۆی ناتەواوە بەشێوەیەك کەقورسە بزانرێت رەگەزەکەی چیە، بـەم جـۆرە دەوترێـت (نێرەمـوکی تێکـەڵ)، واتـە بـەهۆی ئـەو نیشـانانەی

پیاوێتی و ژنێتی کەهەیەتیو تێکەڵ بوون دیار نیە چیە، لەبەر ئەوە بەتێکەڵ پێناسە دەکرێت.

**هۆکارەکانی:**

لەرووی هۆکارەوە دەبێتە دووبەش:

یەکەمیان بەهۆی ناتەواوی کرۆمۆسۆمەکانەوە بووە.

دووەمیشیان بەهۆی ناتەواوی لە خانەکانی، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندارە بەهۆرمۆناتەوە، کەئەویشی زۆرە.

**تایبەتمەندیەکانی:**

نێرەموکی تێکەڵ تایبەتە بەمرۆڤو حوشترو مانگا، تا ئێستا نەسەلمێنراوە لەگیانلەبەرەکانی دیکەدا هەبێت.

**چارەسەر:**

پێویستە لەنزیکترین کاتدا رەگەزەکەی دیاری بکرێت، بۆ ئەمەش پشت دەبەسترێت بە:

أ. پشت بەستن بەئەندامی زایەندی (جنسی)، بەتایبەت ئەو ئامێرانەی لەدەرەوەنو لەتوانایاندایە پاش باڵغبوون کاری خۆیان ئەنجام بدەن.

ب. ئەنجامدانی نەشتەرگەری (یان چەند نەشتەرگەرییەك بەپێی پێویستی) بۆ ئەندامی میزەرۆی بەهاوکاری پزیشکانی تایبەتمەند لەبوارەکانی رژێنو نەشتەرگەریو بۆماوەزانیو دەروونی، بەمەبەستی چارەسەری لەو نەخۆشخانانەی کە پسپۆڕیەکانی کوێرە رژێنو نەشتەرگەری بۆری میزو لەدایکبوونو نەخۆشیەکانی ئافرەتانی تێدا بێت.

## پێوەرەکانی جیاکردنەوەی دوو پۆلەکە[1]:

ئەگەر نەتوانرا ئامێری میزەرۆ چارەسەر بکرێت، بەپێی بۆچوونە پزیشکیەکانو بۆچوونی زانایانی پێشوو پەنا بۆ پێوەرە دیارەکانی جیاکردنەوەی نێوان هەردوو رەگەزەکە (نێرو مێ) دەبرێت.

أ/ گرنگترین پێوەرەکان پێش بالغبوون:

١. شوێنی میزکردن: ئەگەر وەك پیاو میزی دەکرد ئەوا نێرینەیەو میراتی نێری بەردەکەوێت، ئەگەر وەك ئافرەتیش میزی دەکرد ئەوا بەمێینە دادەنرێتو میراتی مێینەی بەردەکەوێت.

٢. زۆری لێ هاتنە دەرەوە: ئەگەر لەئەندامی نێرینەکەیەوە زیاتر لەئەندامی مێینەکەی میزی دەکرد ئەوا نێرینەیە، ئەگەر لەئەندامی مێینەیەوە زیاتر میزی دەکرد ئەوا مێینەیە.

٣. میزی پێشتر بەیەکێکیان دەکرد: حوکمەکە بۆ ئەوەیان کەپێشتر میزی پێکردووە، ئەگەر بەئەندامە نێرینەکەی زووتر کردبووی ئەوا نێرینەیە، یان بەئەندامە مێینەکەی کردبووی ئەوا مێینەیە، واتە ئەگەر لەهەردوو ئەندامەکەوە میزی دەکرد ئەوا ئەوەیان پێشتر میزی کردووە ئەوەیان دەکرێتە پێوەر، چونکە ئەوەیان پێشتر میزی پێ کردووە بەڵگەیە کەئەوەیان دەرەچەی بنەڕەتیە.

٤. ئەگەر زۆریو لەپێشتریەکە پێچەوانە بوو، وەك ئەوەی ئەندامێکیان پێشتر میزی پێ بکاتو ئەندامەکەی تر زیاتر میزی لێبێت، حوکم بەوەیان دەدرێت

---

[1] لەو هەڵە باوانەی لەنێو خەڵکیدا بڵاوە کە نێرو مێ بە دوو رەگەز ناو دەبەن، چونکە رەگەز جۆری زۆری لێ دەبێتەوە کە ناوەرۆکیان جیاوازە، پۆل لە جۆر دەبێتەوە، جۆریش لە رەگەز دەبێتەوە، گیانلەبەر رەگەزێکە لە ژێر جۆرەکانی گیانلەبەران، مرۆڤیش جۆرێکە هەردوو پۆلی نێرو مێی لێ دەبێتەوە، پۆلیش کەسەکانی لێ دەبێتەوە.

که زۆرتر میزی پێدەکات، چونکە زۆرترەکە بەلگەیەکی بەهێزە کەئەوەیان ئەندامی بنەڕەتیەتی، هەروەها لەبەر ئەوەی حوکمی گشتی بەزۆرینە یەکلا دەکرێتەوە.

٥. ژمارەی پەراسووەکانی: ئەگەر ژمارەی پەراسووەکانی لای چەپی یەک پەراسووی کەم بوو ئەوە نێرینەیە، ئەگەر پەراسووەکانی هەردوو لای یەکسان بوو ئەوا مێینەیە.

٦. میزکردنی بە لای دیواردا: ئەگەر میزەکەی کرد بەدیوارەکەدا ئەوا نێرە، ئەگەر میزەکەی لەبەینی رانەکانیەوە هاتە خوارەوە ئەوە مێینەیە.

ب/ **گرنگترین نیشانەکانی جیاکردنەوە پاش باڵغبوون:**

١. ئارەزووی سێکسی: ئەگەر لەرووی سێکسیەوە ئارەزووی لەپیاو بوو ئەوە مێینەیە، ئەگەر بەسروشتی خۆی ئارەزووی لەئافرەت بوو ئەوە نێرینەیە.

٢. مەمك: ئەگەر قەبارەی مەمکی گەورە بوو، ئەوە مێینەیە، ئەگەر وانەبوو ئەوا نێرینەیە.

٣. هەبوونی ریش: ئەگەر موو لەسەر روخساری روا ئەوا پیاوە، ئەگەر وانەبوو ئافرەتە.

٤. بێنوێژی: ئەگەر خوێنی مانگانە (بێنوێژی) تیا دەرکەوت ئەوە مێینەیە، ئەگەر نەیبوو نێرینەیە.

٥. لاقەکردن (الوطء): ئەگەر دەتوانرا لاقەی بکرێت ئەوا مێینەیە، ئەگەرنا نێرینەیە.

٦. ویست: ئەگەر نیشانەکانی دیکە کەباسکران هەستی پێنەکرا، لێرەدا ئەگەر ویستی بۆ پیاو زیاتر بوو ئەوە ئافرەتە، ئەگەر ویستی بۆ لای ژن زیاتر بوو ئەوا پیاوە، ئەگەر ویستیشی بۆ لای هەردووکیان وەك یەك بوو، یان ویستی بۆ لای هیچ کامیان نەبوو ئەوا نێرەمووکی تێکەڵ یان نادیارە.

لەو شوێنانەی لەفیقهی ئیسلامیدا ناوی نێرەمووك هاتبێت مەبەست پێی تێکەڵ بووە[1].

وایـدەبینین کەزانسـتی پزیشـکی لـەم سـەردەمەدا پێشـکەوتن و گەشـەی زۆری بەخۆیـەوە بینیـوەو، لـەتوانای پسـپۆڕانی بـواری پزیشـکیدایە ئێسـتا لێکیـان جیـا بکەنـەوە، لەبـەر ئـەوە لەسـەر زانایـانی بـورای فـەتوا پێویسـتە دیـاریکردنی جـۆری نێرەمووك بۆ بۆچوونی پزیشك لێ بگەڕێن.

**گرنگی جیاکردنەوەکە:**

ئەم گرنگییە لەدووکاردا دەردەکەوێت:

یەکەمیان ئەنجامدانی نەشـتەرگەری بـۆ نێرەمـووك لەلایـەن پزیشـکانی پسـپۆڕی ئەنـدامی زاوزێـوە، تالەحاڵـەتی سروشـتی خـۆی نزیـك بێتـەوە کەلەگـەڵ پێکهاتـەی ئەندامیدا دەگونجێت، ئەو کاتە بەپێی حاڵەتەکەی کەلەگەڵ ڕەگەزەکەیدا دەگونجێت نێرە یان مێ حوکمەکان جێ بەجێ دەکرێت.

کاری دووەمیش دابەشکردنی میراتیە کەبەدڵنیاییەوە نێرەمووکیش یەکێك دەبێت لەمیراتگران.

**چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو میراتیەی یەکێک لەمیراتگرەکانی نێرەمووک بێت:**

پێش ئەوەی روون بێتەوە ڕەگەزەکەی، پێویستە لەڕێگـەی گرتنـە بـەری یـەکێك لەم ڕێگایانەوە ڕەچاوی بکرێت:

یەکـەم: وەسـتاندنی دابەشـکردنی میراتـی مردووەکـە کەیـەکێك لـەمیراتگرەکانی نێرەمووکی تێکەڵە، تا کاری نێرەمووکەکە روون دەبێتەوە، ئەمە ئەگەر دواخستنەکە زیانی نەبوو بۆ میراتگرەکانی دیکە.

---

[1] الموسوعة الفقهية الكويتية ٢١/٢٠ و لاپەڕەکانی دواتر.

دووەم: ئەگەر بەرژوەندی میراتگرەكانی دیكە وایدەخواست میراتیەكە دابەش بكرێت، لەسەر دادوەر یان موفتی پێویستە هەستێت بەدابەشكردنی میراتیەكە بەلاّم لەكاتی دابەشكردنەكەدا یەكێك لەم شەش شێوەیە رەچاو بكات:

**شێوەی یەكەم:** ئەگەر حاڵەتەكە وابوو میراتی نێرەمووكەكە بەهەردوو مەزەندە كردنەكە (ئەوەی مەزەندە بكرێت نێرە یان مەزەندە بكرێت مێ یە) وەك یەك بوو، لەم حاڵەتەدا هیچ كێشەیەك لەدابەشكردنەكەدا نیە، وەك ئەم نمونەیە:

| **میراتگرەكان:** | باوك | دایك | كچ | منالێكی نێرەموك كەلەسەری دایكەوەیە |
|---|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٦/١ | ٦/١ | ٢/١ | ٦/١ بابەتەكە لە(٦) |
| پشكەكان: | ١ | ١ | ٣ | ١ |

نێرەموكەكە نێربێت یان مێ[1] بەپێی فیقهی سوننی ئەوەی مایەوە پێی دەدرێت، بەلاّم لەفیقهی جەعفەریدا نێرەمووكەكە میراتی ناكەوێت چونكە بەهۆی كچەكەوە بەشبراو كراوە، لەبڕگەی دووەمی (م٩١)ی یاسای باری كەسیی هەمواركراوی عێراقیش ژمارە (١٨٨) ئەم بەشبڕانەیان بڕیاردراوە.

**شێوەی دووەم:** كاتیّ وەك مێینە میراتی بەریكەوێتو وەك نێرینە نەیكەوێت:

| **میراتگرەكان:** | مێرد | خوشك ك | منالێكی نێرەموك كەلەباوكەوەیە |
|---|---|---|---|
| پشكە دیاریكراوەكان: | ٢/١[2] | ٢/١[3] | ـ |
| پشكەكان: | ٣ | ٣ | ـ |

---

[1] چونكە یان ئەوەتا برایە لەدایكەوە یان خوشكە لەدایكەوە، لەهەردوو حاڵەتەكەشدا شەش یەكی بۆ هەیە.

[2] بەهۆی نەبوونی لقی میراتگرەوە.

[3] چونكە یەك دانەیەو نەبۆتە پشتو بەریەستیش نەكراوە.

ئەگەر کوڕ بوو ئەوا بە نغرۆبوون بەشبڕاو دەبێت چونکە پشتە، ئەگەر کچیش بوو ئەوا (٦/١)ی بۆ هەیە وەك تەواوکاری دوولەسەر سێیەکە، بابەتەکە لە (٦) بەرزدەکرێتەوە بۆ (٧).

بۆ مێردەکە ٧/٣، بۆ خوشکەکە ٧/٣، بۆ نێرەموکەکە (خوشك لەباوکەوە) (٧/١).

لای جەعفەریەکانو لەیاسای عێراقیشدا: ئەم نێرەموکە نێر بێت یان مێ میراتی ناکەوێت، چونکە بەهۆی خوشکە دایكو باوکیەکەوە بەشبڕاو دەبێت، لەبەر ئەوەی لەپلەی دووەمە ریزی دووەم، خوشکی باوكو دایکیش لەپلەی یەکەم، بەپێی (م٨٩/٤)ی هەموارکراو کەئەو"خوشکی باوكو دایکی وەك برای باوكو دایکی وایە لەبەشبڕ کردندا ".

بەپێی فیقهی سوننی لەسەر دادوەر پێویستە حەوت یەکی میراتیەکە رابگیرێت، ئەگەر دەرکەوت کوڕە ئەوا دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکانی دیکە، چونکە بەهۆی نغرۆبوونەوە بەشبڕاو کراوە.

**شێوەی سێیەم:** ئەگەر وەك کوڕ مەزەندە کرا میراتی بەربکەوێت و وەك کچ بەری نەکەوێت:

| **میراتگرەکان:** | مێرد | داپیرە | مندالّی برای ك. نێرەموك |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٦/١ | م |
| پشکەکان: | ٣ | ١ | ٢ |

ئەگەر کوڕ بوو ئەوا ئەوەی ماوەتەوە پێی دەدرێت ، چونکە پشتە، ئەگەر دەرکەوت کچە ئەوا هیچی نادرێتێ چونکە خزمی سکە، ئەوەی ماوەتەوە دەگەڕێتەوە بۆ داپیرەکە یان بۆ مێردەکەو داپیرەکە لای ئەوانەی کە بۆچوونیان وایە ژنو مێردیش لەگەڕاوەدا بەشیان هەیە، لای جەعفەریەکانیش نێر بێت یان مێ لەهەر دوو حالّەتەکەدا پێی دەدرێت، چونکە دەچێتە شوێنی باوکیو پشکە بەرکەوتەکەی ئەو دەبات کە لەژیاندا بووایە پێی دەدرا.

**شێوەی چوارەم:** کاتێ وەك مێینە مەزەندە بکرێت زیاتری بەر بکەوێت لەوەی بەکوڕ مەزەندە بکرێت:

| **میراتگرەکان:** | مێرد | دایك | منالێکی نێرەموك لەباوکەوەیە |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٣/١ | م بابەتەکە لە(٦)[1] |
| پشکەکان: | ٣ | ٢ | ١ |

ئەگەر کوڕ بوو ئەوا ئەوەی ماوەتەوە پێی دەدرێت کە دەکاتە (٦/١) چونکە پشتە، ئەگەر کچیش بوو ئەوا نیوەی بۆ هەیە (٦/٣) بەرز دەکرێتەوە بۆ (٨). چونکە خوشکی باوکو دایکی یان خوشکی باوکی ئەگەر تاقانە بوو بەهۆی کەسەوە نەبووبووە پشت یان بەشبڕاو نەکرابوو ئەوا نیوەی میراتیەکە دەبات.

پاش بەرزکردنەوە: ٨/٣ ٨/٢ ٨/٣

لای جەعفەریەکان بەهۆی دایکەوە بەشبڕاو دەکرێت، چونکە ئەم لەریزی دووەمەو دایك لەریزی یەکەمە.

**شێوەی پێنجەم:** کاتێ وەك کوڕ مەزەندە بکرێت زیاتری بەربکەوێت لەوەی بەکچ مەزەندە بکرێت، بەوە کاردەکرێت کەبۆ ئەو و هەموو میراتگرەکانی دیکە باشە، لەبەر ئەوە ئەوەی مایەوە هەڵدەگیرێت تا حاڵەتەکەی روون دەبێتەوە، ئەگەر پێش روون بوونەوە مرد ئەوا میراتگرەکانی هیچیان بەرناکەوێت لەوەی کەهێڵدراوەتەوە، چونکە گومانی تێدا بووە.

| **میراتگرەکان:** | مێرد | باوك | کوڕی کوڕ کە نێرەموکی تێکەڵە |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٦/١ | ٢/١ بەو مەزەندەی کە کچ بێت |
| | | | بنچینەی بابەتەکە لە (١٢)[2] |
| پشکەکان: | ٣ | ٢ | ٦ بەو مەزەندەی کە کچ بێت |

---

[1] ئەنجامی لێکدانەکە (٢×٣)

[2] ئەنجامی لێکدانەکە (٦×٢) یان(٣×٤).

ئەوەی مایەوە رادەگیرێت (یەك بەش ١٢/١)، ئەگەر دەرکەوت کوڕە ئەوا پشکەکە دەبات، ئەگەر دەرکەوت کچە بەپێی فیقهی سونی پشکەکە دەگەڕێندرێتەوە بۆ باوك[1]، بەپێی فیقهی جەعفەریش ئەوو باوکەکە بەپێی ڕێژەی پشکە دیاریکراوەکەیان بەریان دەکەوێت لێی.

**شێوەی شەشەم:** بریتیە لەوەی نێرەموکی تێکەڵاو لەهەموو حاڵەتەکاندا میراتی بەرناکەوێت، ئیدی نێر بێت یان مێ جیاوازی نیە، چونکە بەهۆی میراتگرێکی دیکەوە بەشبڕاو دەکرێت کەخزمایەتیەکەی لەم بەهێزترە.

| **میراتگرەکان:** | مێرد | کوڕ | کوڕێکی نێرە موکی کوڕەکەی |
|---|---|---|---|
| پشکە دیاریکراوەکان: | ٤/١ | م | هیچ |
| پشکەکان: | ١ | ٣ | |

[1] چونکە ئەو وەك پشکی دیاریکرلو شەش یەکی بەردەکەوێتو لەم حاڵەتەدا ئەوەشی مایەوە وەك پشت دەبیات.

# بەشی دووەم

# حوكمەكانی راسپاردن

# أحكام الوصية

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾﴾

البقرة : ١٨٠

((ما حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصَى فِيهِ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ))

متفق عليه

# پێشەکی

حەقیقەتی راسپاردن، فەلسەفەی رەوایەتیەکەی، حوکمی جێبەجێکردنی، سەرچاوەی حوکمەکانی.

## حەقیقەتی راسپاردن

(ابن عرفه) وا پێناسەی کردووە کە بریتیە لە:"گرێبەستێکە مافی سێ یەکی مالّی ئەنجامدەرەکەی پێویست دەکات کەدەبێت پاش مردنی پابەندبن پێیەوە، یان لەبری ئەو پاش مردنی جێبەجێی دەکەن" [1].

یاسادانەری عێراقیش وای پێناسەکردووە کەبریتیە لە: " هەڵس وکەوتکردنە لەلێجێماودا بەجۆرێك کەدواخراوە بۆ پاش مردنی، ناوەرۆکەکەی بریتیە لە خاوەندارێتی بەبێ بەرانبەر" [2].

ئەمەش نزیکە لەپێناسەی حەنەفیەکانەوە بۆی [1].

---

[1] (حاشية الدسوقي على الشرح الكبير) لە (الفقه المالكي) ٤٢٢/٤. لەباشێتیەکانی ئەم پێناسەیە ئەوەیە کە سەرەڕای گرتنەوەی خەسڵەتەکانی راسپاردن هەندێك لەحوکمەکانیشی دەگرێتەوە، لەوانە: راسپاردن گرێبەستە، گرێبەستێکی لەسەر پێویست نەبوو (غیرلازم)ە لەژیانی راسپاردن کارداو، دەبێتە لەسەر پێویست بوو (لازم) پاش مردنی، لەسنووری سێ یەکدا دەبێتو بەبێ رەزامەندی میراتگرەکان لەوە زیاتر بێت دروست نیەو، ئەوەی کرلوەتە راسپاردن دەکرێت مافێك بێتو، دەشکرێت لەبری ئەو ئەنجام بدرێت پاش مردنی هەروەك لەروونکردنەوەکەدا هاتووە..

[2] مادە (٦٤) ی یاسای باری کەسیی هەموارکراوی ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩، کەنزیکە لە مادەی یەکەمی یاسای راسپاردنی میسری بەرکارو، مادە (٢٠٧)ی پرۆژە یاسای سوریو، فەصلی (١٧١)ی (مجلة الأحوال الشخصية التونسية)و، مادە (٢٠٤)ی پرۆژەی (القانون العربي الموحد للأحوال الشخصية).

هەڵبـژاردنی ئـەم پێناسـەش لەسـەر ئـەو بنەمایەیـە کـە راسـپاردن جۆرێکـە لـەجۆرەکانی دارایـی بەخشـین، کەبـە ویسـتی تـاك لایەنـە –الأرادە المنفـردە– دادەمەزرێت‌و، هۆکارێکیشە لەهۆکارەکانی بەدەستهێنانی خاوەندارێتی.

ئەگەرنا راسپاردن زۆر لەوە گشتگیر ترە لەم پێناسـەدا هـاتووە، راسـپاردن جگـە لەوە ئەمانەش دەگرێتەوە: پاککردنەوەی ئەستۆی قـەرزارە لەقـەرزو، پاککردنـەوەی دەستەبەرە لەوەی دەسـتەبەری کـراوە تێیـدا، بـەجێهێنانی ئەرکێکـە کەلەسـەریەتی وەك حـەج کەئـەنجامی نـەداوەو، زەکـات لەسـامانەکەیدا کەنەیـداوەو، گێڕانـەوەی سپاردە بۆ خاوەنەکانیان‌و دانەوەی ئەو قەرزانەی لەسەریەتی‌و شتی دیکەش.

**بەخشینەکانی نەخۆش کاتێ لەنەخۆشینی سەرەمەرگدایە دەکەوێتە ژێر حوکمەکانی راسپاردنەوە:**

هەموو ئەو هەڵس‌وکەوتانەی نەخۆش لـەکاتی نەخۆشـیی سـەرەمەرگیدا دەیکـات ئیدی ئەنجامداربێت یان خرابێتە پاش مردنی هەمان حوکمەکانی راسپاردنی بەسـەردا جێبەجێ دەکرێت ئەگەر نەخۆشەکە لەو نەخۆشیەیدا مردو ئەو هەڵس‌و کەوتەی بەبێ بەرانبەر بوو یان بەرانبەر بەشتێکی زۆر کەم (دۆستانە–محاباە) بوو.

ئەمەش بۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەریعەتی لەسـەرە [٢]و، یاسـا دانراوەکـانیش لەنێویاندا یاسای عێراقی هێناویانە [١].

---

[١] لـە (تکملـة فـتح القـدیر ١٠/٤١١)دا هـاتووە: "راسـپاردن لەزمانـدا ولتـە سەرچـاوە کەئـەویش بریتیـە لەراسپاردنەکە، لەمبارەیەشەوە خوای گەورە دەفـەرموێت: (حـین الوصـیة)، پاشـان ئـەوەی کراوەتـە راسپاردنی بەراسپاردن ناویردووە، وەك خوای گەورە دەفـەرمووێت: ﴿مـن بعـد وصـیة توصـون بهـا أو دین﴾".

لەشەریعەتیشـدا: خاوەندارێتیەکـە بەشـێوەی بەخشـین کـەدولخراوە بـۆ پـاش مـردن، ئیـدی ئـەوە ماڵێنـە (الاعیان) بێت، یاخود سوود لێوەرگرتن (منافع) بێت.

[٢] زانایـانی زاهـری پێچـەوانەی ئـەمانن، جیاوازیـان نـەکردووە لـەنێوان هەڵس‌وکەوتـەکانی نەخۆشـینی سەرەمەرگ لەگەڵ باری تەندروستیدا.

←

دیاریکردنی نەخۆشینی سەرەمەرگیش لەرێگەی زانستی پزیشکی هاوچەرخ‌و دکتۆری پسپۆڕەوە دەبێت یان بەهۆی مردنی نەخۆشەکەوە بەو نەخۆشیە، ئەمەش لەوانەیە بکەوێتە ژێر مەزەندەکردنی دادوەرەوە بۆ حاڵەتەکە [٢].

---

ئیبن حەزم لە (المحلی ٩/٣٤٨) وتویەتی: "هەموو ئەوەی لەکاتی نەخۆشیدا ئەنجامی دلوە لەبەخشین یان صەدەقە یان فرۆشتن بەهەرزان یان خەڵات لە سەرمایەکەی -واتە نەك لەسێ یەکی- لەبەر ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿وافعلوا الخير﴾ و هەروەها لەئایەتێکی دیکەدا خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ولا تنسوا الفضل بينكم﴾، جیاوازی نەکردووە لەنێوان ساغ‌و نەخۆشدا.

[١] مادە (١١٠٩) لەیاسای مەدەنی بەرکار:

"١- هەموو مامەڵەیەکی گوێزەرەوەی موڵك کەکەسێکی نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەگیدا ئەنجامی بداتو مەبەستی بەخشینی یان هەرزان فرۆشی بێت ئەوا هەمووی یان ئەوەندەی کەخاترلنەی تێدا بووە دەبێتە هەڵس‌و کەوتێکی دولخراو بۆ پاش مردنی و حوکمەکانی راسپاردن لەسەر جێبەجێ دەکرێت ئیدی هەر ناوێکی لێ بنرێت.

٢- هەروەها لەلایەن نەخۆشەوە لەکاتی نەخۆشینی سەرەمەرگیدا ئەو کەسە ببەخشێت کە ئەم قەرزی لایەتی ئیدی ئەو کەسە میراتگر بێت یان کەسێکی تر حوکمەکەی وەك راسپاردن دەبێت، بەهەمان شێوە کەفیلی لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا".

مادە (١/١١١): "ئەگەر کەسێك لەکاتی نەخۆشینی سەرەمەرگیدا دلنی نا بەقەرزی میراتگرێکی یان کەسێکی دیکەی دا، ئەگەر دانپێدلنانەکەی هاوشێوەی خاوەندارێتی بوو ئەوا وەك راسپاردن ولیە".

یاسای مەدەنی نوێش هەمان شتی وتووە لە (م٢٣٠)و ئەمەی بۆ زیادکردووە کە: "لەسەر میراتگرەکانی میراتلێگیرلوەکە پێویستە بیسەلمێنن کەئەو هەڵس‌وکەوتە یاساییەی میراتیلێگیراوەکەیان ئەنجامی دلوە لەکاتی نەخۆشینی سەرەمەرگیدا بووە، بەهەموو رێگاکان بۆیان هەیە ئەمە بسەلمێنن‌و، میراتیگرەکان بە بەرواری سەنەدەکە بەڵگە ناهێننەوە ئەگەر ئەم بەرواره نەچەسپابوو.

گەر میراتگرەکان سەلماندیان کەئەو هەڵس‌و کەوتە لەکاتی نەخۆشینی سەرەمەرگدا لەلایەن میراتیلێگیراوەکەیانەوە لەنەخۆشینی سەرەمەرگیدا ئەنجامدراوە ئەوا هەڵس‌و کەوتەکە وەك بەخشین سەیر دەکرێت ئەمە ئەگەر ئەو کەسەی کەپێی دراوە پێچەوانەی ئەوە نەسەلمێنێت.

[٢] دادگای پێداچوونەوە بەبڕیاری ژمارە ١٣٣٨/ مەدەنی دووەم/٩٧٥ لە ١٩٧٥/١١/٣، کە: "پیری‌و ئیفلیجی بەنەخۆشینی سەرەمەرگ دلنانرێن باکەسەکەش ناچار بکات کەلەجێگەدا بمێنێتەوە و ماوەکەشی درێژە بکێشێت، مادام مەترسی دروست ناکات لەسەر ژیانی ئەو کەسەی تووشی بووە، ئەگەر زیادی کردو بەهۆیەوە حاڵی نەخۆشەکە وای دەردەخستن ئەجەلی نزیك بێت‌و، تا دەهات نەخۆشیەکەی زیاتر دەبوو تا بەمردنی کۆتایی هات بەر لەتێپەڕبوونی ساڵێك بەسەر ئەو زیادبوونەی نەخۆشیەکەیدا، ئەوا

←

جێـی ئاماژەیـە لـەم بـوارەدا ئـەوەی لەهەنـدێ دەقـی یاسـاییدا هـاتوەو، راڤـەی راڤەکاران‌و دانەرانی ئەو کتێبانە کە دیاری‌و بەخشینەکانی نەخۆش لەکاتی نەخۆشـی سەرەمەرگیدا دەکەوێتە چوارچێوەی حوکمەکانی راسپاردن نابێت بـەرەهایی کاریـان پێ بکرێت، بـەڵکو پێویسـتە بەهەنـدێ حـوکمی دیکـەوە ببەسـترێتەوە، وەك لێـرەدا روونی دەکەینەوە:

**حوکمە هاوبەشەکان:**

١. ئـەوەی لەسـێ یـەکی میراتیەکـە زیـاتر بـوو دەوەسـتێتە سـەر رەزامەنـدی میراتگرەکـان لەهەریـەك لەراسـپاردن و بەخشـینەکانی نـەخۆش لەنەخۆشـی سەرەمەرگیدا [١].

٢. هەردووکیان بۆ میراتگر دروست نـین لای ئەوانـەی کـە راسـپاردن بـۆ میراتگـر بەرەهایی بەدروست نازانن یان تەنها پاش رەزامەندی میراتگرەکان بەدروستی دەزانن.

٣. هەردووکیان لەسێ یەکی پوختی دەردەکرێن، واتـە دوای ئـەوەی پێداویسـتی کفن‌و ناشتنی لێ دەردەکرێت‌و قەرزەکانیش دەدرێتەوە.

---

نەخۆشیەکە دەبێتە نەخۆشینی سەرەمەرگ لەو کاتەوەی کە زیاتر بووە نەك لەو بەروارەوە کەتووشـی بووە".

هـەروەها لـەبریاری ٢٥٤/ دەسـتەی گشـتی یەکـەم/ ٩٧٣ هـاتووە: "ئـەو کەسـەی تووشـی شـێرپەنجەی گورچیلە بـووە بەنەخۆشـینی سـەرەمەرگ دادەنرێـت، ئەگـەر بـەر لـە تێپـەڕبوونی سـاڵێك بەسـەر تووشـبوونیدا مـرد، پـاش ئـەوەی هۆکارەکـەی زیـادی کـرد، ئیـدی لەجێگـەدا کـەوتبێت بـەهۆی نەخۆشیەکەوە یـان نـا، ئەگـەر هـاتوو نەخۆشـەکە قەواڵەیـەکی لـەکاتی نەخۆشـیەکەیدا کردبـوو ئـەو قەواڵەیـەش بـەروارێکی چەسـپاوی فـەرمی لەسـەر نـەبوو، ئـەوا دادەنرێت کەلـەماوەی نەخۆشـینی سەرەمەرگدا ئەنجامی داوە بەو پێیەی کە ڕووداوەکە دەدرێتە پاڵ نزیکترین کاتی ".

[١] الهداية شرح بداية المبتدي مع تكملة فتح القدير ٤٢٣/١٠.

**ئەو حوكمانەی بیروڕایان تێیدا جیاوازە:**

١. بۆ ئەو كەسە نیە كەلەنەخۆشی سەرەمەرگیدا دەبەخشێت (المتبرع) پێش مردنی لەو بەخشینەی پاشگەز ببێتەوە، چونكە هەڵسو كەوتێكی پابەندكارە -لازم-، جگە لە خەڵات نەبێت پێش پێدانی [1]، بەڵام بۆ راسپاردنكار هەیە لەراسپاردنەكەی پاشگەز ببێتەوە هەركاتێك ویستی لەسەر بێت پێش مردنی، چونكە بەخشینێكە مەرجی مردنی لەگەڵدایە.

٢. بۆ قبولكردنی بەخشین لەنەخۆشی سەرەمەرگدا یان رەتكردنەوەی دەستبەجیٚ لەكاتێكدا كەبەخشەر لەژیاندایە ئەگەر هاتوو دوانەخرابوو بۆ پاش مردن، چونكە واپێویست دەكات هەڵسو كەوتێكی پابەندكارە -لازم- ، بەپێچەوانەی راسپیاردنەوە، چونكە لای زۆرینەی زانایان هیچ حوكمێك نیە بۆ وەرگرتنی یان رەت كردنەوەی پێش مردنی راسپاردنكارەكە.

٣. ئەگەر بەیەكەوە هاتن ئەوا بەخشینەكانی كاتی نەخۆشی سەرەمەرگ دەخرێتە پێش راسپاردنەوە، چونكە ئەو بەخشینانە بۆتە پابەندكار -لازم- كەلەكاتی ژیانی بەخشەرەكەیدا ئەنجام بدرێت بەپێچەوانەی راسپاردنەوە [2].

---

[1] لە (الخرشي على مختصر سيدي خليل في الفقه المالكي) (١٧٢/٨) هاتووە: "بەڵام ئەوەی نەخۆش لەكاتی نەخۆشیەكەیدا وەك خێر یان وەقف یان خەڵات بەخشیویەتی ئەوا پاشگەز بوونەوەیان تێدا نیە، حوكمەكەی وەك حوكمی راسپاردنە ".

لە (التاج المذهب-الفقه الزيدي-)(٣٥٩/٤) هاتووە: "پاشگەزبوونەوەی بۆ نیە لەو سەرمایانەی بەكاریان دێنێتو ئەوەی لە سێ یەك جێبەجێی دەكات لەكاتی نەخۆشیەكەیدا یان پاش چاكبوونەوەی، تەنها لەوانەدا نەبێت كە دەكرێت پاشگەزبوونەوە تێیدا، وەك خەڵات ئەمە ئەگەر هیچ رێگریەك روونەدا ".

[2] بۆ زانیاری زیاتر بروانە: المغني لأبن قدامة ٧٢/٦-٧٣.

## فەلسەفەی ڕەوایەتی ڕاسپاردن:

بەپێی بنەما گشتیەکان ڕاسپاردن ڕێگە پێنەدراوە، چونکە هەڵس و کەوتێکە بۆ کاتێك دواخراوە کەتێیدا ڕاسپاردنکار هیچ دەستەڵاتێکی بەسەر ئەو هەڵس و کەوتەدا نیە [1]، بەڵام پەروەردگاری کاربەجێ وەك جیاکردنەوە –استپناو– ڕێگەی پێداوە، بەڵکو هانیداوە ئەنجام بدرێت بەهۆی ئەو بەرژەوەندییەی کەتێیدایە بۆ ڕاسپاردنکارو ڕاسپاردن بۆ کراو.

بەرژەوەندی ڕاسپاردنکار: بریتیە لەو پاداشتەی لە ڕۆژی دواییدا بەدەستی دێنێت و [2]، ئەو پیاهەڵدان و ڕێزەی لەدونیادا پێی دەوترێت، لەوانەیە مرۆڤ ئەو کاتەی لەژیاندایە ئەنجامدانی کاری چاکەی لەدەست دابێت یان کەمتەرخەم بووبێت تێیدا، بەو ڕاسپاردنەی فریای ئەوە دەکەوێت کەلەدەستی چووە، یان کەمتەرخەمی تێدا کردووە [3]، سەرەڕای ئەوە بەو ڕاسپاردنەی پاداشتی کەسێك دەکات کەلەژیانیدا کارێکی جوانی لەگەڵ ئەم کردووە یان چاکەیەکی لەگەڵ کردووە لەکاتێکدا مەترسی هەیە سامانەکەی وەك بەخشینێکی دەست بەجێ پێ بدات، چونکە لەوانەیە ژیانی درێژە بکێشێت و پێویستی بەو شتە ببێت کە کردووەیەتیە ڕاسپاردن، لەم کاتەدا دەتوانێت لەڕاسپاردنەکەی پاشگەز ببێتەوە، بەڵام ناتوانێت لەبەخشینە بەرکارە لەسەر پێویست بووەکانیدا پاشگەز ببێتەوە [4].

بەرژەوەندی ڕاسپاردن بۆکراو: لەوانەیە کەسێکی هەژار بێت بەوەی ڕاسپاردن

---

[1] واتە کاتی پاش مردن.

[2] لە (بدائع الصنائع للكاساني) (٤٨٣٨/١٠) هاتووە: "بەپێوانەکردن ڕێگەدان دەخوازێت ئەمەش لەبەر ئەوەی مرۆڤ پێویستی بەوەیە کۆتا کارەکانی بەخزمایەتی زیاتر بێت لەوەی کەلە خزمایەتی پێشتر هەبووە"..

[3] لە (الخرشي) (١٦٧/٨) هاتووە: (فەلسەفەی ڕاسپاردن زیادکردنی تێشووی کارەکانە).

[4] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە (التركة وما يتعلق بها من حقوق)ی مامۆستای خوالێخۆشبوو (شيخ عبدالرحيم الكشكي) (رحمه الله) ص١٤٥ ودواتر.

کراوە بۆی پێداویستیەکانی پڕ بکاتەوە، یان ئەوەتا دامەزراوەیەکی خێرخوازییە کەبەرژەوەندی گشتی تێدایە وەك مزگەوتو، نەخۆشخانەو کتێبخانەی گشتی، بەمەش ئەو سامانەی کراوەتە راسپاردن لەسامانی تایبەتیەوە دەگۆڕێت بۆ سامانی گشتی، بەوەش هەمووان لێی سوودمەند دەبن.

یان ئەوەتا بەهۆی راسپاردنەوە قەرەبووی ئەوە دەکرێتەوە کەهەندێ لەمیراتیگرەکان لەمیراتیەکە لێی بێبەش دەبن، بەهۆی رێگریەکەوە وەك جیاوازی ئاین یان بەهۆی بەریەستێکەوە وەك بوونی میراتگرێکی نزیکتر، ئەمجا یەکێك لەفەلسەفەکانی راسپاردن ئەوەیە جێگەی میراتی دەگرێتەوە لەکاتی بێبەشبوونی میراتگرێکدا بەهەر هۆیەکەوە بێبەش بوبێت.

شایانی باسە کە ئیسلام هۆکاری زۆری دا‌ناوە بۆ ئەوەی تاکەکانی کۆمەلگا هاوکاری یەکتر بن لەدەستەبەری ئابووری، لەوانە زەکاتو وەقفو راسپاردن و... دەیان رێگەو هۆکاری تر کەگرنگی خۆیان هەیە لەدەستەبەری ئابووریو کۆمەڵایەتیداو، هاریکاری لەسەر چاکەو تەقوای تێدایە، بەشێوەیەکی تایبەتیش لەراسپاردندا سوودێکی زۆر بۆ کەسانی تر هەیە بەبێ ئەوەی زیانی مادی یان مەعنەوی بگات بە راسپاردنکار ئەو کاتەی لەژیاندایە.

## حوکمی جێبەجێکردنی راسپاردن:

زانایانی موسڵمان بۆچوونی جیایان هەیە سەبارەت بە دیاریکردنی جۆری حوکمی جێبەجێکردنی راسپاردن:

هەندێکیان وتوویانە واجبە [1] ، هەندێکی دیکەیان وتوویانە مستحبە [2]، هەیە رای

---

[1] لە (المحلى) (٣١٢/٩) هاتووە: "فەرزە لەسەر هەرکەسێك سامانی لێ بەجێمابێ.. بەپێی ئەم ئایەتە: ﴿من بعد وصية يوصي بها أو دين﴾، هەروەها ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((ما حق امرئ مسلم له شيء يوصي فيه تبيت ليلتين إلا ووصيته مكتوبة عنده)).

[2] نيل الأوطار ١٤٣/٦ سبل السلام. بلوغ المرام ١١٩/٢.

دیکەی هەبووە هەروەك ئەوەی بەدرێژی لەکتێبە فیقهیە ئیسلامیەکاندا باس کراوە، سەرەڕای ئەو جیاوازی بۆچوونە هاودەنگن لەسەر ئەوەی کە دەکەوێتە چوارچێوە پێنج حوکمە تەکلیفیەکە:(واجب، ندب، حرمە، کراهیە، ئیباحە) بەپێی ئەو شتەی کەکراوەتە بابەتی راسپاردنەکەو رەوشی راسپاردن بۆ کراو، هەروەك لێرەدا دەیخەینە روو:

١. پێویستە (واجبە): ئەگەر راسپاردنەکە بۆ جێبەجێکردنو گێڕانەوەی مافێکی خوای گەورە بوو کەلەئەستۆیدا بوو، یان ماف خەڵك، وەك ئەوەی راسپاردن بکات ئەو برە زەکاتەی لەسامانەکەیدا پێویست بووەو خۆی نەیداوە بدرێت بەوانەی پێیان دەشێت، یان ئەو قەرزانەی پەیوەندییان بەخۆیەوە یان سامانەکەیەوە هەیە بدرێتەوە، یان وەك راسپاردن بۆ میراتگرێك کەبەهۆی رێگیریەکەوە یان بەشبڕانەوە (بەپێی بۆچوونی هەندێ لەزانایان) میراتی ناکەوێت[1] .

٢. بەباشزانراوە (مستحبە): ئەگەر مەبەستی نزیکبوونەوە بوو لەخوای گەورە وەك راسپاردن بکات بۆ هەژارانو نەدارانو دامەزراوە خێرخوازییەکانو بۆ ئەو

---

[1] لە (المحلی)، سەرچاوەی پێشوو: "راسپاردن فەرزە لەسەر هەموو کەس کەسامانی لێ بەجێ بمێنێتو فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك کەراسپاردن بکات بۆ خزمانەی کەمیراتیان لێی پێنادرێت، ئەگەر راسپاردنیش نەکات ئەوا هەردەبێت پێیان بدرێت ". واتە راسپاردنەکە فەرز دەبێت با راسپاردنیش نەکات.

لە (المغني) (٦/١) هاتووە: "راسپاردن تەنها لەسەر ئەو کەسانە پێویست دەبێت کەقەرزیان لەسەرە یان شتێکیان لا دانراوە یان ئەرکێکی لەئەستۆدایە راسپاردن دەکات تا لێی دەربچێت، چونکە خوای گەورە گەڕاندنەوەی سپاردەکانی فەرز کردووە ".

لە (التاج المذهب) (٣٦٠/٤) هاتووە: "راسپاردنو شایەتیدان لەسەر کەسێك پێویست دەبێت کە سامانی هەیەو مافی کەسێك یان مافی خوای گەورەی لەسەرە ".

لە (تنویر الأبصار) (٦٤٨/٦)هاتووە: "بۆ زەکاتو کەفارەتو فدیەو رۆژوو نوێژ کە کەمتەرخەم بووە تێیاندا پێویست دەبێت، بۆ دەوڵەمەند بەباش زانراوە، بۆ کەسانی فاسق بەباش نازانرێت، جگە لەوانە بەباش زانراوە".

میراتگرانەی کە لای ئەو زانایانەی دان بە راسپاردنی پێویستدا نـانێن میراتیـان ناکەوێت [1].

٣. حەرامە: ئەگەر راسپاردن بۆ مەبەستێك كرابوو كە سەرپێچی فـەرمانی خـوای تێدا بوو [2] ، وەك راسپاردن بەناندانی ئەوانەی شـین‌و رۆرۆیانـەو پرسـەكارن‌و بەشدارانی تازێكەن، وەك ئەوەی لەژیانی رۆژانەماندا دەیبینین، هەروەها وەك راسپاردن بەمەبەستی زیانگەیاندن بەمیراتگران، قورئانی پیرۆز نـەهی كـردووە لەمەو خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرمووێت: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ﴾[3].

٤. باش نیە (مەكروهە): ئەگەر راسپاردنكار سامانی كەم بـوو منداڵیشـی زۆر بـوو، لێرەدا میراتگرانی بەهۆی ئـەو راسـپاردنەوە تووشـی هـەژاری‌و دەسـتكورتی‌و پێویستی دەبن، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) ئاماژەی بۆ كردووە، ئـەو كاتـەی بـە

---

[1] لە (الروضة البهية) (٥٥/٢) هاتووە: "راسپاردن بۆ خزمان پەسەندە ئیدی میراتگری بن یان نا، لەبەر ئـەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ... الآيـة﴾ لەبـەر ئـەوەی بـەجێهێنانی سیلەی رەحمی تێدایە.

لە (المغني) (٦/٢)هاتووە: "راسپاردن بەبەشـێك لەسـامان بـۆ كەسـێك سـامانی لێ بـەجێما كـارێكی چـاكی بەباشزانراوە چونكە ئایەتی: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ ...﴾ پێویست بوون تێیدا نەسخ بۆتەوەو بەپەسەند زانی بۆ كەسێك كەمیراتی پێنادرێت ماوەتەوە ". راسـتیەكەی ئەوەیـە كـەبوترێت ئایەتەكـە تایبەتمەنـد كـراوە لەبری نەسخ كراوە چونكە نەسخ لەقورئاندا نیە.

لە (التاج المذهب) (٤٠٣/٤) هاتووە: "راسپاردن لەلایەن ئەو كەسەی كەسامانی هەیەو قـەرزی هـیچ كەسـی لەسەر نیەو قەرزی خوای گەورەشی لەسەر نیە چاكە (ندب)ە، واتـە راسـپاردن بكـات بـە یـەك لەسـەر سێی ماڵەكەی كاتێ میراتگری هـەبوو، ئەگـەر میراتگـری نـەبوو بەهـەمووی بـۆ نزیكبوونـەوە لـەخواو بەحەج‌و خێرو دروستكردنی مزگـەوت‌و كانیـاوو پـەیمانگای زانسـتی‌و خـەرجكردنی بەسـەر قوتابیـانی زانست‌و مامۆستایاندا...".

[2] لە (المحلى) (٣٢٧/٩) هاتووە: "راسپاردن رێگەپێدراو نیە لەلایەن موسڵمانەوە یان ناموسڵمانەوە بێت بۆ كارێك سەرپێچی فەرمانی خوای تێدا بێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾

[3] النساء : ١٢

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصی فەرموو: ((ثلث والثلث كثير، إنك إن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تذرهم عالة[1] يتكففون[2] الناس)). [3]

واتە:( سێ یەك و سێیەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت باشترە لەوەی وایان بەجێ بهێڵیت دەست لەخەڵك پان بکەنەوە).

٥. ڕێگەپێدراوە (مباحه): ئەمەش بۆ جگە لەو چوار حاڵەتەی پێشوو دەبێت[4].

## سەرچاوەکانی حوکمی راسپاردن:

راسپاردن و حوکمەکانی چەندین سەرچاوەیان هەیە کەیەکەمیان قورئانی پیرۆزەو کۆتاکەشیان ژێرییەکی تەواوە:

أ- **قورئانی پیرۆز:** چەندین ئایەت لەقورئانی پیرۆزدا لەبارەی حوکمەکانی راسپاردنەوە هاتووە، لەوانە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[5].

بەپێی ئەم ئایەتە راسپاردن بۆ دایكو باوكو خزمان پێویستە، بەڵام پاش ئەوەی ئایەتەکانی تایبەت بەمیراتی هاتە خوارەوەو پشکەکانی هەر میراتگرێکی دیاری کرد

---

[1] کۆیەکەی (عائل) ئەویش واتە هەژار.

[2] واتە بە دەستیان لەخەڵکی دەپاڕێنەوە.

[3] متفق عليه. سبل السلام ١٣٧/٣.

[4] لە (العدوي علی الخرشي) (١٦٨/٨) هاتووە: "حوکمەکەیان دابەش دەبێت بۆ پێنج بەش: ئەگەر قەرز و هاشێوەی بوو ئەوا پێویست دەبێت، چاك (ندب) دەبێت بۆ خزمێك کەلەسەری پێویست نیە بیداتێ، رێگە پێنەدراوە بۆ حەرام بێت وەك شینو رۆرۆ و هاوشێوەکانی، کەراهەتی هەیە ئەگەر بۆ مونکەر بێت یان لەسامانێکی کەمدا بێت و موباحە ئەگەر بۆکارێکی موباح بوو..."

[5] البقرة : ١٨٠

بەڵام سەرچاوەکانی خودی راسپاردن بریتیە لە ویستی یەکلایەنە یان ئەو گرێبەستەی کەلە دوو ویست پێکهاتووە کەدواتر بەدرێژی لێی دەدوێن.

ئیدی حوکمەکەی تەنها بۆ ئەو کەسانە بوو کەمیراتگری نین، هەروەك لەفەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) جەختی لەسەر کراوەتەوە: ((إن الله اعطى كل ذي حق حقه، فلا وصية للوارث)).[1]

أ-سوننەتی پێغەمبەر: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموودەی زۆری هەیە سەبارەت بە راسپاردن و حوکمەکانی، لەوانە: ((إن الله تصدق عليكم بثلث أموالكم عند وفاتكم زيادة في حسناتكم)).[2]

ب-کۆدەنگی زانایان: زانایانی شەریعەت لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە تا ئێستاش هاودەنگ بوون لەسەر ئەوەی کە راسپاردن لەسنووری سێ یەکدا بەپەسەند زانراوە-مستحبه-، ئەگەر مەبەست پێی نزیك بوونەوە لەخوای گەورە بێتو پایەو مەرجەکانی تێدا بێتە دی.

ت-ژیری-المعقول-: ژیری ساغ ئەوە دەخوازێت کەمرۆڤ وای پێویستە کۆتا کارەکانی کارێکی چاکە بێت بیخاتە سەر کارەچاکەکانی رابردووی، بە راسپاردن قەرەبووی ئەوە بکات کە کەلەرابردوودا کەمتەرخەمی تێدا کردووەو لەدەستی چووە.

## رووەکانی لێکچوون و جیاوازی لەنێوان راسپاردن و میراتیدا:

راسپاردن وەك میراتیە لەوەدا کەخاوەندارێتی بەهۆیەوە ناگوازرێتەوە بۆ راسپاردن بۆ کراو تا پاش مردنی راسپاردنکارەکە، بەڵام لەهەندێ حوکمدا جیاوازیان هەیە، لەوانە:

[1] رواه احمد والأربعة إلا النسائي، وحسّنه أحمد والترمذي ورواه الدار قطني من حديث ابن عباس، وزادة في آخره "إلاّ أن يشاء الورثة" سبل السلام ٣/١٣٨.

[2] رواه الدار قطني وأخرجه احمد والبزار من حديث ابي درداء. سەرچاوەی پێشوو ٣/١٤٠.

١. گوێزرانەوەی خاوەندارێتی میراتی بۆ میراتگران بەویستی خوای گەورەیە، ویستی هەریەك لەمیراتیلێگیراو میراتیگر رۆڵی تێدا نیە، بەم پێیە بڕیاردانی میراتلێگیراو بەبێ بەشکردنی میراتگرێکی بەتاڵەو کاری پێ ناکرێت.

٢. بنیچنەی میرات خزمایەتی یان هاوسەرگیرییە لەکاتێکدا بوونی ئەم بنچینانە بۆ راسپاردن مەرج نیە، چونکە ویستی تاك لایەنە سەرچاوەیەتی، راسپاردنکار بۆی هەیە بۆ هەر کەس بیەوێت راسپاردن بکات، بەڵام راسپاردنەکەی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام نەبێت.

٣. خاوەندارێتی میراتگرەکان بەر لەدابەشکردن بەشێوەی کۆبەش-شیوع-ە، بەپێچەوانەی راسپاردن بۆ کراوەوە، کەلەوانەیە بەشێوەی کۆبەش بێت، ئەمە ئەگەر بەرێژەیەکی دیاریکراو بوو وەك سێ یەك یان چوار یەك...لەوانەشە جیاکراوەو دیاریکراو بێت وەك ئەوەی راسپاردن کراوەکەماڵێنەیەکی دیرایکراو بێت، وەك خانووەکەی یان ئۆتۆمبێلەکەی یان هەر شتێکی دیکە دیاریکراو یان سوودلێوەرگرتن بێت.

٤. جیایی ئاین رێگرێکە لەرێگیریەکانی بەرکەوتنی میراتی بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر دروی خوای لێبێت: ((لا یتوارپ أهل الملتین))، واتە: پەیروانی ئاینی جیا میراتی لێك ناگرن، هەروەها بەپێی کۆدەنگی زانایان، بەپێچەوانەی راسپاردنەوە، رێگەدراوە موسڵمان راسپاردن بۆ ناموسڵمان بکات، بەهەمان شێوە دەکرێت ناموسڵمانیش راسپاردن بۆ موسڵمان بکات.

پاش ئەم پێشەکیە دەست دەکەین بەلێکۆڵینەوە لەپێکهاتەو حوکمەکانی راسپاردن لەدوو باسدا کەیەکەمیان تەرخان دەکەین بۆ پێکهاتەکانی، دووەمیش بۆ حوکمەکانی.

# باسی یەکەم
# پێکهاتەکانی راسپاردن
# (عناصر الوصیة)

مەبەست لەپێکهێنەرەکان بریتیە لەپایەو مەرجەکان، ئەمەش لەپێناسەی بابەتەکەوە وەردەگیرێتو، پێناسەی راسپاردنیش بەوەی کە:" هەڵسوکەوتە لەمیراتیدا بەڵام دواخراوە بۆ پاش مردن، مەبەستەکەشی خاوەندارێتیەکی بێ بەرانبەرە"، لەم پێناسەوە ئەوە دەردەکەوێت کەئەم هەڵسوکەوتە ناتوانرێت مەبەستە شەرعیەکانی تێدا بێتە دی بەبێ هاتنەدی ئەم چوار پێکهاتەیە کەئەوانیش:
شێوە–صیغە–و، راسپاردنکارو، راسپاردن بۆکراوو، راسپاردن پێکراو.
ئەم پێکهاتانەش زانایانی مالیکی[1] و شافیعی[2] ناویان ناوە پایەکان، لەسەر ئەو بنەمایەی کەپایەی هەرشتێك ئەوەیە کەلەسەری دەوستێتو، بەبێ بوونی ئەو ناکرێت بوونی هەبێت.
وەك شوێن پێ هەڵگرتنی ئەو زانا پایەبەرزانە توێژینەوەی ئەم پێکهاتانەو مەرجەکانی بۆ چوار دەروازە دابەش دەکەین، بەمەبەستی زیاتر سوود لێوەرگرتنو روونکردنەوەیو پاشتر هەر پێکهاتەیەك بەدەروازەیەکی سەربەخۆ دەخەینە روو.

---

[1] الخرشي ١٦٧/٨. "پایەی دووەم راسپاردن بۆکراوە".

[2] لە (مغني المحتاج ٣٩/٣) هاتووە: "پایەیەکانی راسپاردن چوارن: راسپاردنکار و راسپاردن بۆ کراوو راسپاردن پێکراوو شێوەی ".

# دەروازەی یەکەم

## شێوەی ڕاسپاردن

## (صيغة الوصية)

شێوەی ڕاسپاردن بریتیە لەو دەربڕینانەی کە ڕاسپاردنکار ڕاسپاردنەکەی پێ دەردەبڕێت [1]، یان دەنووسێت، یان ئاماژەی پێ دەکات، مەرجە بۆ ئەو شێوەی کە ڕاسپاردنکار ویستی خۆی پێ دەردەبڕێت بە لێدوان یان نووسین ئەگەر توانای قسەکردن یان نووسینی هەبێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا ڕاسپاردنەکەی بەئاماژە کەلێی تێبگەن لێ وەردەگیرێت، ئەو کەسەی توانای قسەکردن و نووسینی هەیە ئەگەر ویستی دەتوانێت ڕاسپاردنەکەی بەوتن بێت یان ئەگەر ویستی ڕاسپاردنەکەی دەتوانێت بەنووسین بێت، بەڵام لای زۆرینەی زانایان[2] ڕاسپاردن بە ئاماژە وەرناگیرێت با لێشی تێبگەن.

ئەو کەسەی توانای نووسینی هەیەو توانای قسەکردنی نیە ڕاسپاردنەکەی بەنووسین دەردەبڕێت، لاڵیش کە توانای نووسینی نەبێت ڕاسپاردنەکەی بەئاماژەی ڕوون دەبێت کە گوزارشت لەمەبەستی ڕاسپاردنەکەی بکات [3].

---

[1] وەك ئەوەی بڵێت ڕاسپاردن دەکەم فلانە خانووم کەلە فلانە گەڕەکە بدرێت بەفلان کەس یان بە نیشتەجێبوون تێیدا، یان ئەوەندە پارەم بۆ فلان کەس بێت، یان بڵێت ڕاسپاردنم کردووە سێ یەك یان چواریەکیماڵەکەم یان پێنج یەکی بۆ فلان کەس بێت.

[2] لای زانایانی مالیکی دەکرێت ڕاسپاردن بەئاماژەیەك کەلێی تێ بگەن، با ڕاسپاردنکار توانای قسەکردن و نووسینیشی هەبێت ل ە (الخرشي (١٦٧/٨)) هاتووە: "بەدەبڕین یان ئاماژە ئەوە پایەی سێیەمن کەئەویش شێوەی دەربڕینە، ئەوەی کەڕاسپاردن بە دەبڕینی ڕوون بێت وەك ئەوەی بڵێت ڕاسپاردنم کرد یان دەکرێت بەدەربڕینێکی ناڕوون بێت کەبەهۆی ئاماژەوە لەویستی ڕاسپاردنکار بزانرێت، با توانای قسەکردنیشی هەبێت"

[3] یاسادانەری میسری (م٢) وسوری(م٢٠٨) کاریان بەم ڕیزبەندیە کردووەو، یاسادانەری عێراقی خۆی لەقەرەی شێوە ڕاسپاردن نەداوەو تەنها بە ڕێسا گشتی یەکان و فیقهی ئیسلامی ڕازی بووە کە سەرچاوەیە بۆ هەر شتێك کەلەیاسای باری کەسیدا بەدەق نەهاتبێت.

## رازیبوونی بە راسپاردن (قبول الوصیة):

زانایانی موسڵمان هاودەنگن لەسەر ئەوەی ڕەزامەندی دەربڕین –ایجاب–ی راسپاردنکار پێویستە، چونکە بەکۆی دەنگیان پایەیە، بەڵام بۆچوونیان جیایە لە رۆڵی رازیبوون پێی‌و دیاریکردنی شێوازەکەی، ئایا بەهەمان شێوە ئەویش پایەیە یان مەرجە، پاشان ئایا مەرجی دروستی یەتی یان مەرجی پێویستبوون (لزوم)؟ یان نەمەرجە نە پایەیە؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە پێویستە ئەوەی جێی ناکۆکیە دیاری بکەین تا بۆمان روون بێتەوە کەلەسەرچی هاودەنگن‌و، لەسەر چی بۆچوونیان جیایە.

**یەکەم: بۆچوونی زۆرینەی زانایانی موسڵمان لەسەر ئەم پابەتانە یەکە:**

١. شێوەی راسپاردن کە راسپاردنکار راسپاردنەکەی پێ ئەنجام دەدات لەوتن یان ئەوەی جێی دەگرێتەوە لەنووسین یان ئاماژە پایەی راسپاردنن‌و، لە زاراوەی فیقهی‌و یاسایدا دەستەواژەی ڕەزامەندی دەربڕین "الأیجاب"ی پێ دەوترێت.
٢. راسپاردن گرێبەستێکە پێش مردنی راسپاردنکارو رازیبوونی راسپاردن بۆ کراو پابەندکار –ملزم– نیە، بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر راسپاردنکار کەلەژیاندا بوو لێی پاشگەز بوویەوە، یان پاش مردنی راسپاردنکار لەلایەن راسپاردن بۆ کراوەوە بۆی دەگەڕێندرێتەوە.
٣. رازیبوون نەپایەیە نە مەرجە بۆ دروستی لەکاتێکدا کە راسپاردن بۆ کراوان کەسانێکی دیاری کراو نەبوون، وەك هەژاران، یان کەسێکی مەعنەوی وەك مزگەوت‌و تەواوی دامەزراوە ئاینی‌و خێرخوازییەکان کە بۆ بەرژەوەندی گشتی کار دەکەن [1].

[1] لە (الخرشي) (١٦٩/٨): هاتووە: "راسپاردن ئەگەر بۆ کەسێکی دیاریکراو کرا وەك زەید بۆ نمونە ئەوا رازیبوونی پێی پاش مردنی راسپاردنکار مەرجە بۆ پێویست بوونی، بەڵام ئەگەر بۆ کەسی نادیار بوو وەك هەژاران، ئەوا رازیبوون لەلایەن ئەوانەوە مەرج نیە".
←

٤. هەریەك لە پێ ڕازیبوونو ڕەتکردنەوە کاریان پێ ناکرێت تا پاش مردنی ڕاسپاردنکار[1].

٥. ڕاسپاردن بۆ کەسێکی دیاریکراو یان چەند کەسێکی دیاریکراو نابێتە گرێبەستێکی پێویست بوو پاش ڕازیبوون نەبێت ئیدی ڕازیبوونەکە بەئاشکرا بێت یان بەمانا پاش مردنی ڕاسپاردنکار.

٦. ئەگەر ڕاسپاردن بۆ کراو پاش ڕاسپاردنکار مرد پێش ڕازیبوون یان ڕازینەبوون، میراتگرێکی دەچێتە جێگەی لە ڕازیبوون یان ڕازینەبوونیدا، چونکە هەموو مافێك کەخاوەن مافەکەی مرد مافەکە بەتاڵ نابێتەوە بەهۆی مردنیەوە بەڵکو دەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکانی، بەم پێیەش ئەگەر میراتگرەکان ڕەتیان کردەوە ئەوا بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر پێی ڕازیبوون ئەوا ڕاستە، ئەگەر میراتگرەکان کۆمەڵێك بوون ئەوا ڕازیبوون یان ڕەتکردنەوە دەبێت لەهەموویانەوە بێت، ئەم حوکمەش چەسپاوە تەنانەت لای ئەوانەش کەدەڵێن

---

لە (المهذب) (٤٥٢/٢) هاتووە: "ئەگەر ڕاسپاردن بۆ کەسێك بوو کەدیاری نەکرابوو ئەوا بەمردنی پێویست دەبێت چونکە ناکرێت پاش مردن ڕازیبوون بەهای بۆ دابنرێت لەبەر ئەوەی ناتوانرێت لەهەموویاندا ئەوە بێتە دی".

لە (المغني) (٢٥/٦) هاتووە: "ئەگەر بۆ کەسانی دیاری نەکراو بوو وەك هەژاران و نەداران و ئەوانەی نەدەکرا بزانرێت چەندن یان بۆ بەرژەوەندی بوو وەك مزگەوت پێویستی بە ڕازیبوون نیەو پاش مردنی پێویست دەبێت ".

لە (الروضة البهیة) (٣٢/٢) هاتووە: "ئەوەی کە ڕازیبوون تێیدا پێویستە ئەوەیە دیار بێت نەك دیار نەبوو وەك هەژاران یان زانایان یان مزگەوتو پرد".

[1] لە (المهذب) (٤٥٢/١)هاتووە: "ڕازیبوون ڕاست نیە تا پاش مردن، چونکە ڕەزامەندی دەربڕین— ایجاب— پاش مردنەو ڕازیبوونەکەش دەبێت پاش مردنی بێت ".

هەندێك لەزانایان وەك زەیدیەکان لە (التاج المذهب ٣٨٣/٤) وتوویانە: ڕازیبوون لەکاتێکدا ڕاسپاردنکار لەژیاندا بێت کاری پێدەکرێت، ڕەتکردنەوەش تەنها لە دانیشتنی ڕاسپاردنەکەدا یان پاش ئاگاداربوون لێی دەستبەجێ کاری پێدەکرێت، مالیکیەکانیش بەهەمان شێوەیان وتووە هەروەك دواتر لێی دەدوێین، بەڵام زۆرینەی زانایان بۆچوونیان وایە ڕازیبوونو ڕەتکردنەوە پێش مردنی ڕاسپاردنکار وەرناگیرێت.

رازیبوون پایەیە[1] .

**دووەم: بۆچوونیان جیایە لە پێگەی شەرعی رازیبووندا:**

١. لای ئەبو حەنیفەو دوو هاوەڵەکەی (ئەبو یوسفو محمد –رەحمەتی خوایان لێبێت): رازیبوون پایەیە یان پێدانو رازیبوون پێکەوە پایەی راسپاردنن، تا رازیبوون نەیەتە دی ئەم پایەیە نەهاتۆتە دی، بەڵام دەتوانرێت رازیبوونەکە تەنها بەمانا بێت وەك وەڵام نەدانەوە[2] .

٢. لای زۆرینەی زانایان: رازیبوون نە پایەیە نەبەشێك لەپایەو نەمەرجی دروستیە، بەڵکو مەرجی پێویست بوونە، چونکە موڵکی راسپاردن بۆ کراو وەك موڵکی میراتگر وایە پاش مردن دێتە دی، جا هەروەك چۆن دووەمیان پێویستی بەرازیبوون نیە بەهەمان شێوە یەکەمیش پێویستی نیە.

[1] لە (بدایة المبتدي والهدایة وتکملة فتح القدیر) (١٠/٤٢٩)هاتووە: "ئەوەی کراوەتە راسپاردن بەرازیبوون پێی دەبێتە موڵکی لەیەك بابەتدا نەبێت ئەویش مەگەر راسپاردنکار بمرێتو راسپاردن بۆ کراویش پێش رازیبوون بمرێت، لێرەدا ئەوەی کراوەتە راسپاردن وەك بەباشزانین (استحسان) دەچێتەوە ناو موڵکی میراتگرەکانو بە قیاسیش ئەو راسپاردنە بەتاڵ دەبێتەوە، وەك ئەوەی خستمانە روو کە موڵکەکە راوەستاوە لەسەر رازیبوون، وەك مردنی کڕیاری لێ نێت پێش رازیبوونی بەو شتەی کەلەلایەن فرشیارەوە پێی بدرێت.
رووکاری باشێتی: راسپاردن لەلایەنی راسپاردنکارەوە بەمردنی بەتەولوەتی دادەمەزرێت و لەلایەن ئەوەوە هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو دەبێتە مافێکی راگیراو بۆ راسپاردن بۆ کراو، ئەگەر مرد ئەوا دەبێتە موڵکی ئەو، هەروەك فرۆشتنی بەمەرج کەتێیدا کڕیار سەرپشك بێت ئەگەر پێش مۆڵەتدانەکە بمرێت.
رووکاری پێوانە (القیاس): "رازیبوون یەکێکە لە دووپایەکەی گرێبەستو بەمردن بەسەر دەچێتو پایەکەی دیکە بەتاڵ دەکات، هەروەها ئەگەر فرۆشتنەکە پێویست بوو پاشان پێش رازیبوون مرد یان خەڵاتەکە پێویست بوو پاشان خەڵات پێدرلو پێش رازیبوون مرد ئەوا پێویستە بەتاڵ بکرێتەوە ".

[2] لە (بدائع الصنائع) (١٠/٤٨٤١)هاتووە: "بەڵام پایەی راسپاردن بۆچوونی جیاواز هەیە تێیدا: سێ هاوەڵەکەمان –رەحمەتی خوایان لێبێت– وتوویانە پێدانو رازیبوونە، ئەگەر بتەوێت دەڵێیت پایەی راسپاردن پێدانە لەلایەن راسپاردنکارەوەو بێ وەڵامی لەلایەن راسپاردن بۆ کراوەوە ".

بەم پێیە بابەتی راسپاردنەکە لە بەرواری مردنیەوە دەبێتە مولکی راسپاردن بۆ کراوو رازیبوونیش کاریگەری پێشخۆیی –اثر رجعي– دەبێت ئەگەر هاتوو بەلگەیەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێت، بۆ یە بەرهەمو بەروبوومو سوودەکانی بۆ دەبێت[1]، نەفەقەکەشی لەسەر دەبێت زۆربەی یاسای ولاتە عەرەبیەکان بەم ئاراستەیەدا چوون[2].

[1] لە (الخرشي) (١٦٩/٨) هاتووە: "ئەگەر پاش مردنەکەی زوو یان دوای ماوەیەکی زۆر رازیبوو، ئەو بەروبومەی پاش مردن و پێش رازیبوونی بووە بۆ راسپاردن بۆ کراوە، چونکە بەمردنەکەی خاوەندارێتیەکەی گوێزرلوەتەوە بۆی".
لە المهذب (٤٥٢/١) هاتووە: "ئەگەر بۆ شتێکی دیاریکرلو بوو کە تەنها رازیبوونی پێویست بوو، لەبەر ئەوەی خاوەندارێتی شتێکی دیاریکراوە، لەکەسەکەی دیکە تەنها جگە لە رازیبوون هیچی دیکەی پێویست نەکردووە ".
لە (الروضة البهية )(٤٣/٢) هاتووە: "لە رێگە پێدانانەکانی پاشگەزبوونەوەی راسپاردنکار مادام لەژیاندلیەو بەهەمان شێوە راسپاردن بۆ کرلویش لەژیاندایە بەهەمان شێوە ئەگەر پاش مردنی پێی رازی نەبوو ئەوە لەگرێبەستە رێگەپێنەدراوە پابەندنەکارەکانە–.

[2] مادە (٢٠)ی یاسای راسپاردنی میسری : "راسپاردن بەرازیبوون پێی لەلایەن راسپاردن بۆ کراوەوە بەراشکاوی یان نا راشکاوی پاش مردنی راسپاردنکار پێویست دەبێت ".
مادە (٢٣٠) ی یاسای سوری: "ئەگەر راسپاردن بۆ کرلو لەکاتی مردنی راسپاردنکاردا هەبوو، ئەوا شایانی راسپاردن پێ کراوەکەیە لەکاتی مردن راسپاردنکاردا ئەمە ئەگەر لەراسپاردنەکەدا دەقێك نەبوو کە شایستەبوونی ئەو مافە لەکاتێکی دیاریکرلودا بسەلمێنێت پاش مردنی، زیادە بووەکانی ئەوەی کراوەتە راسپاردن بۆ راسپاردن بۆ کراو دەبێت لەکاتی مردنداو لەسەر راسپاردن بۆکراو پێویستە خەرجیەکانی راسپاردن بۆ کراوەکەی بکێشێت لەکاتی مردنی راسپاردنکارەوە ".
فەصلی(١٨١) تونسی: "راسپاردن بۆ کرلو شایستەی راسپاردنەکەیە لەگەڵ ئەوەی لێی زیادبووە لەکاتی مردنی راسپاردنکارەکەوە.
مادە(٢٠٨)لە (مشروع القانون العربي الموحد): "شێوازەکەی بریتیە لە پێدان ئیدی یان ئەوەتا راسپاردن بۆکرلو رازی دەبێت ئەمەش مەرجە بۆ پێویست بوونی ".

زانایان دوو بۆچوونیان هەیە:

یەکەمیان: رازیبوون مەرجە بۆ دروستی [1].

دووەمیان: بەرەهایی مەرج نیە نەبۆ دروستی نەبۆ پێویست بوون [2].

ئـەوەی کـەبوترێت رازیبـوون مەرجـە بـۆ دروسـتیەکەی ئـەوا راسـپاردن بـۆ کـراو شایستەی ئەو زیادەیە نابێت پاش رازیبوون نەبێت، رازیبوونیش کاریگەری پێشـووی نیە، هەر بۆیە زیادبوونو سـوودی پێشـتری ئـەو ماڵـەی کراوەتـە راسـپاردن لـەنێوان مردنو رازیبوونەکەدا موڵکی میراتگرەکانـە، لەسـەریان پێویسـتە خـەرجی راسـپاردن پێکراوەکە بکێشن لەو ماوەیەدا.

بۆچوونی پەسەند بەرای من ئەوەیە کە راسپاردن گرێبەستێکە بەویستی یەکلایەنە دادەمەزرێت، چونکە لە گرێبەستەکانی بەخشینەو گرێبەسـتێکی ناپەبەنـدکارە—غـیر لازم— چونکە رێگە دراوە بە پاشگەزبوونەوە تێیـدا هـەرکاتێك راسـپاردنکار بیـەوێت، بەڵام لەرووی واتاوە بەستراوەتەوە بەمەرجێکەوە کەوەك مەرجی راگرتن وایە لەرووی باشـێتیەوە کەئـەویش رازیبوونـە بەراشـکاوی یـان ناراشـکاوی، وەك مـەرجی هەڵوەشـاندنەوەش وایـە لـەرووی خراپیـەوە کەئـەویش رەتکردنەوەیـە، بـۆ هـەردوو مەرجەکەش کاریگەری پێشتر هەیە دەگەرێتەوە بـۆ کـاتی مردنـی، ئەگـەر رازیبـوون راشـکاوانە یـان ناراشـکاوانە (وەك بێـدەنگ بـوون یـان وەڵام نەدانـەوە) روویـدا ئـەوا خاوەندارێتی راسپاردن بـۆ کـراوە لـەکاتی مردنـی راسـپاردنکارەوە دەبێـت، بەمـەش بـەروبوومو ئـەنجامو بەرهەمەکـەی بـۆ دەبێـت، لەسەریشـی پێویسـتە خـەرجی ئـەو

---

[1] لە (المغني)ی أبن قدامة (٦/٢٥) هاتووە: "ئەگەر رازیبوو ئەوا بـۆی دەچەسـپێت موڵکایەتیەکـەی لـەکاتی رازیبووەنەکەوە لە (صحیح)ی مەزهەبەکەیدا واتە مەزهەبی ئەحمەد— ئەمەش گوتـەی مالیـكو خـەڵکی عێراقە ".

[2] لە (المهذب) (١/٤٥٣)هاتووە: "بۆچوونی سێیەمی ئیمامی شافیعیان گێڕاوەتەوە لـە( ابـن عبـدالحکم) کـە راسپاردن پێکراوەکە بەمردنەکە دەبێت بەموڵکی ".واتە موڵکایەتیەکە جێگیرەو پێویستی بە رازیبوونی راسپاردن بۆکراو نیە.

ماوەیە بدات کەدەکەوێتە نێوان مردنی راسپاردنکارو رازیبوونی راسپاردن بۆ کراوەوە، بەو پێیەی کە مەرجی راگرتن کاریگەری پێشتری هەیە، هەندێ لەیاسا عەرەبیەکانیش [1] هەرئەمەیان وتووە ، بەڵام ئەگەر راسپاردن بۆ کراو راسپاردنەکەی رەت کردەوە ئەوا رەتکردنەوەکە بەمەرجی هەڵوەشێنەرەوە دادەنرێت بەپێی کاریگەری لەپێشترو راسپاردنەکە وادادەنرێت کەهەر نەبووە.

**پاشگەزبوونەوە لە راسپاردن:**

راسپاردنکار پاش بڕیاری پێدانی رێگەی پێدراوە لەراسپاردنەکەی هەمووی یان بەشێکی پاشگەز ببێتەوە بەراشکاوی یان بەناراشکاوی بەپێی یەکدەنگی زانایانی موسڵمانو یاسا دانراوەکان، ئەم پاشگەز بوونەوەش لەدوو رووەوە پاساوی بۆ دەهێنرێتەوە:

یەکەمیان: بەخشینەو هێشتا نەدراوە، چونکە بەمردنی راسپاردنکارەکە تەواو دێتە دی، بەخشینی تەواویش وەك دیاری وایە پاشگەز بوونەوە تێیدا رێگە پێدراوە، ئەگەر تەواو نەبوویوو ئەوا پاشگەزبوونەوەی تێدا لەپێشترە لەو.

دووەمیان: رازیبوون لەسەر مردنی راسپێریکارەکە وەستاوەو، ئەو پێدانەی رازیبوون لەسەری نیشان نەدراوە دەتوانرێت لێی پاشگەز ببێتەوە لەفرۆشتنی بەبەرانبەردا– هەروەك فرۆشتن، جا پاشگەزبوونەوە لەبەخشینەکاندا لەپێشترە لەو [2].

---

[1] وەك تونسی فەصلی (١٨١)و سوری (م٢٣٠).

[2] بداية المبتدي والهداية مع تكملة فتح القدير ١٠/٤٣٦. الخرشي ٨/١٧٢.

ڕەتکردنەوەی ڕاسپاردن:

بۆ ڕەتکردنەوەی ڕاسپاردن لەلایەن ڕاسپاردن بۆ کراوەوە، یان لەلایەن بریکاریەوە ئەم درێژەیە هەیە:

أ. ئەگەر ڕەتکردنەوەکە پێش مردنی ڕاسپاردنکارەکە بوو ئەوا بەهەڵوەشاوە دادەنرێتو کاری پێناکرێت، چونکە ڕاسپاردن هێشتا نەهاتۆتە دی، هەروەها چونکە ڕاسپاردن بۆکراو تا ئەو کاتەی ڕاسپاردنکار لەژیاندا بێت نەبۆتە خاوەنی ئەوەی ڕاسپاردن کراوە بۆی، بۆیە مافی ڕەتکردنەوەشی نیە وەك هاوبەشێك (شفیع) ئەگەر لە مافە هاوبەش(شفعە)ە کەی خۆش ببێت پێش فرۆشتنی.

ب. ئەگەر ڕەتکردنەوەکە پاش مردنو پێش ڕازیبوون بوو ئەوا دروستەو ڕاسپاردنەکە هەڵدەوەشێتەوە.

ج. ئەگەر ڕەتکردنەوەکە پاش ڕازیبوونو پێش وەرگرتنی بوو ئەوا بەتاڵە، ئەمە ئەگەر بابەتی ڕاسپاردنەکە پێوراو یان کێشراو نەبوو، چونکە خاوەنداریتی ڕاسپاردن بۆکراو لەو کاتەوە بووە بۆ ڕاسپاردن پێکراوەکەو ڕەتکردنەوەکە وەك ڕەتکردنەوەی هەموو ئەو شتانە وایە کەهەیەتی [1].

بەڵام ئەگەر میراتگرەکانی ڕاسپاردنکار ڕازیبوون بەو ڕەتکردنەوەیە.ئەوا ڕاسپاردنەکە دەگۆڕێت بۆ دیاری لە ڕاسپاردن بۆ کراوەوە بۆ میراتگرەکانی ڕاسپاردنکار، ئەم گۆڕانە پێویستی بەمەرجەکانی دیاری هەیە بۆ هەردوولا (پێدەرو پێدراو).

د. ئەگەر ڕەتکردنەوەکە پاش ڕازیبوونو پێش وەرگرتنی بوو بابەتی ڕاسپاردنەکەش پێوراو یان کێشراو بوو، ڕەتکردنەوەکە دروستە چونکە خاوەنداریتی ڕاسپاردن بۆ کراو بەسەر کێشراوو پێوراودا ناچەسپێت تەنها

[1] المغني ٦/٢٢-٢٣.

بەرازیبوون‌و پێش وەرگرتن‌و جیاکردنەوەی، ئەمەش وەك رەتکردنوەیە پێش رازیبوون.

ه. راسپاردن بۆ کەسانی دیارینەکراو وەك هەژاران رەت ناکرێتەوە بەوەی یەکێکیان رەتی بکاتەوە.

و. رەتکردنەوەی راسپاردن بەش بەشکردن قبول دەکات، دەکرێت هەندێك لەراسپاردنەکە یان هەندێك لەوانەی راسپاردن کراوە بۆیان رەتی بکەنەوەو، تەنها بۆ گەڕاوەکەو رەتکەرەوەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

ز. راسپاردن بۆ کەسی ئاسایی دیاریکراو ئەگەر خاوەن ئەهلیەتی تەواو بوو بەرەتکردنەوەی رەتکراوەتەوە.

ح. بێدەنگبوون بە رەتکردنەوە دانانرێت بەڵکو بەرازیبوون ئەژمار دەکرێت، ئەگەر ماوەیەك تێپەڕی کەبەپێی نەریت بەس بوو بۆ رازیبوون لەکاتێکدا کەئاگاداربوو بەراسپاردنەکە بۆی‌و بەمردنی راسپاردنکارو ئەهلیەتی رەتکردنەوەی هەبوو. رازیبوونە ئەگەر شتێك نەبوو بیسەلمێنێت بێدەنگبوونەکە رازیبوون نەبووە، لێرەشدا بۆ میراتگرەکان هەیە داوای لێ بکەن یان رازی بێت یان رەتی بکاتەوە، ئەگەر رێگربوو لەهەریەکەیان ئەوا حوکمی رەتکردنەوەی دەبێت، چونکە موڵکەکە دودڵی تێدایە لەنێوان ئەوو میراتگرەکاندا، وەك ئەوەی زەویەك بەکرێ بگریت‌و پاشان نەچیت بیچێنیت [1].

گ. ئەگەر راسپاردن بۆکراو پێش راسپاردنکار مرد ئەوا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوەو میراتگرەکانی ناچنە شوێنی.

یاسادانەری عێراقی نەچووە بەلای ئەم حوکمانەدا، بەڵکو دادوەری گێڕاوەتەوە بۆ لای فیقهی ئیسلامی، ئەمەش بەپێی مادەی یەکەم لەیاسای باری کەسیی.

---

[1] المهذب ١/٤٥٣.

## رههایهتی و كۆتوبهندی شێوهی راسپاردن (اطلاق وتقييد صيغة الوصية):

راسپاردن هەڵسوكەوتێكی دواخراوە بۆ پاش مردن، ئەو شێوازەشی ئەم هەڵسوكەوتەی پێ ئەنجام دەدرێت، بۆیە دەكرێت رەها بێتو هیچ كۆتو بەندێكی[1] تێدا نەبێت، وەك ئەوەی بڵێت راسپاردنم كردووە ئەو شتە بدرێتە فلان كەس، دەشكرێت بەسترابێتەوە بەمەرجێكەوە كەبەرژەوەندیەكی رەوای بۆ راسپاردنكار یان راسپاردن بۆكراو تێدا بێت، یان بۆ لایەنی سێیەم، بەهەمان شێوە دەكرێت ببەسترێتەوە بەكارێكەوە كەئەگەری رووداني هەبێت لەداهاتوودا، وەك لێرەدا باسی دەكەین:

أ. ئەو مەرجەی كەلەبەرژەوەندی راسپاردنكار بێت، وەك ئەوەی بڵێت راسپاردن دەكەم ئەو خانووەم بدرێت بەفلان كەس، بەو مەرجەی ئەركی پەروەردەو فێركردنی منداڵەكانم بگرێتە ئەستۆی پاش مردنم.

ب. ئەوەی لەبەرژەوەندی راسپاردن بۆكراو بێت، وەك ئەوەی بڵێت راسپاردن دەكەم ئەو خانووەم بدرێتە فلان لایەن بەو مەرجەی هەستێت بەتۆژەنكردنەوەیو چاككردنەوەی كەموكورتیەكانی خانوەكە لەمیراتیەكەم...

ج. لەبەرژەوەندی كەسی سێیەم بێت وەك ئەوەی بڵێت راسپاردن دەكەم كە باخەكەم بۆ فلانە كەس بێت بەو مەرجەی مافی هاوسێیەتی (حقوق الارتفاق) بدات بەدراوسێكەی.

لەهەموو ئەو حاڵەتانەدا مەرجەكە پابەندكار(ملزم)ەو دەبێت رەچاو بكرێت، بەڵام ئەگەر مەرجەكە لەگەڵ مەبەستی راسپاردنەكەدا یەكی نەدەگرتەوە، یان لەگەڵ مەبەستەكانی شەریعەتدا ناكۆك بوو، ئەوا هەڵوەشاوەیەو كەس پێوەی پابەند ناكرێت، وەك ئەوەی بڵێت راسپاردن دەكەم ئەو خانووەم بدرێتە فلانە كەس بەومەرجەی سوودی لێ وەرنەگرێت، یان بەومەرجەی تالەژیاندایە ژن نەهێنێت.

---

[1] المهذب ١/٤٥٢– ٤٥٣.

زانایانی شەریعەت هیچ دژایەتیەکیان نەبووە لەگەڵ کۆتو بەندکردنی راسپاردن بەمەرجی دروست، جگە لەزاهریەکان کەوتویانە هەر مەرجێك لەقورئاندا نەبێت بەتاڵە[1].

بەبۆچوونی من ئەم قسەیەی زاهریەکان لای زۆر کەس بەهەڵە راڤە کراوە، مەبەستی زاهریەکان ئەوە نیە کەمەرجەکە بەدەق لەقورئاندا هاتبێت، بەڵکو مەبەستیان ئەوەیە کەنابێت مەرجەکە پێچەوانە بێت لەگەڵ ئەوەی لەقورئاندا هەیە، بەمەش جیاوازیەکی سەرەکی لەنێوان زانایانی زاهریو زانایانی دیکەدا نامێنێتەوە.

یاسادانەری عێراقی خۆی نەداوە لەقەرەی ئەوەی پەیوەندی هەیە بەرەهایەتیو کۆتوبەندکردنی شێوەی راسپاردنەوە، بەڵکو بۆ بنەما گشتیەکان وازی لێهێناوەو دادگای حەواڵەی فیقهی ئیسلامی کردووە.

**شێوەی راسپاردن:**

زانایانی شەریعەت[2] بۆچوونیان جیاواز نیە سەبارەت بەوەی کەنووسینی راسپاردن بەباش زانراوە (مستحبة)، چونکە جۆرێکە لەگرێبەستەکانی بەخشین، تێیدا ماف کەڵەکە دەبێت بۆ راسپاردن بۆ کراو لەوەی کراوەتە راسپاردن بۆیو ئەو پابەندیانەشی دەکەوێتە ئەستۆی میراتگران کەدەبێت جێبەجێی بکەن، هەروەها لەبەر ئەوەی نووسینی راسپاردن بەفەرموودەیەکی پێغەمبەریش (ﷺ) چەسپاوە کەدەفەرموێت: ((ما حق امرئ مسلم له شيء يوصي فيه يبيت ليلتين إلا ووصيته مكتوبة عنده)).[3]

---

[1] المحلى ٣٤٢/٩.

[2] جگە لەزاهریەکان کەنووسینی لای ئەوان پێویستە (واجب) لەسەر ئەو بنەما سەرەکیەی کە دەڵێت هەموو فەرمانێك بۆ پێویست بوونە.

[3] لەگێڕانەوەیەکی دیکەدا (يريد أن يوصي فيه) بیەوێت راسپاردن تێدا بکات.. سبل السلام ١٣٤/٣. ماناکەشی ئەوەیە کەموسڵمان پێویستە بەئاگا بێتو ئامادە بێت و راسپاردنەکەی لەو شتەی کەهەیەتی دەیەوێت راسپاردن تێدا بکات نووسیبێتیو لای خۆی دلینابێت.

واتە: مافی هیچ کەسێکی موسڵمان نیە کە شتێکی هەبێت راسپاردنی تێدا بکات و دوو شەو لەجێگادا بمێنێتەوە دەبێت راسپاردنەکەی لای خۆی نووسببێت.

بەڵکو جیاوازیەکەیان لەوەدایە کەتەنها نووسین داواکراوە، یان ئەوەتا مەرجە شایەتیشی لەسەر بگیرێت، ئەوانەی وتوویانە: تەنها نووسین داواکراوە لەگەڵ مۆرکردنی یان واژۆ کردنی یان پەنجەمۆر کردنی ئاماژەیان بەم فەرموودەیە کردووە کەباسی شایەتی تێدا نەکراوە.

ئەوانەشی کە وتوویانە نووسین دەبێت شایەتی لەگەڵدا بێت بەڵگەیان بەم ئایەتە هێناوەتەوە: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِنْكُمْ[1] أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنْتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ[2] فَأَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةُ الْمَوْتِ﴾.[3]

ئەوانەی بۆچوونی یەکەمیان هەیە پێیان وایە ئەو حوکمەی لەو ئایەتەدا هاتووە تایبەتە بەحاڵەتی سەفەر [4].

هەندێکی دیکە درێژتر لێی دواون: وتوویانە هەریەك لەنووسین‌و شایەتی پێویست(واجب)ن ئەگەر ئەوەی کرابووە راسپاردن مافی کەسی تری تێدابوو راسپاردنی کرد بدرێتەوە، ئەمەش بۆ پاراستنی نەفەوتانی مافی خوای گەورەو مافی مرۆڤەکانە [5].

بەڵام لەهەموو ئەگەرەکاندا: ئیدی نووسین بەتەنها داواکرابێت یان لەگەڵ شایەتی، یاخود داواکردنەکە بۆ واجب بێت یا باشتر بوون (استحباب) ئەوا زانایانی شەریعەت

---

[1] واتە لە پەیرەوانی ئاینەکەتان بێت، هەروەك زۆرینەی راڤەکاران وایان لێك داوەتەوە، یان لەکەسە نزیکەکانتان بێت هەروەك هەندێکی دیکە راڤەیان کردووە، تفسیر الرازي ١٢٢/١٢.

[2] واتە کەئێوە لەسەفەردا بوون.

[3] سورة المائدة/١٠٦.

[4] سبل السلام ١٣٥/٣.

[5] التاج المذهب ٣٦٠/٤.

هاوده‌نگن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ ئه‌و شێوه‌یه‌ ته‌نها له‌پێناوی سه‌لماندنی‌و نه‌فه‌وتانی مافه‌كان پێویسته‌، ده‌نا راسپاردن راست‌و دروسته‌ به‌ره‌هایی ئیدی رواڵه‌تیه‌كه‌ هه‌بێت یان نا [1].

**هه‌ڵوێستی یاسادانه‌ری عێراقی له‌ رواڵه‌ته‌كه‌ی:**

یاسادانه‌ری عێراقیش له‌ره‌وتی زانایانی شه‌ریعه‌ت لای نه‌داوه‌ له‌وه‌ی كه‌ رواڵه‌تی به‌مه‌رج داناوه‌ بۆ سه‌لماندنی راسپاردنه‌كه‌ نه‌ك راست‌و دروستیه‌كه‌ی [2]، هه‌روه‌ك له‌م ده‌قه‌ یاساییانه‌دا هاتووه‌:

ماده‌ (٦٥)ی یاسای باری كه‌سیی [3]:

١. راسپاردن به‌های نابێت مه‌گه‌ر نووسرابێت‌و له‌لایه‌ن راسپاردنكاره‌وه‌ واژۆ یان مۆر یان په‌نجه‌مۆر كرابێت [4]، خۆ ئه‌گه‌ر هاتوو راسپاردن پێكراو خانوبه‌ره‌ بوو یان سامانێكی گوێزراوه‌ بوو نرخه‌كه‌ی له‌پێنج سه‌د دینار زیاتر بوو پێویسسته‌ له‌دادنووس راستاندنی بۆ بكرێت [5].

---

1 المغني ٦/٩٦، الخرشي ٨/١٩٠.

2 دادگای پێداچوونه‌وه‌ له‌بریاری ژماره‌ ٦٧٣ و٢١٧/ شرعیة/ ٩٧٠ في ٢٠/١٠/١٩٧٠ بریاریدا كه‌: "راستاندنی راسپاردن لای دادنووس مه‌رج نیه‌ بۆ راست‌و دروستیه‌كه‌ی به‌پێی ماده‌ (٦٥)ی یاسای باری كه‌سیی به‌ڵكو هۆكارێكه‌ بۆ سه‌لماندنی".

3 ژماره‌ (٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩ هه‌مواركراو.

4 له‌ ماده‌ (٦٥) وا ده‌خوێندرێته‌وه‌ كه‌ ئه‌وه‌ی كراوه‌ته‌ راسپاردن، ئه‌گه‌ر سامانێكی گوێزراوه‌ بوو نرخه‌كه‌ی له‌پێنج سه‌د دینار كه‌متر نه‌بوو، ئه‌وا راسپاردنه‌كه‌ به‌به‌ڵگه‌ی نووسراوی واژۆكراو له‌لایه‌ن راسپاردنكاره‌وه‌ یان به‌مۆری خۆی مۆركرابێت یان په‌نجه‌مۆری كرابێت ده‌سه‌لمێندرێت، به‌ڵام ئه‌مه‌ به‌ره‌هایی وه‌رناگیرێت، به‌ڵكو پێویسته‌ ئه‌م كاره‌ به‌ئاماده‌بوونی فه‌رمانبه‌ری گشتی یان ئاماده‌بوونی دوو شایه‌ت كه‌ واژۆیان له‌سه‌ر قه‌واڵه‌كه‌ كردبێت به‌پێی ماده‌ (٤٢)ی یاسای سه‌لماندن (الإثبات)ی ژماره‌(١٠٧)ی ساڵی ١٩٧٩.

5 ئه‌م ماده‌یه‌ ئێستا له‌رووی كارپێكردنه‌وه‌ وه‌ك هه‌ڵوه‌شاوه‌ ولیه‌، چونكه‌ راسپاردن له‌لایه‌ن دادگاوه‌ رێكده‌خرێت.

٢. دەتوانرێت لەڕێگەی شایەتەوە راسپاردن بسەلمێندرێت، ئەگەر رێگریەکی مادی هەبوو کەرێگریوو بەڵگەیەکی نووسراو دەست بکەوێت [1].

لەمادە (٦٦)یشدا هاتووە: "ئەو راسپاردنەی لەلایەن دادگاکانو فەرمانگە تایبەتمەندەکانەوە رێکخراوە جێبەجێکراو دەبێت ئەگەر کەسانی پەیوەندیدار پێوەی نارازی نەبوون لێی".

لە مادە (٢٤٩)ی یاسای تۆمارکردنی خانوبەرەدا هاتووە [2]:

١. تۆمارکردنی ئەو مافەی خاوەندارێتی خانوبەرە کە لەراسپاردندا هاتووە ئیدی راسپاردنەکە بەوجۆرە بوو کە موڵکایەتیەکەی پێ بدات یان بەپێدانی نرخی خانوبەرەکە، یان بەچواریەکی خانوبەرەکە پاش مردنی راسپاردنکار، ئەمەش بەپێی بڕیارەکانی دادگا کە پلەی بنبڕیان وەرگرتووە یان پاساوە شەرعیەکانو، راسپاردن رێکخراو لەدادنووس، ئەمە ئەگەر کەسە پەیوەندارەکان پێوەی نارازی نەبوون.

٢. ئەگەر نارەزایەتی لەسەر راسپاردنێك دەربڕا کەپشت بەستوو بەبڕیاری دادگا نەبوو، ئەوا نارەزایی دەربڕ دەبێت لەماوەی سی رۆژ لەبەرواری پێڕاگەیاندنیەوە سەردانی دادگای تایبەتمەند بکات، بەکۆتایی هاتنی ئەو ماوەیەو نەبوونی هیچ ئاگادارکردنەوەیەك لەلایەن دادگاوە کەتۆمارکردنەکە

---

[1] دادگای پێداچوونەوە بەبڕیاری ژمارە ( ٢٨٢/ شرعیە أولى/ ٩٧٢ ق ٢٨/٤/١٩٧٤) بڕیاریدا کە: "رێگە پێدراوە سەلماندنی راسپاردن بە بەڵگەی کەسیی، ئەگەر راسپاردنکار داوای کردبوو دادنووس ئامادەبکرێت لەونەخۆشخانەی کە تێیدا هێڵدراوەتەوە بەمەبەستی تۆمارکردنی راسپاردنەکەیو پێش ئەوەی ئەو کارە ئەنجام بدرێت مرد بەجۆرێك کە بەرێگری مادی دابنرێت کە نەهێڵێت بەڵگەی نووسراو بەدەست بهێنرێت ئەوا رێگەپێدراوە بەشاهێد بسلەمێنرێت".

[2] ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٧١. دادگای پێداچونەوەش لەبڕیاری (٢٢١/ هيئة عامة أولى/ ١٩٧٧)دا هاتووە کە: "ئەگەر هەڵسوکەوتەکەی نەخۆش لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بەشێوەی موڵکیەت پێدان ئەنجام درابێت، ئەوا راسپاردنەکە بەبێ پێویستی تۆمارکردنی لەدادنووس کاری پێدەکرێت، با پەیوەندی بەخانوبەرەوەش هەبێت. (م١١١١ من القانون المدني)".

رابگیرێت تێیدا، ئەوا تۆکارکردنەکە بەپێی بەڵگەنامەی پێشەکەش کراو ئەنجام دەدرێت.

٣. تۆمارکردنی راسپاردن پێویستی بەبڕیاری میراتگرەکان نیە مەگەر زیاتر بێت لە سێ یەکی میراتیەکە، لەم حاڵەتەدا پێویستە رەزامەندیان وەربگیرێت لەسەر تۆمارکردنی ئەوەی کەلەسێ یەکەکە زیاترە.

٤. رێگەپێدراوە راسپاردن لەتۆماری خانوبەرە تۆمار بکرێت ئەو کاتەی راسپاردنکار لەژیاندایەو رێگە نادرێت هیچ هەڵسوکەوتێکی خانوبەرەیی لەسەر ئەو مافە ئەنجام بدرێت کەکراوەتە راسپاردن مەگەر بەپێی یاسا راسپاردنەکە هەڵبوەشێتەوە.

٥. لەم دەقە یاسایانەوەو دەقی دیکەشەوە ئەوە دەخوێندرێتەوەکە: راسپاردن بەپێی تێڕوانینی یاسا هەڵسوکەوتێکی یاساییە یەك لایەنە (راسپاردنکار) ئەنجامی داوە، ئەگەر ئەو هەڵسوکەوتە لەسەر خانوبەرە بوو ئەوا خاوەندارێتیەکەی لەراسپاردنکارەوە دەگوێزێتەوە بۆ راسپاردن بۆ کراو پاش مردنی راسپاردنکار[1]، چونکە هەڵسوکەوتێکە ئەنجامدانەکەی بۆ پاش مردنی مردنی دواخراوە، ئەمەش یەکێکە لەهۆکارەکانی خاوەندارێتی، لەرێی راسپاردنەوە راسپاردن بۆکراو سامانەکەی راسپاردنکار[2] بەدەست دێنێت، راسپاردنیش دەکەوێتە ژێر واتای گشتی هەڵسوکەوت (تصرف) لەمادە (٣)ی یاسای تۆمارکردنی خانوویەری بەرکاردا[3]، لەبەر ئەوە دەبوو راسپاردن بەخانووبەرە دروست نەبوایە پاش تۆمارکردنی نەبێت لەتۆماری خانوبەرە،

---

[1] مادە (٦٤)ی یاسای باری کەسیی بەرکار.

[2] مادە (١١٠٨)ی یاسای مەدەنی بەرکار.

[3] مادە (١/٣): "هەڵسوکەوت بەخانوبەرە بریتیە لە هەموو هەڵسوکەوتێك کەببێتە هۆی دامەزرانی مافێك لەمافە ماڵینە بنەڕەتیەکان یان شوێنکەوتەکان یان گوێزانەوەی یان گۆڕینی یان لابردنیو هەموو هەڵسوکەوتێکی بڕیاردراو بۆ مافێك لەو مافانەی باسکران ".

بـەڵام وەك لـەو دەقانـە دەخوێندرێتـەوە کەتۆمارکردنەکـە لـەکاتی نووسـینی راسپاردنەکەدا نایەتە دی، بەپێچەوانەی هەڵس‌و کەوتەکانی دیکە بەخانوبـەرە لەنێوان زیندوواندا، بەڵکو پاش مردنی راسـپاردنکارو رازیبـوونی راسـپاردن بـۆ کراو دەبێت‌و، پرۆسەی تۆمارکردنەکە ئەگەری هەڵوەشاندنەوەی هەیـە ئەگـەر راسپاردنکار پێش مردنی لەراسپاردنەکەی پاشگەز بوەوە، یـان راسـپاردن بـۆ کراو پاش مردنی راسپاردنکار راسپاردنەکەی رەتکردەوە.

بەم پێیە تۆمارکردنی ئەو راسـپاردنەی کەخانوبـەرەی تێدایـە لـەکاتی نووسـینیدا بەپایەیەك لەپایەکانی یان مەرجێك لەمەرجەکانی راست‌و دروستی دانانرێت [1].

لەگەڵ ئەوەشدا رێگەدراوە راسپاردن لەتۆماری خانوبەرە تۆمار بکرێت ئەو کاتەی راسپاردنکار لەژیاندایە بەمەبەستی دڵنیابوون لـەدانانی، لـەم حاڵەتـەدا رێگـە نادرێـت بەراسپاردنکار هەڵس‌وکەوت بەو مافانەی بکات کردویەتیە راسـپاردن، مەگـەر بـەپێی یاسا راسپاردنەکەی هەڵوەشاندبێتەوە [2].

لەگەڵ ئەوەشدا پاش مردنی راسپاردنکار تۆمارکردن مەرجە بۆ سەلماندن نەك بـۆ بەستنی، چونکە راسپاردن تەنها بەمردنی راسپاردنکارو رازیبـوونی راسـپاردن بـۆکراو بەجێبـەجێکراو دادەنرێـت و شـوێنەوارە یاسـاییەکانی دەبێـت، چـونکە راسـپاردنی رێکخراو لەلایەن دادگاکان‌و فەرمانگە تایبەتمەندەکانەوە توانای جێبەجێکرانی هەیـە، ئەگەر هاتوو کەسە پەیوەندارەکان نارەزایەتیان لەسەری نەبووە.

فەرمانگەکانی تۆماری خانوبەرەش پشتی پێدەبەستێت لەتۆمارکردنی راسپاردندا بەبێ وەرگرتنی دانپیانان، هەروەها بەیەکێك لەقەواڵەکانی جێبەجێکردن دادەنرێت.

---

[1] بەدەر لە مادە (٢/٣)ی یاسای تۆماری خانوبەرە کە تێیدا هاتووە: مامەڵەی خانوبەرە نابەسترێت تـا ئـەو کاتەی لەفەرمانگەی تۆماری خانوبەرە تۆمار دەکرێت.

[2] بڕوانە (شرح قانون التسجيل العقاري)ی مصطفى مجيد، ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٧١.

# دەروازەی دووەم
## راسپاردنكار و مەرجەكانی
## (الموصي وشروطه)

راسپاردنكار ئەو كەسەیە كەهەستاوە بەهەڵس‌وكەوت لە لێجێماوەكەیدا بەجۆرێك كە جێبەجێكردنەكەی پاش مردنیەتی، ناوەڕۆكەكەشی خاوەندارێتییە بەبێ بەرانبەر.

راسپاردنكار كەسی ئاساییە، بەپێچەوانەی راسپاردن بۆكراوەوە كەشدەكرێت كەسی ئاسایی بێت‌و دەكرێت كەسی حوكمی (مەعنەوی) بێت، بۆ ئەوەی راسپاردن راست‌و دروست بێت پێویستە ئەم چوار مەرجە لە راسپاردنكاردا بێتە دی:

**مەرجی یەكەم: شیاو -اهل- بێت بۆ بەخشینی سامان و ئەوەی پەیوەندی هەیە پێوەی [1]، بەوەی بالغ و عاقڵ بێت، چونكە راسپاردن بەخشینە.**

ئەم مەرجەش لەفیقهی حەنەفی[2] و فیقهی زاهری[1] و یاسای باری كەسیدا

---

[1] بەپێی یاساكانی عێراق كەسێك هەژدە ساڵ تەواو بكات‌و هیچ ناتەواوێتیەك لەناتەواوەتیەكانی شایان بوونی تێدا نەبێت یان تەمەنی پازدە ساڵی تەواوكردبێت‌و بەمۆڵەتی دادگا ژنی هێنابێت بەپێی برگەی (أ) لەمادەی سێیەمی یاسای چاودێری نەوجەوانان، دەبێتە شایانی ئەوەی شت ببەخشێت، زۆرینەی زانایانی شەریعەتیش وایدەبینن كەهەموو كەسێكی باڵغی عاقڵ شایانی ئەوەیە ببەخشێت ئەگەر ناتەواویەك لەناتەواویەكانی شایان بوون -اهلیە- نەبوو، راسپاردنی ئەو كەسەش دروستە كەفەرمانی بەندكردنی هەتاهەتایی یان كاتی بۆ دەركراوە هەرچەندە تا ئەو كاتەی فەرمانی بەندكردنەكەی تەواو دەكات بەناتەواوی شایان بوون دادەنرێت، لەبەڕێوەبردنی سامانەكەی‌و هەڵس‌و كەوت كردن پێوەی بێبەش دەكرێت تەنها بۆ وەقف‌و راسپاردن نەبێت، ئەمەش بەپێی هەردوو مادەی (٩٧، ٩٨) یاسای سزادان.

[2] لە (البدائع) (١٠/٤٨٤٧): "راسپاردنی منداڵی عاقڵ بەتاڵە ئیدی پێش باڵغ بوونی بێت یان دوای، چونكە بەبەتاڵی كراوە‌و ناگۆڕێت بۆ ڕێگەپێدراو، چونكە راسپاردن وەك بازرگانی نیە، لەكاتێكدا بازرگانی گۆڕینەوەی سامانە بەسامان خۆ ئەگەر راسپاردن دواخرا بۆ پاش تێگەیشتن (ادراك) راست نیە چونكە دەستەواژەكەی بەراستی بەكارنەهێنراوە.

باسکراوە[٢] ، بەڵام زۆرینەی زانایانی شەریعەت بۆ ئەوە چوون کە راسپاردنی منداڵی هەراش (صبي ممين) کەبیەوێت بەهۆیەوە لەخوای گەورە نزیک بێتەوە دروستە، چونکە کارێکی چاکەیەو پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، ئەگەر ئەوە نەکات ئەوا سامانەکەی دەچێت بۆ میراتگرەکانی بەبێ ئەوەی پاداشتی پێ بگات، هەروەها لەبەر ئەوەی هەڵس و کەوتێکی سوودمەندانەی تەواوە بۆ منداڵە هەراشەکە، هەروەک نوێژی سوننەت و رۆژووی سوننەت وایە، جگە لەوە خاوەندارێتیەکەی ناڕوات تا دوای مردنی، بۆیە لەرووی مادەیەوە تا لەژیاندایە هیچی لەدەست ناچێت.[٣]

سەرچاوەی ناکۆکیەکە: راجیایی زانایان لە سروشتی راسپاردندایە کەئایا وەک هەموو بەخشینەکانی دیکە وایە یان جیاوازە لێیان.

ئەوانەی بۆچوونیان وایە راسپاردن جیاوازە لە هەموو بەخشینەکانی دیکە بەوەی کە راسپاردنکار تا لەژیاندا بێت خاوەندارێتیەکەی بۆ دەمێنێتەوە، هیچ شتێکی ماددی لەدەست ناچێت، سەرەڕای ئەو پاداشتەی کەلەرۆژی دواییدا بەدەستی دێنێت، ئەمانە رایان وایە راسپاردن منداڵی هەراش دروستە، چونکە هەڵس و کەوتێکی

---

١ له (المحلی) (٩/٣٣٠): "راسپاردن رێگە نەدراوە بۆ ئەو پیاوو ژنانەی باڵغ نەبوون ".

٢ مادە (٦٧): "مەرجە راسپاردنکار شیاو بێت بۆ بەخشین ".

٣ لەفیقهی مالیکیدا ، (الخرشي) (٨/٢٦٨): "دروستە راسپاردنی کەسی ئازادی خاوەن شتەکە با نەزان و بچوکیش بێت ".

له فیقهی شافیعیدا، (مغني المحتاج) (٣/٣٩): "راسپاردن دروستە لە مێردمنداڵی هەراشەوە هەروەک لە (الاملاء)دا باسی کردووەو هەموو هاوەڵانی پەسەندیان کردووە، هەروەها لەبەر ئەوەی دەستبەجێ خاوەندارێتیەکەی لەدەست نادات و پاش مردنی پاداشتی بۆ هەیە".

له فیقهی حەنبەلیشدا، (المغني) (٦/١٠١): "ئەو کەسەی تەمەنی دە ساڵانی تێپەڕاند راسپاردنەکەی رێگەدراوە ئەگەر لەگەڵ حەقدا بێت، ئەمەش لای ئەحمەد دەقی لەسەر هاتووە ".

له فیقهی جەعفەریشدا، (الروضة البهية) (٢/٤٥): "سەبارەت بەراسپاردنی ئەو کەسەی تەمەنی گەیشتە دەساڵ رایەکی بەناوبانگە لەنێو هاوەڵاندا ".

یاسادانەری مەغریبیش بۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەریعەتی لەرێگەپێدانی راسپاردنی مێردمنداڵی هەراشدا لەفەصلی (١٧٥)دا هاتووە: "مەرجە راسپاردنکار کە هەراش بێت ".

سوودمەندانەیە سوودێکی تەواو، لەبەر ئەوە پێویستی بەمۆڵەتی باوان (ولی) یان راسپێر (وصی) نیە.

ئەوانەشی راسپاردنیان وەك هەڵس و کەوتێکی زیانبەخش سەیر کردووە، لەبەر ئەوەی خۆبەخش و بێ بەرانبەری ماددییەو، پاداشتەکەشی هەر بەو رێژەیەیە کە بەجێی بهێشتایە بۆ میراتگرەکانی، لەبەر ئەوە وەك هەموو بەخشینەکانی دیکە وایە، ئەمانە وتوویانە بەتاڵەو هەروەها خەڵات و چاکە(هبەو صدقە) و هەڵس و کەوتە زیانبەخشەکانی دیکەی بەتاڵە کەزیانی تەواویان هەیە.

**لەدەستدانی شیاویی راسپاردنکارو شوێنەواری لەسەر راسپاردنەکەی پاش دانانی:**

زانایانی شەریعەت هاوڕان لەسەر راست نەبوونی راسپاردنی شێت لەکاتی شێت بوونیدا، هەروەها راسپاردنی منالی ناهەراش (صبي غير ممين)و، ئەوانەی لەحوکمی ئەماندان.

بەلام بۆچوونیان جیاوازە لەوەی کاتێ راسپاردنکار راسپاردنەکەی داناوە لەتەواوی شیاویدا بوو بێت، پاشان شیاویەکەی لەدەست دابێت لەبەر هۆکارێك لەهۆکارەکان وەك شێتبوون و تێکچوون، بەمجۆرە:

أ. زۆرینەی زانایان وتوویانە: نەمانی شیاویی راسپاردنکار کاریگەری نیە لەسەر راسپاردنەکەی ئەگەر هاتوو لەکاتێکدا ئەنجامی دابوو کە تەواو ساغ بوو، ئەمەش وەك پێوانەکردنی بەتەواوی هەڵس و کەوتەکانی دیکەی لە وەقف و خەڵات و فرۆشتن و بەکرێدان و مامەڵەی دیکە.

ب. هەندێك لەزانایانی حەنەفی و ئەوانەی شوێن ئەوان کەتوون وتویانە: راسپاردن هەڵس و کەوتێکی پابەندکار –لازم– نیەو نابێتە پێویست و جێبەجێکراو پاش مردنی راسپاردنکارو رازیبوونی راسپاردن بۆکراو نەبێت، ئەگەر شیاوێتی رازیبوونی تێدابوو، هەموو هەڵس و کەوتێکی نا پێویست ئەوەی بۆ دامەزراندنی پێویست بوو بێت بۆ مانەوەشی پێویستە، لەبەر ئەوەی شێتبوون بەربەستەو

ئەوەی لەحوکمیدا بێت ڕێگرە لەدامەزرانی ڕاسپاردنەکە، بەهەمان شێوە ڕێگر دەبێت لەبەردەوامبوونی ڕاستیەکەی‌و مانەوەی، ئەگەر هاتوو پاش دانانی ڕوویداو ئەو شێتبوونە جێبەجێ بووبوو [1] ئیدی پەیوەندی هەبوو بەمردنی ڕاسپاردنکارەکەوە یان پێش مردنی هاتەوەهۆشی خۆی [2].

بەمجۆرە تاوتوێی بۆچوونی زۆرینەی زانایان دەکەین: پێوانەکردنی لەگەڵ تەواوی هەڵسوکەوتەکان پێوانەکردنە لەگەڵ هەبوونی جیاوازی، بەهۆی جیاوازی سروشتی وەقف‌و خەڵات‌و فرۆشتن‌وو بەکرێدان... چونکە ئەو گرێبەستانە دەبێتە جێبەجێکراوی پێویست لەچرکەساتی بەستنیەوەو گرێبەستێکی ڕاستە، سەرەڕای ئەوە ڕاسپاردنکار مافی پاشگەزبوونەوەی هەیە لەڕاسپاردنەکەی‌و ئەگەری ئەو پاشگەزبوونەوەیە هەیە ئەگەر لەدەستدانی شیاویی لەئارادا نەبێت، چونکە بەبەتاڵ دادەنرێت ئەگەر پاش دانانەکەی شیاوێتی لەدەستدا.

**هەڵوێستی یاسادانەری عێراقی:**

یاسادانەری عێراقی پەیڕەوی بۆچوونی حەنەفیەکانی کردووە لەبەتاڵکردنەوەی ڕاسپاردن بەهۆی ڕێگری شێتبوونەوە، بەڵام بۆ بەتاڵکردنەوەکە کردویەتیە مەرج کەشێتیەکە پەیوەندی هەبێت بەمردنیەوە، لەمبارەیەوە لەمادە (٧٢)ی یاسای باری کەسییدا هاتووە کە بەتاڵ دەبێتەوە (ڕاسپاردن) بەهۆی لەدەستدانی شیاوی (ڕاسپاردنکار) کەتامردنی درێژە بکێشێت.

---

[1] له (تنوير الأبصار وشرحه الدر المختار مع رد المحتار) (٦/٤٤٣): "کەسێك ڕاسپاردنی کردو پاشان شێت بوو، ئەگەر شێتبوونەکە شەش مانگی خایاند ئەوا بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر وانەبوو بەتاڵ نابێتەوە، بەهەمان شێوە ئەگەر ڕاسپاردنی کردو پاشان تووشی دوودڵی بوو بووە دەبەنگ".

[2] الفتاوى الهندية ٦/٩٢.

یاسـای بـاری کەسـیی هەنـدێ لەوڵاتـە عەرەبیـەکانیش هـەمان ئاراسـتەیان وەرگرتووە[1].

**راسپاردنی گەوج ( وصية السفيه ):**

گەوج ئەو کەسەیە کەسامانەکەی بەرێکوپێکی سوود لێ وەرناگرێتو بەپێچەوانەی عەقڵو شەرعەوە دەستبڵاوی تێدا دەکات.

زۆرینـەی زانایـانی موسـڵمان وتویانـە راسـپاردنی گـەوج دروسـتە -بـا دەستبەسەراگرتن (حجر)شی لەسەر بێت- لەبەر ئەم هۆکارانە:

أ. گـەوج بەرپرسـە لـە هەڵسوکەوتـەکانیو لـەرووی شـەرعو یاسـاوە قسـەکانی کارپێکراوەو، توانای تێگەیشتنی مەبەستو دەرئەنجامی ئـەو قسـەو کارانـەی هەیە کەئەنجامیان دەدات.

ب. ئەو سامانەی کراوەتە راسپاردن خاوەندارێتیەکەی ناگوێزرێتەوە بۆ راسپاردن بۆکراو تا پاش مردنی راسپاردنکار، گـەوج بـۆی هەیـە بەشـێك لەسامانەکەی بکاتە راسپاردن بۆکەسێك یان دامەزراوەیەکی خێرخوازی کە لەژیانیدا بـەهۆی ئەو راسپاردنەیەوە هیچ زیانێکی مادی یان مەعنەوی پێنەدەگەیشت.

ج. لەبەر ئەوەی گەوج پرساو -مکلف-ەو بەرپرسە لەهەڵسوکەوتەکانی، لەسـەر کـاری خـراپ سـزا دەدرێـتو بۆکـاری باشـیش پاداشـت دەکرێـت، پێویسـتی بـەکاری چـاکەیە، وەك هـەر کەسـێکی دیکـەی بـاڵغی عـاقڵی تێگەیشـتوو، دادپـەروەری تێدا نیە لەپاداشتو چاکەی راسپاردنەکەی بێبەش بکرێت (م[2]).

---

[1] یاسای راسپاردنی میسری بەرکار (م١٤): "راسـپاردن بـەهۆی شـێتبوونی راسـپاردنکارەوە شـێتبوونێکی تەولو بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر پەیوەندی بەمردنەوە هەبوو". گۆڤـاری بـاری کەسـی تونسـیش فەصـلی (١٩٧) و سوری (م٢٢) و(مشروع القانون العربي الموحد للأحوال الشخصية) (م٢/٢٣٤).

[2] لە (المغني) (١٠٢/٦): "بەڵام ئەو کەسەی لەبەر گەوجێتی دەستبەسەر -محجور-ە ئەوا راسـپاردنەکەی بەپێوانە بەبۆچوونی ئەحمەد دروستە، چونکە راسپاردنەکەی بەبێ مەترسی سوودی بۆی هێناوە لەبەر ئەوە وەك هەموو پەرستشەکانی دروستە".

←

د. شایانی باسە زانایانی حەنەفی‌و زاهری سەرەڕای ئەوەی وتویانە راسپاردنی مێردمناڵی هەراش راست نیە، دەڵێن: راسپاردنی گەوج دروستە، ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خوای لێبێت) وای نابینێت رێگە پێدراو بێت گەوج دەستبەسەر بکرێت بەو پێیەی رەچاوکردنی رێزی مرۆڤ لەپێشترە لەرەچاوکردنی سامانەکەی.

بەڵام هەردوو هاوەڵەکەی وتویانە: راسپاردنی گەوجی دەستبەسەر -محجور- بەتاڵە وەك پێوانەکردن بەتەواوی بەخشینەکانی دیکە، بەڵام وەك ئیستیحسان بەراست دادەنرێت، ئەگەر مەبەستی لێی کاری چاکەو نزیکبوونەوە بوو لەخوای گەورە، چونکە راسپاردن لەپێناوی چاکەو باشەدا لەسنووری سێیەکدا زیانی پێناگەیەنێت، چونکە پاش مردنی جێبەجێ دەکرێت، بەهەمان شێوە میراتگرەکانیشی زیانیان پێناگات چونکە مافی ئەوان لەکاتی بوونی راسپاردندا لە یەك لەسەر سێ تێناپەڕێت، پاشان گەوجیش پرساوە و ئەگەری هەیە ئەرکی شەرعی لەدەست چووبێت بەشێك لەوە کەلەدەستی چووە بەو راسپاردنە قەرەبوو دەکاتەوە.

بەڵام زاهریەکان وتویانە راسپاردنی ئەو کەسەی لەزاراوەی فەقیهەکاندا پێی دەوترێت (سفیه) گەوج دروستە، چونکە بەبۆچوونی ئەوان گەوج نیە، ئەوان دەڵێن: قورئانی پیرۆز وشەی (سەفیه) گەوجی تەنیا بۆ ئەو کەسانە بەکارهێناوە کەباوەڕیان

---

لە (الخرشي) (١٦٨/٨): "راسپاردنی هەراشی خاوەن شت دروستە با گەوج‌و بچوکیش بێت، چونکە لەبەر مافی کەسانی دیکە دەست بەسەرن ".

لە(المهذب) (٤٥٠/٢): "ئەگەر مێرد منداڵێکی هەراش بوو یان بالغی (گەوج)بوو دوو بۆچوون لەبارەیەوە هەیە:

یەکێکیان: دروست نیە راسپاردنی چونکە هەڵسوکەوتە لەساماندا ئەوەش بۆ مێرد منداڵ‌وگەوج دروست نیە.

دووەمیان: دروستە چونکە ئەو لەترسی بەفیڕۆدانی سامانەکەی رێگری لێ کراوەو راسپاردن سامان بەفیڕۆ نادات، چونکە ئەگەر ژیا ئەوا وەك جاران خاوەنیەتی، ئەگەر مردیش تەنها پێویستی بەپاداشتەو ئەوەشی بەهۆی راسپاردنەوە دەست دەکەوێت ".

بەخوداو رۆژی دوایی‌و کتێبەکانی‌و پێغەمبەرەکانی نیە، بەو پێیە گەوج تەنها بەو کەسانە دەوترێت کەتوانای جیاکردنەوەیان نیە وەك شێت‌و بەوانەش کەبڕوایان نیە[١].

یاسادانەری عێراقیش لەمادە (١/١٠٩)ی یاسای مەدەنی بەرکاردا هەمان ئاراستەی باوی فیقهی ئیسلامی وەرگرتووە، بڕیاری داوە بەدروستی راسپاردنی گەوج بەسێ یەکی سامانەکەی، بەمەش بڕگەی یەکەمی ئەم مادەیە تایبەتمەندە بە تێکڕای مادە (٦٧)ی یاسای باری کەسیی بەرکار کە کردویەتیە مەرج راسپاردنکار شایانی خەڵات بەخشین بێت بەپێی یاسا، هەروەها یاسای وڵاتە عەرەبیەکانیش بەهەمان شێوە بڕیاریانداوە بەدروستی راسپاردنی گەوج [٢].

جێی ئاماژەیە کەرێگەدان بەگەوج راسپاردنەکەی زیاتر لە سێ یەك بێت بەتاڵە هەرچەندە راسپاردنەکەی دروست بێت، چونکە ئەو رێگەدانە وەك خەڵات دادەنرێت ئەویش شایستە نیە بۆی [٣].

**شوێنەواری جیاوازی ئاین‌و رەگەزنامە لەسەر راسپاردن:**

شەریعەتی ئیسلام جیاوازی ئاین بەرێگرێك لە رێگریەکانی دروستی راسپاردن دانانێت، بەهەمان شێوە رەگەزنامەی موسڵمان بەپێی تێڕوانینی ئەم شەریعەتە بریتیە لەوەی کە موسڵمانە.

**یاسادانەری عێراقی بەمجۆرە لەم بابەتە دواوە:**

"راسپاردن تەنها بە سامانی گوێزراوەوە دروستە کاتێ ئاینیان جیاواز بێت، بۆ جیاوازی رەگەزنامە دروستە بەومەرجەی مامەڵەی هاوشێوە هەبێت" [١].

---

[١] المحلی ٣٣٢/٩

[٢] یاسای راسپاردنی میسری(م٥)، وسوری (م٢/٢١١)، و مەغریبی فەصلی(١٧٥).

[٣] الخرشي ١٧١/٨. العدوي على الخرشي ١٧١/٨. بەڵام دەبەنگ کەئەو کەسەیە هەستی شێولوە بەجۆرێك تێگەیشتنی کەمەو قسەکانی تێکەڵو پێکەڵەو رێکخستنی کاروباری ناتەولوە ئەمەیان وەك حوکمی مێردمناڵی هەراشە (م١٠٧)ی یاسای مەدەنی بەرکار لەسەر ئەم بنەمایە راسپاردنەکەی دروست نیە.

لەمەوە ئەوە دەخوێندرێتەوە کە راسپاردن بەخانوبەرە لەهەردوو حاڵەتی جیاوازی ئاینو جیاوازە رەگەزنامەدا رێگە پێنەدراوە، لە گوێزراوەشدا بۆ حاڵەتی جیاوازە، رەگەزنامە رێگە پێنەدراوە ئەگەر وڵاتەکەی دیکەش بەهەمان شێوە مامەڵە نەکات.

**مەرجی دووەم: راسپاردنکار سەرپشک -مختار- بێت:**

رەزامەندی راسپاردنکار مەرجێکی بنەڕەتی دروستی راسپاردنە، چونکە پێدان -ایجاب-ی موڵك یان ئەوەی پەیوەندارە پێوەی پێویستە رەزامەندی تێدا بێت هەروەك پێدانی موڵکە لە تەواوی گرێبەستەکانی دیکەدا:

بەگوێرەی ئەوە راسپاردنی زۆرەملێو[2]، گاڵتەکردنو[3]، بەهەڵە[4]) دروست نیە، چونکە زۆرەملێو گاڵتەکردنو هەڵە لەو کۆسپانەن کە رەزامەندی[5] لەگەڵیاندا نایەتە دی، ئەم مەرجە لەیاسای باری کەسیدا نەهاتووەو بەجێهێشتووە بۆ بنەما گشتیەکانو، ئەوەی لەفیقهی ئیسلامیدا چەسپاوە لەدانانی رەزامەندی لەهەموو هەڵسوکەوتێکدا کەمەبەست لێی دروستکردنی جێکەوتەی شەرعی بێت.

---

[1] مادە (٧١)ی یاسای باری کەسیی بەرکار.

[2] زۆر لێکرلو راسپاردنەکەی دروست نیە ئەگەر مەرجی زۆرلێکردنی تێدا هاتە دی، چونکە رەزامەندیتی لەدەستداوە، بەڵام واباشە بە راگیرلو دابنرێت تا دواتر رێگەی پێدەدات، ئەگەر رێگەی پێدا پاش نەمانی زۆرلێکردنەکە وەك هەموو هەڵسو کەوتەکانی دیکە پێولنەیە بۆی.

[3] گاڵتەچی راسپاردنەکەی دروست نیە چونکە بەجۆرێك قسە دەکات کەمەبەستی ئەوە نیە ماناکەی بێنێتە دی، بەڵام وا باشە بەراست دابنرێت ئەگەر بەراستی رێگەی پێدا.

[4] هەڵەکار راسپاردنەکەی دروست نیە، چونکە هەڵەی زمان بریتیە لە دەربڕینی شتێك بەزمان کەمەبەستی هەڵەکارەکە شتێکی دیکەیە، هەروەها لەبەر ئەوەی هەڵە لەکۆسپەکانی شیاوییەو بەهۆیەوە رەزامەندیو ئیرادە لەدەست دەچێت.

[5] البدائع ٤٨٤٧/١٠. لە مادە (١١٥)ی یاسای مەدەنی بەرکاریشدا هاتووە: "هەرکەسێك زۆری لێ بکرێت بەجۆرێك لەجۆرەکانی زۆرلێکردن تا گرێبەستێك واژۆ بکات ئەو گرێبەستەی جێبەجێ ناکرێت". بەمجۆرە راسپاردنی زۆرلێکراوە راگیراوە لەسەر مۆڵەتدانی پاش نەمانی زۆرلێکردنەکە.

### مەرجی سێیەم: دەبێت راسپاردنكار خاوەنی ئەوە بێت كەدەیكاتە راسپاردن:

ئەم مەرجە فیقهی ئیسلامیو یاسا لەسەری هاودەنگن، چونكە راسپاردن تەنها لە مولكی (صرف)دا دروستە، هەركەسێك خاوەنی ئەو سامانە نەبوو كە كردیە راسپاردن، بۆی نیە خاوەندارێتیەكەشی بداتە كەسێكی دیكە، چونكە ئەو كەسەی خاوەنی شتێك نەبێت ناتوانێت بیبەخشێتو راسپاردنەكەی بەتاڵ دەبێت.

لەمادە (٦٧)ی یاسای باری كەسی عێراقیشدا هاتووە: " مەرجە راسپاردنكار خاوەنی ئەوە بێت كەدەیكاتە راسپاردن".

راسپاردنیش بەسامانی كەسی دیكە بەتاڵە یا خاوەنەكەشی رێگەی پێ بدات یان راسپاردنكار پاش راسپاردنەكە ببێتە خاوەنی [1].

ئافرەتێكیش كەباوكی مابێت یان مێردی هەبێت ئەگەر باڵغو عاقڵ بوو، ئەوا راسپاردنی باوكو مێردی لەسەر نیە، بەڵكو لەئیسلامدا لەرووی داراییەوە دەتوانێت سەربەخۆ بێتو مافی ئەوەی هەیە هەڵسو كەوت بەوە بكات كەهی خۆیەتی، ئیدی هەڵسوكەوتەكەی لەو مامەڵانە بێت كەبەبەرانبەرن یان خەڵاتكردن بێت، بەبێ پێویستی وەرگرتنی مۆڵەتی باوانو مێرد [2].

هەروەها موسڵمانێتی راسپاردنكارو راسپاردن بۆكراو مەرج نیە بۆ دروستی راسپاردنەكە، رێگەدراوە موسڵمان راسپاردن بۆ ناموسڵمان بكات ئەگەر دژی نەدەجەنگا، بەهەمان شێوە دروستە ناموسڵمان راسپاردن بۆ موسڵمان بكات [3].

---

[1] لە (التاج المذهب) (٢٥٨/٤): " لەمەرجەكانی راسپاردنكار ئەوەیە خاوەنی بێت، حوكمەكانی راسپاردن مۆڵەتدانی بەشوێندا نایەت وەك وەقف، ئەگەر مولكی كەسێكی دیكەی كردە راسپاردن ئەوا راست نیە، ئیدی لەخۆیەوە بوویێت یان لەخاوەنەكەیەوە، یان با دواتر ببێتە خاوەنی، با خاوەن مولكەكە رێگەی بدات ئیدی راسپاردنەكە بۆ كەسێكی دیاری كراو بێت یان دیارینەكرلو".

[2] المحلی ٣٣٠/٩.

[3] المغني ١٠٣/٦، الخرشي ١٦٨/٨، المحلی ٣٢٢/٩.

جێی ئاماژەیە ئەم مەرجە با لەیاسای باری کەسیشدا بەرەهایی[1] هاتبێت لەگەڵ ئەوەشدا بەبۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەریعەت مەرج نیە راسپاردنکار خاوەنی ئەوە بێت کەدەیکاتە راسپاردن لەکاتی راسپاردن کردنەکەدا، کاتێ بەناوو ئاماژە پێدان دیاری نەکرێت، جگە لەوە تەنها ئەوەندە بەسە کەلەکاتی مردنیدا خاوەنی ئەوە بێت کە دەیکاتە راسپاردن.

**مەرجی چوارەم: نابێت راسپاردنکار هێندە قەرزی لەسەر بێت میراتیەکە نغرۆ بکات:**

زانایانی حەنەفی زیاتر گرنگیان بەم مەرجە داوە، بەجۆرێك لەقسەکانیان ئەوە دەخوێندرێتەوە کە راسپاردن بەتاڵ دەبێت ئەگەر ئەم مەرجەی تێدا نەبێت، بەو پێیەی کە مەرجی دروستی یە، بەڵام ئەو کەسەی سەرچاوە بنەڕەتیەکانی فیقهی حەنەفی بخوێنێتەوە بۆی دەردەکەوێت کەمەرجی جێبەجێکردنەو، هیچ ناکۆکیەکی قوڵ نیە لەنێوان ئەوانو زانایانی دیکەدا سەبارەت بەسروشتی ئەم مەرجە، بەوەی مەرجی جێبەجێکردنە نەك مەرجی دروستی، چونکە ئەوان دەڵێن ئەو راسپاردنە دروستە کە خاوەن قەرزەکان لەقەرزەکانی سەر راسپاردنکار خۆش بن[2].

نمونەی حوکمی لێخۆشبوونیش وەك ئەوەی یەکێك لەمیراتگران یاخود کەسێکی دیکە هەستێت بەدانەوەی قەرزەکە بەخاوەن قەرزەکانو ئەوانیش قبوڵی بکەن، بەجۆرێك قەرزەکەی لەسەر لابچێتو میراتیەکە قەرزی تێدا نەمێنێت، بەڵام ئەگەر ئەو

---

[1] مادە (٦٦) مەرجە راسپاردنکار شایانی خەڵات بەخشین بێت بەپێی یاساو خاوەنی ئەوەش بێت کەدەیکاتە راسپاردن.

[2] لە (البداية والهداية مع تكملة فتح القدير) (١٠/٤٣٠)دا هاتووە : "کەسێك راسپاردنی کردو قەرزی لەسەر بوو کەسامانەکەی دەگرتەوە ئەوا راسپاردنەکەی دروست نیە، چونکە قەرز دەخرێتە پێش راسپاردن، چونکە ئەو گرنگترە، فەرزیشەو راسپاردنیش بەخشینە، دلنەوەکەشی بەگرنگترین پاشان گرنگترو پاشان گرنگ دەست پێدەکات تاهەموویان دەدلتەوە، کە قەرزەکەی لەسەر نەما ئەوا راسپاردنەکە جێبەجێ دەکرێت بەپێی ئەو رادەی کەپێویستی پێی هەیە.

کەسەی قەرزەکەی دایەوە خۆبەخش نەبوو، ئەوا دەچێتە جێگەی خاوەن قەرزەکەو میراتیەکە قەرزەکەی هەر تیا ماوە.

ئەگەر میراتیەکە لەقەرزدا نغرۆ نەبووبوو، ئەوا راسپاردنەکە لەسنووری ئەوەندەی کەقەرزی تیا نیە جێبەجێ دەکرێت، ئەمە هەمووی ئەگەر هاتوو راسپاردنەکە بە شتێکی دیاریکراو نەبوو کەمافی خاوەن قەرزەکەی تێدا بێت، ئەگەر وابێت ئەوا مافی خاوەن قەرزەکە لەپێشترە لەمافی راسپاردن بۆ کراوەکەو، میراتیەکە لەقەرزدا نغرۆ نەبووبێت، چونکە مافی خاوەن قەرز پەیوەندی هەیە بەو کاتەی راسپاردنکار لەژیاندایە، بەڵام مافی راسپاردن بۆکراو بۆ پاش مردنی راسپاردنکارە.

سەرەڕای ئەم لەپێشتر دانانە، مافی راسپاردن بۆکراو لاناچێت بەڵکو دەگوێزرێتەوە بۆ پاشماوەی میراتیەکە لەسنووری یەك لەسەر سێ‌و بەو ئەندازەی کەیەکسان بێت بەبەهای ئەو قەرزەی کراوەتە راسپاردن، هەندێك لەزانایان زیادەڕۆییان کردووە کەوتویانە راسپاردنی ئەو راسپاردنکارە بەتاڵە کە میراتیەکەی لەقەرزدا نغرۆ بووە، ئیدی قەرزی خوای گەورە بێت یان قەرزی خەڵکی، ئەمەش وەرگرتنی ئەم ئایەتەیە بەرەهایی: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ﴾.[1]

یاسادانەری عێراقی باسی ئەم مەرجەی نەکردووە، بەڵام ئەوەی باوە لەیاسای وڵاتانی عەرەبیدا [2] ئەوەیە کەمەرجی جێبەجێکردنە نەك مەرجی دروستی.

---

[1] ئەوانیش زانایانی زاهرین.. ئیبن حەزم لە (المحلى ٣٤٢/٩) دەڵێت: " راسپاردن نابێت پاش دانەوەی قەرزەکان نەبێت، دانەوەی قەرزە بەخاوەن قەرزەکان پێویستە، ئەو کەسەی هەموو ئەوەی لێجێماوە قەرز بێت ئەوە هیچماڵێکی نەماوە بیکاتە راسپاردن‌و ئەوەی لێی جێدەمێنێت دەچێت بۆ خاوەن قەرزەکان بەهۆی مردنیەوە دەست بەجێ‌و بۆ کەسیش نیە ماڵی کەسی دیکە بکاتە راسپاردن، بۆیە راسپاردنەکەی بەتاڵە".

[2] لەوانە یاسای راسپاردنی میسری (م٣٨): "راسپاردنی کەسێك کەسامانەکەی لەقەرزدا نغرۆ بووە دروستە بەڵام جێبەجێ ناکرێت مەگەر لەقەرزەکانیان خۆش بن، ئەگەر لەبەشێکی خۆشبوون یان تەواو نغرۆ نەبوو لەقەرزدا، ئەوا راسپاردنەکە لەوەی ماوەتەوە پاش دانەوەی قەرزەکە جێبەجێ دەکرێت".

←

سەرئەنجام: نغرۆ نەبوونی سامانی راسپاردنکارەکە بەقەرز مەرجێکە لەمەرجەکانی جێبەجێکردنی راسپاردنەکە، قەرزیش پێش راسپاردن دەخرێت، راسپاردنیش پێش میراتی دەخرێت، بەڵام جیاوازی بنەڕەتی هەیە لەنێوان ئەو دوو پێشخستنەدا وەك لێرەدا دەیخەینە روو:

**مانای پێشخستنی قەرز:**

پێشخستنی قەرز واتە سەرەتا ئەو دەدرێتەوە، ئەگەر پاش ئەوە شتێك مایەوە ئەوا بۆ جێبەجێکردنی راسپاردنو میراتگرەکان دەبێت، ئەگەرنا ئەوا راسپاردنەکە جێبەجێ ناکرێتو دابەش ناکرێت بەسەر میراتگرەکاندا با راسپاردنەکەش دروست بێت، بەڵکو رێگری دەکرێت لەجێبەجێکرانی ئەگەر خاوەن قەرزەکان لێی خۆش نەبوون، یان یەکێك لەمیراتگرەکان یان کەسێکی دیکە بەخۆبەخش قەرزەکانی نەدایەوە.

بەڵام ئەگەر لێخۆشبون لەهەموو قەرزەکە یان بەشێکی هەبوو، یاخود یەکێك لەمیراتگرەکان خۆبەخشانە دایەوە کەنەیدەویست بکەوێتە سەر میراتگرەکانی[1] دیکە، لێرەدا راسپاردنەکە هەمووی یان بەشێکی لەسێ یەکی ئەوەی پەیوەندی نیە بەمافی خاوەن قەرزەکەوە جێبەجێ دەکرێت.

جێی ئاماژەیە: جیاوازیەکی زۆرو روون هەیە لەنێوان مۆڵەتدانی خاوەن قەرزەکان بەراسپاردنەکە لەگەڵ خۆشبوونیان لەقەرزەکانی سەر راسپاردنکارە کۆچکردووەکە، ئەوەی حاڵەتی یەکەم راسپاردنەکە جێبەجێ ناکرێت، چونکە بەمۆڵەتدانی خاوەن قەرزەکان کەراسپاردنەکە جێبەجێ بکرێت ئەستۆی راسپاردنکارەکە پاك نابێتەوە

---

یاسای سوریا (م٢/٢٣٨): " لەوەندەی کەلەقەرزدا نغرۆ بووە جێبەجێ ناکرێت مەگەر خاوەن قەرز کەشیاوی تەواوی هەبێت مۆڵەت بدات یان لەقەرزەکەی خۆشبێت ".

[1] ئەگەر بیەوێت ئەو قەرزەی داویەتیەوە لەمیراتگرەکانی دیکەی وەریگرێتەوە ئەوا راسپاردنەکە بەجێبەجێ نەکراوی دەمێنێتەوە.

بەڵكو بەلێخۆشبون لەقەرزەكان پاك دەبێتەوە [١].

بەمجۆرە یاسادانەری سوری ورد نەبووە لە دەربڕیندا كاتێ دەڵێت: "جێبەجێ ناكرێت ئەوەی بەقەرز نغرۆ بووە مەگەر بەمۆڵەتی خاوەن قەرزەكە" [٢].

**پێشخستنی راسپاردن بەسەر میراتیدا چی دەگەیەنێت:**

ئەم پێشخستنە لەناوەرۆكیدا جیاوازە لەپێشخستنی قەرز، چونكە یەكەم بەواتای دەركردنی سێ یەك و جیاكردنەوەی لە میراتیەكەو پێدانی بەراسپاردن بۆكراوەكە نایەت، پاشان دەست بكرێت بەدابەشكردنی ئەوەی ماوەتەوە بەسەر میراتگرەكاندا، چونكە میراتی پاش دانەوەی قەرز لەنێوان میراتگران و راسپاردن بۆكراواندا دەمێنێتەوە بەهاوبەشی، راسپاردنْ بۆكراو لەگەڵ میراتگرەكاندا هاوپشكە، وەك ئەوەی یەكێك بێت لەوان، چەندە میراتیەكە زیادو كەم بكات سێ یەكەكەی ئەویش وەك دوولەسەر سێی میراتگرەكان كەمو زیادی تێدا دەكرێت، لەرووی كرداریەوە بەیەكەوەن و هیچیان پێش ئەوی دیكەیان ناخرێت، تەنانەت ئەگەر شتێك لەمیراتیەكە خراپ بوو پێش دابەشكردنی ئەوا راسپاردن بۆكراوو میراتگرەكان وەك یەك لەو خراپ بووە بەشیان لێ كەم دەبێتەوە، واتە راسپاردن بۆكراو سێیەكی تەواوی لەوەی ماوەتەوە پێ نادرێت، بەڵكو ئەوەی خراپ بووە لەبەشی هەردوولایەو ئەوەشی ماوەتەوە بۆ هەردوولایە، بەپێچەوانەی قەرزەوە، كەكاتێ بەشێك لەمیراتیەكە تیابچێت ئەوا لەوەی كەماوەتەوە قەرزەكە دەدرێتەوە بێ كەمو زیاد.

---

[١] لە (التاج المذهب) (٤/٣٦٥)دا هاتووە: "ئەگەر كەسێك مردو سامانەكەی لەقەرزدا نغرۆ بوویوو راسپاردنەكەشی كردبوو خاوەن قەرزەكان رێگەیان بەو راسپاردنە دابوو، ئەو مۆڵەتدانەیان كاری پێناكرێت، چونكە مردوو بە مۆڵەتدان ئەستۆی لەقەرزەكە پاك نابێتەوە بەڵكو بەلێخۆشبوون پاك دەبێتەوە، لەگەڵ لێخۆشبوونیان ئەوا راسپاردنەكە تەنها لەسێ یەكدا دەبێت، چونكە مافی لێخۆشبوونەكە بۆ میراتگرەكانیشە"، واتە راسپاردنەكە لەسنووری سێ یەكی ئەوەی مافی خاوەن قەرزی تێدا نیە جێبەجێ دەكرێتو دوو لەسەر سێیەكەی دیكە مافی میراتگرەكانیەتی.

[٢] مادە (٢٣٨)ی یاسای باری كەسی بەركاری سوریا.

ئەمــەش هــەمووی ئەگــەر هــاتوو راســپاردنەکە بەبەشــێکی بــاوی ســامانی راسپاردنکارەکە بوو، بەڵام ئەگەر راسپاردنکراوەکە تـەواو دیـاری کرابـوو وەك فلانـە خانوو یان جۆرەکەی دیاریکرابوو وەك مەڕەکانی، ئەوا مافی راسـپاردن بـۆکراو تـەنها پەیوەندی بەو شتەوەیە کەبۆی دیاریکراوە، هەر کەم و زیادیەك تێیدا روویدات بۆ ئـەم دەگەڕێتەوەو ئەگەر ئەو شتە تیابچێت ئەوا راسپاردنەکە هەڵدەوەشێتەوە . [1]

---

[1] بدائع الصنائع ٤٨٥٠/١٠.

# دەروازەی سێیەم
## ڕاسپاردن بۆکراو و مەرجەکانی
## ( الموصى له وشروطه )

پێکهێنەری سێیەم ڕاسپاردن بۆکراوە کەئەو هەڵس‌وکەوتی پێوە دەکات، واتە ڕاسپاردن لەبەر ئەو کراوەو ڕاسپاردنکار مەبەستی بووە سوودی پێ بگەیەنێت‌و پەیوەندی لەگەڵ بێت‌و بیکاتە جێگرەوەی لەوەدا کە کردویەتیە ڕاسپاردن بۆی.

ئەو کەسە دەکرێت بونێکی ڕاستەقینە یان بوونی حوکمی هەبێت لەکاتی ئەنجامدانی ڕاسپاردنەکەدا، لەوانەشە لەکاتی ئەنجامدانی ڕاسپاردنەکەدا نەبێت، لەوانەیە تاکێك بێت یان لایەنێکی دیاریکراو یان دیاری نەکراو، بۆ هەر حاڵەتەو مەرج‌و حوکمی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە دەبێت مەرجەکانی ڕاسپاردن بۆکراو بناسێنین کەهەشت مەرجە:

**مەرجی یەکەم: دەبێت لەکاتی ڕاسپاردنەکەدا بوونی هەبێت ئەگەر دیاری کراو بوو:**

بۆ دروستی ڕاسپاردن مەرجە ڕاسپاردن بۆکراو لەکاتی ڕاسپاردنکردنەکەدا بوونی هەبێت، ئەگەر هاتوو ڕاسپاردنکار بەناو یان بە وەسف یان بەئاماژە دیاری کردبوو[1]، ئیدی بوونەکەی لەداهاتوودا ڕاستەقینە بێت یان بوونێکی مەزەندەکراو بێت وەك

---

[1] ئەگەر بۆیەکێك لەو کارانە دیاری نەکرابوو ئەوا مەرج نیە تەنها دەسەڵاتەکەی بۆ بوونە لەداهاتوودا وەك دووگیانی کەپێکبێت یان مزگەوتێك کەدروست دەکرێت ئەگەر ئەوە هەبوو ئەوا ڕاسپاردنەکە ڕاستە ئەگەر نا بەتاڵ دەبێتەوە.

کۆرپەلــە کەلەســکی دایکیدایــە، لای هەنــدێك لــەزانایان –وەك مالیکیــەکان[1]– ڕێگەپێدراوە راسپاردن بکرێت بۆ نەبوویەك لەکاتی دانانی راسپاردنەکەدا، ئەگەر هاتوو توانای بوونی هەبوو لەداهاتوودا.

ناکۆکی نێوان ئەوەی دەڵێـت مەرجـە لـەکاتی راسـپاردنکردنەکەدا بـوونی هـەبێت لەگەڵ ئەوەی کەدەڵێت ئەوە مەرج نیە ناکۆکیەکی زیاتر رواڵەتییە لەوەی راسـتەقینە بێت، چونکە ئەوەی بوونی کردۆتە مەرج مەبەستی ئەو راسپاردن بۆکراویە کەلەلایـەن راسـپاردنکارەکەوە دیـاری کـراوە، پاشـان هـەموویان هـاودەنگن لەسـەر ڕێگـەدران بەراسـپاردن بـۆ دامـەزراوەی خێرخـوازی کەلـە داهـاتوودا دادەمـەزرێت، یاسـادانەری عێراقــی کــارێکی باشــی کــردووە کاتێــك هــەردوو بۆچــوونەکەی لــە مــادە (٦٨)دا کۆکردۆتەوە کەدەڵێت:" مەرجە راسپاردن بـۆکراو کەبەراسـتی یـان بەمەزەنـدەکردن زیندوو بێت لەکاتی دانـانی راسـپاردنەکەداو لـەکاتی مردنـی راسـپاردنکاردا، دروسـتە راسپاردن بۆکەسانی مەعنەوی‌و لایەنی خێرخوازی‌و دامەزراوەکان کەسوودی گشتیان هەیـە"، چـونکە ئـەم دەقـە سـەبارەت بەکەسـە مەعنەویـەکان رەهایـەو بەمـەرجی دانەناوە کە بوونی راستی یان مەزەندەکراوی هەبێت، رەهاش کارە بەرەهایەتیەکـەی دەکرێت ئەگەر بەڵگەیەکی چەسپاو نەبوو کۆتی بکات.

**راسپاردن بۆ کۆرپەلە:**

ئـەوەی لەشـەریعەت‌و یاسـادا چەسـپاوە کۆرپەلـە شـیاو بـوونی ناتـەواوە، واتـە: دەسـەڵاتی هەنـدێ لەمافـەکانی هەیـە وەك میراتــی‌و چـواریەکی سـامانی راگـیراوو راسپاردن کەئەمانە تەنها سوودیان تێدایـەو، گوێزرانـەوەی ئـەم مافانـەش پێویسـتی بەرەزامەندی نیە لای زۆربەی زانایان، پاشان راسپاردن جۆرێکـە لەشـوێنگرتنەوە کـە

---

[1] لە (الخرشي) (١٦٨/٨)دا هاتووە: "پایەی دووەم بریتیە لەراسپاردن بۆکراو، مەرجـەکانی: بـەپێی شـەرع دروست بێت مولکایەتیەکەی بدرێتە راسپاردن بۆکراو ئیدی باڵغ‌و عاقڵ‌و موسڵمان و بوونی هـەبێت یـان نا، لەبەر ئەوە دروستە بۆ سکپڕ کەلەداهاتوودا دەبێت ".

راسـپاردنكار راسـپاردن بـۆكراو لەهەنـدێ لەسـامانەكەیدا دەكاتـە جێگـرەوەی، جـا هـەروەك چـۆن كۆرپەلـە لەمیراتیـدا شایسـتەی جێگرتنەوەیـە، بەهـەمان شـێوە لەراسپاردنیشدا شایستەیە چونكە راسپاردن هاوشێوەی میراتە.

لەسەر ئەو بنەمایە دروستە راسپاردن بۆ ئەو سكەی كەلەكاتی راسپاردنكردنەكەدا بوونی هەیە باتەنها نوتفەیەكیش بێت [1] ، چونكە تەنها بـوونی مەزەنـدەكراوو ژیـانی مەزەندەكراو بەسە سەبارەت بەراسپاردنو میراتی.

ناوترێت: لەمەرجەكانی راسپاردن رازیبوونی راسپاردن بۆكراوە پێـیو كۆرپەلـەش بۆ ئەوە شیاوێتی نیە، چونكە راسپاردن هاوشێوەی خەڵاتو میراتیە، بۆ چواندنی بـە خـەڵات مـەرجی رازیبـوون پێـی تێدایـە ئەگـەر كـرا، بـۆ چواندنیشـی بـەمیراتی ئـەوا پێویستی بەرازیبوون نیە ئەگەر لەتوانایدا نەبوو ئەمەش وەك ئەوەی بـۆ هـەردوو پـێ چوێنراوەكە هەیە [2] .

پاشان هەندێك لەزانایان وتوویانە كەراسپێر—وصی— یان باوان بۆیـان هەیـە جێـی بگرنـەوەو رازیـبن بەراسـپاردنەكەو [3] ، بەشـی راسـپاردنكراو بـۆی لـەكاتی مردنـی راسپاردنكارەوە تا ئەو كاتەی سكەكە لەدایك دەبێت بپارێزن بۆی.

**مەرجەكانی پێدانی راسپاردن بەكۆرپەلە:**

كۆرپەلـە دەبێـت ئـەم دوو مەرجـەی تێـدا بێـت ئـەمجا راسـپاردنكراوەكەی پێدەدرێت[4]:

١– بەزیندووی لەدایك ببێتو ژیانێكی جێگیری هەبێت، ئەگەر لەسكی دایكیدا مرد یان كاتی لەدایكبوون مرد، پـێش ئـەوەی لـەدایكببێت یـان بـەمردووی لـەدایك بـوو بـا

---

[1] مغني المحتاج ٤٠/٣ . المغني لأبن قدامة ٥٦/٦ .

[2] ابن عابدين ٦٥٣/٦.

[3] الأنوار ٢١/٢ تێیدا هاتووە: "لەبری ئەو پاش لەدایكبوونی باوان قبوڵی دەكات بۆی".

[4] ئەو دوو مەرجەش لە مەرجەكانی شایستەبوونن نەك لەمەرجەكانی دروستی.

بەهۆی تاوانێکیشەوە بێت یان بەهۆی بەکارهێنانی دەرمان، راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە[1].

لەحاڵەتی زیاتر لەیەکێك ئەگەر پێش لەدایکبوون یەکێکیان مرد، هەموو راسپاردنەکە بۆئەوەی دیکەیانە کەبەزیندووی لەدایك دەبێت، ئەگەر دوانیش بوون لەدایکبوون ئەوا راسپاردنەکە بەیەکسانی پێیان دەدرێت، جیاوازی نیە نێر بن یان مێ یان نێرومێ، ئەگەر لەراسپاردنەکەدا شتێ نەبوو پێچەوانەی[2] ئەوە بگەیەنێت، ژیانی پاش لەدایکبوونیش بەچەندین هۆکار دەسەلمێندرێت وەك باوێشکدانو هاوارکردنو هەناسەدان.

ئەگەر هیچ شتێك دەرنەکەوت دەربیخات ئەژینو ناکۆکی کەوتە نێوان بوونو نەبوونی، دادوەر بابەتەکە ئاڕاستەی پزیشکانی بەئەزموونو پسپۆڕ دەکات.

٢- لەکاتی راسپاردنکرنەکەدا بوونی سەلمێندراو بوبێت، هەندێك وتویانە لەکاتی مردنەکەدا، ئەوەی یەکەم بۆچوونی زۆرینەی زانایانەو ئەوەشیان پەسەندترە[3]، مالیکیەکانیش تەنها ئەوەیان بەمەرج گرتووە کەبەزیندووی لەدایك ببێت[4].

یاسادانەری عێراقیش بوونی لەکاتی راسپاردنکردنەکەو کاتی مردندا کردۆتە مەرج، لەبڕگەی یەکەمی مادە (٦٨)دا هاتووە کەمەرجە:" زیندوو بێت زیندوو بونێکی راستەقینە یان بەمەزەندە لەکاتی راسپاردنکردنەکەو کاتی مردنی راسپاردنکاردا".

---

[1] البدائع ٤٨٥٠/١٠. المغني ٤٠/٣ ، الروضة البهية ٤٦/٢ .

[2] المغني ٥٩/٦ ، الخرشي ١٨٦/٨، المهذب ٤٥٦/١.

[3] حەنەفیەکان دوو بۆچونیان هەیە (البدائع ٤٨٥٠/١٠): "ئەگەر بەشەش مانگ کەمتر لەدایك بوو لەکاتی مردنی راسپاردنکارەوە وەك لەرووکاری گێڕانەوەکەدا هاتووە، لەکاتی دروستبوونی راسپاردنەکەدا وەك لە تەحاویەوە هاتووە، چونکە هۆکاری شایستەبوون بریتیە لەراسپاردنەکە، بۆیە بوونەکەی لەوکاتەدا دادەنێن، رووکاری دەرەکی گێڕانەوەکە ئەوەیە: کاتی جێبەجێکرانی راسپاردنەکەو دانانی بەحەقی حوکمەکە لەکاتی مردنەکەدا بۆیە وا دادەنرێت لەوکاتەدا هەبووە ".

[4] الخرشي ١٦٨/٨: "مەرجە بەزیندووی لەدایك ببێت".

کۆرپەلە ژیانەکەی مەزەندە کراوە، لەبەر ئەوە پێویستە کاتی راسپاردنکردنەکەو کاتی مردنی راسپاردنکاریش هەبێت، ئەگەرنا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێت، بەڵام بوونی لەکاتی راسپاردنەکەدا ئەوە دەخوازێت کەلەکاتی مردنەکەشدا هەبێت، لەبەر ئەوەی لەمەرجەکانی شایستەبوونی راسپاردنەکەیە کەبەزێندویەتی لەدایك ببێت.

بەم پێیە دەستەواژەی (کاتی مردنەکە) زیادەیە ئەگەر بوونیمان لەکاتی راسپاردنەکردنەکەدا کردبووە مەرج.

**بوونی سکپڕی لەکاتی راسپاردنکردندا بەم شێوەیە دەسەلمێندرێت:**

أ- بەکەمتر لەکەمترین ماوەی سکپڕی (کە شەش مانگە) بەزیندووی لەدایك ببێت، ئەم ماوەیەش لەکاتی راسپاردنکردنەکەوە ئەژمار دەکرێت، ئەگەر ئافرەتە سکپڕەکە مێردی هەبوو راسپاردنکاریش لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا دانی بەبوونی سکەکەدا نا، چونکە لەدایکبوونی لەو ماوەیەدا بەڵگەی یەکلاکەرەوەیە بۆ سەلماندنی بوونی لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا.

بەڵام ئەگەر شەش مانگ یان زیاتر پاش راسپاردنەکە لەدایکبوو، ئەوا راسپاردنەکەی پێنادرێت چونکە ئەگەری ئەوە هەیە پاش راسپاردنەکە سکپڕییەکە روویدابێتو ئەمەش وەك نەبوو دادەنرێتو، بەهۆی بوونی گومانەوە [1]شایستەی نابێت، هەندێکیش شەش مانگیشیان لەگەڵ کەمتر لەشەش مانگ داناوەو بەشایستەی وەرگرتنیان زانیوە [2].

---

[1] لە (المنهاج وشرحه مغني المحتاج) (٤١/٣)دا هاتووە: "ئەگەر بەشەش مانگی یان زیاتر (واتە پاش راسپاردنەکە) لەدایکبوو ئافرەتەکەش مێردی هەبوو ئەوا راسپاردنەکەی نادرێتێ، چونکە گومان هەیە پاش راسپاردنەکە سکی پڕ بوویێتو ئەسڵ نەبوونیەتیو بەبوونی گومانیش پێی نادرێت ".

[2] لە (المغنی) (٥٧/٦) دا هاتووە: "ئەگەر ئافرەتەکە مێردی هەبوو لەگەڵیشی دەچووە پەردە بەشەش مانگ یان کەمتر بووی، زانرابوو کاتی راسپاردنەکە هەیە، ئەگەر بەو ماوە زیاتر بووی ئەوا راسپاردنەکە بۆی دروست نیە چونکە ئەگەر هەیە پاش راسپاردنەکە سکی بوبێت ".

ب- ئەگەر ئافرەتە سکپڕەکە لەماوەی چاوەڕوانی (عیدە)دا بوو لەمێردەکەی کەتەڵاقی دابوو یان مردبوو، ئەگەر سکەکەی کەراسپاردنی بۆ کراوە لەماوەی نێوان جیابوونەوەکە تا زۆرترین ماوەی سکپڕی لەدایکبوو، ئەوا شایستەی راسپاردنەکەیە، چونکە لەرووکاردا رەچەڵەکەکەیوبوونی لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا دەسەلمێت، بەڵام ئەگەر بەزیاتر لەدرێژترین ماوەی سکپڕی لەدایکبوو کە ئەو ماوەیە لەکاتی جیابوونەوەیەوە ئەژمار دەکرێت، ئەوا شایستەی راسپاردنەکە نیە چونکە گومان هەیە بەرێگایەکی ناشەرعی ئەو سکەی بوویێت، کاتێ گومان پەیدا دەبێت ئیدی بەڵگە هێنانەوە سوودی نامێنێت، زانایانیش بۆچوونیان جیاوازە لەدیاریکردنی درێژترین ماوەی سکپڕی، بەڵام دروستترینیان دیاریکردنیەتی بەساڵێك کەئەمەش زانستی پزیشکی هاوچەرخ پشتگیری دەکاتو یاسا نوێیەکانیش کار بەمە دەکەن[1].

---

[1] لە (المنهاج وشرحه مغني المحتاج) (٣/٤١)دا هاتووە: "ئەگەر ئافرەتەکە مێردی نەبوو منداڵەکەش بەزیاتر لەچوار ساڵ لەدایکبوو، سکەکە شایستەی ئەوە نیە کەکراوەتە راسپاردن بۆی چونکە لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا بوونی نەبووە ".

لە (المغني) (٦/٥٧) دا هاتووە: "ئەگەر جیابووەوە بوو پاشی چوار ساڵ لەجیابونەوەکەیو شەش مانگ لەکاتی راسپاردنەکەوە لەدایکبوو ئەوا راسپاردنەکەی نادرێتێ ئەمە بۆچوونی مەزهەبی شافیعیە ".

لە (البدائع) (١٠/٤٨٥٠): دا هاتووە: "ئەگەر بەشەش مانگ یان زیاتر لەدایکبوو ئەوا بوونەکەی نازانرێت لەبەر ئەگەری سکپڕبوونی پاش ئەوە، بوونەکەی بەگومان نازانرێت مەگەر ئافرەتەکە لەچاوەڕوانی (عیدە)دا بوو لەمێردەکەی کەتەڵاقی دابوو یان مردبوو بەدوو ساڵ پاش تەڵاقدان یان مردنی مێردەکەی لەدایکبوو، راسپاردنەکەی بۆ هەیە چونکە رەچەڵەکی منداڵەکە لەباوکی تا دووساڵ دەسەلمێنرێت ".

**مەرجی دووەم: پێویستە راسپاردن بۆکراو بەراستی شایان بێت بۆ خاوەنداریتی وەک مرۆڤ، یان بەمەزندە شایان بێت وەک کەسی مەعنەوی:**

مەرج نیە بۆ راسپاردن بۆکراوی مەعنەوی ( حوکمی) شایستە بوونی خاوەندارێتی راستەقینەی هەبێت، چونکە ئەوەی کراوەتە راسپاردن بۆ بەرژەوەندیەکانی خەرج دەکرێت[1].

ئەگەر بۆ گیانلەبەرێك راسپاردنی کرد ئەوا بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە شایستەیەتی خاوەنبوونی تێدا نیە، سەبارەت بەراسپاردنکردنیش بۆ مردوو بۆچوونی جیاواز هەیە: زۆرینەی زانایان [2]بۆچوونیان وایە دروست نیە چونکە شایستەیەتی راستی یان مەزەندەیی خاوەنبوونی نیە.

مالیکیەکانیش [3]دەڵێن راسپاردن دروستە بۆی ئیدی راسپاردنکار بزانێت راسپاردن بۆکراو مردووە یان نەزانێت، ئەوەی کراوەتە راسپاردن ئەگەر مردووەکە قەرزی لەسەر بوو ئەوا قەرزەکەی پێ دەدرێتەوە ئەگەر نا دەدرێتە میراتگرەکانی.

---

1 لە (الخرشي) (١٧٠/٨)دا هاتووە: ئەگەر وتی " (أوصيت لمسجد، أو لقنطرة) راسپاردنم کرد بۆ مزگەوت، یان بۆ پردێك، ئەو (ل) لامی (صرف)ە، نەك لامی خاوەنبوون، ماناکەشی ئەوەیە کەراسپاردن بۆ مزگەوتو هاوشێوەی وەك پردو دیوار دروستەو ئەوەی کراوەتە راسپاردنەکە بۆ بەرژەوەندی ئەوانە بەکاردەهێندرێت وەك پێویستیو بنیاتنانی، چونکە مەبەستی خەڵکی لەراسپاردنکردن ئەوەیە، ئەگەر مزگەوتەکە پێویستی نەبوو ئەوا دەدرێتە هەژاران ".

عەدەویش لە (هامش الخرشي ١٧٠/٨) وتویەتی:"ئەگەر لەوە زیاتر بوو یان پێویستی بەوە نەبوو ئەوا بۆ خزمەتکارەکانی خەرج دەکرێت وەك ئیمامو بانگدەرو ئەوانەی وەك ئەوان، ئیدی ئەمانە پێویستیان بێت یان نا".

2 لە (المحلی) (٣٢٢/٩)دا هاتووە: "راسپاردن رێگەپێدراو نیە بۆ مردوو چونکە مردوو خاوەنی هیچ نیە، ئەو کەسەی راسپاردنی کرد بۆ زیندوویەك پاشان مرد (پێش مردنی راسپاردنکار) راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە ".

لە (المغني) (١٢/٦) دا هاتووە: "راسپاردن بۆ مردوو دروست نیە ئەبو حەنیفەو شافیعی وایان وتووە".

3 لە (الخرشي) (١٧٠/٨) دا هاتووە: بۆ مزگەوت دروستەو خەرج دەکرێت بۆ پێویستیەکانیو بۆ مردوویەکیش دروستە کەزانیبێتی مردووە ئەمیش قەرزەکانی پێ دەدرێتەوە یان دەدرێتە میراتگرەکانی".

**مەرجی سێیەم: نابێت راسپاردن بۆکراو بکوژی راسپاردنکارەکە بێت:**

بۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەریعەت پاڵپشت بەم بەڵگانە لەسەر ئەم مەرجە چەسپاوە:

أ- ئەو فەرموودەیەی کەلەپێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە: "لا وصية لقاتل"، واتە: راسپاردن بۆ بکوژ نیە.

ب - هەروەها ئەو فەرموودەیەی کەلەپێغەمبەر (ﷺ) گێڕاویانەتەوە: "ليس لقاتل شيء"، واتە: بکوژ هیچی بۆ نیە، وشەی (شيء) ئەرێیە لەبواری نەرێیدا بەمانای گشتگیر هاتووە، میراتیو راسپاردن بەیەکەوە دەگرێتەوە.

ت - راسپاردنیش لەسەر میراتی دەپێورێت چونکە هاوشێوەیەتی، میراتیش حوکمەکەی بەدەق چەسپاوە، هەردووکیشیان هاوبەشن لەبیانوو (علـة)ی حوکمەکەدا (بێبەریکردن)، بریتیە لە: هەرکەسێك پەلەی کرد لەشتێکدا پێش ئەوەی وادەی بێت بە بێ بەشکردنی لێی سزا دەدرێت، تاوانبار ناکرێت سوودمەند بێت لەتاوانەکەی، چونکە ئەو بێ بەشکردنە پاراستنی گیانی بێتاوانانی تێدایە.

هەندێك لەزانایان وتوویانە[1]: راسپاردن بۆ بکوژ دروستە، شێوەکەی: راسپاردن بۆ کەسێك بکاتو کەسە راسپاردن بۆکراوەکە هەستێت بەکوشتنی راسپاردنکارەکە یان برینداری بکات بەشێوەیەکی سەخت، پاشان راسپاردنکارە برینداربووەکە پێش ئەوەی بمرێت راسپاردنی بۆ بکات لەکاتێکدا دەزانێت کەئەو کەسەی ئەم راسپاردنی بۆ دەکات ویستویەتی بیکوژێت[2].

---

[1] ئەوانیش زانایانی مالکین (حاشية الدسوقي على الشرح الكبير ٤/٤٢٦) و زانایانی شافیعی و، جەعفەریو، زەیدی (التاج المذهب ٤/٣٦٨).

[2] یاسادانەری مەغریبیش ئەمەی هێناوە لە فەصلی (١٧٩)ی (مدونة الأحوال الشخصية) کە تێیدا هاتووە: "مەرجە لە راسپاردن بۆکراودا:

١- سیفەتی میراتگریەتی نەبووبێت لەکاتی مردنی راسپاردنکاردا.

←

ئەو تێبینیەی لەسەر ئەم بۆچوونە هەیە ئەوەیە گەرچی لایەنی مرۆیی لەخۆ گرتووە لەبەرانبەردا وەلآمدانەوەی چاکەیە بەخراپە، لەهەمان کاتدا کردنەوەی دەروازەیە بەرووی کەسانی دروون نەخۆشدا کە دەروونیان وادەخوازێت خزمانی بێتاوانیان بکوژن لەپێناوی بەدەستهێنانی میراتیەکەیان.

یاسادانەری عێراقی کارێکی باشی کردووە کەبۆچوونی زۆرینەی زانایانی هێناوە لەمادە (٢/٦٨)ی یاسای باری کەسیدا کەئەمە دەقەکەیەتی:"٢- مەرجە لە راسپاردن بۆکراودا کە بکوژی راسپاردنکار نەبێت".

بەلآم ئەم دەقەش تێبینی ئەوەی لەسەرە کە ئەو کوشتنەی دیاری نەکردوە کەدەبێتە رێگر لەراسپاردن، لەگەڵ ئەوەی ئەم دیاریکردنە لەنێو زانایانی شەریعەتدا بۆچوونی جیاوازی لەسەرە، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو ناکۆکیە یەکلا بکرێتەوەو جۆری ئەو کوشتنە دیاری بکرێت کەدەبێتە رێگر، چونکە لەبنەما بریار لێدراوە چەسپاوەکانی فیقهی ئیسلامیدا هاتووە:" ئەگەر دادوەر بۆچوونی یەکێك لەزانایانی وەرگرت لەو بابەتانەی ناکۆکی لەسەرە ئەوا ئەو ناکۆکیە بەوە یەکلا دەبێتەوەو کار بەو حوکمە دەکرێت".

لەروانگەی ئەم راستیەوە دەتوانین بڵێین: بریاردانی یاسادانەر لە بۆچوونێکی دیاریکراو لە بۆچونەکانی زانایان لەهەموو بابەتە جێ ناکۆکەکاندا بەدەق لەسەری هەمان ئەنجامی دەبێت.

ئاشکرایە دیاریکردنی جۆری ئەو کوشتنەی دەبێتە رێگر لەبەرکەوتنی میراتیو راسپاردن لەگرنگترین بابەتە فیقهیە جێ ناکۆکەکانە[1] ، لەبەر ئەوە داوا لەیاسادانەری

---

٢- نەکوشتنی راسپاردنکارە بەئەنقەستو دوژمنکارانە مەگەر راسپاردنکار پێش مردنی زانیبێتیو نەیگۆریبێت".

[1] حەنەفیەکان لە (الدر المختار ٧٦٧/٦)دەڵێن: "رێگر بریتیە لەو کارەی تۆڵەکردنەوە یان کەفارەی لەسەر بێت، بەراستەوخۆیی دەبێت بەبێ بوونە ".

←

عێراقی دەکەین ئەو دەقە هەموار بکاتەوەو جۆری ئەو کوشتنە دیاری بکات کەدەبێتە ڕێگر بەهەمان شێوەی کەیاسای وڵاتانی دیکەی عەرەبی کردویانە[1].

پێشنیاز دەکەین هەموارکردنەوەکە بەم شێوەیە بێت:" بێبەش دەکرێت لەوەرگرتنی راسپاردنی بەویستی خۆ(اختیاری) یان راسپاردنی پێویست (الوصیة الواجبة) ئەو کەسەی هەستاوە بەکوشتنی راسپاردنکار یان میراتلێگیراو بەکوشتنێکی دوژمنکارانە، ئیدی راستەوخۆ ئەنجامی دابێت یان بەشدار بووبێت تێیدا، یان شایەت بێتو لە شایەتیەکەیدا درۆی کردبێتو بووبێتە هۆی دەرچوونی فەرمانی لەسێدارەدان بۆ راسپاردنکارەکەو جێبەجێ کرابێت، ئەگەر بکوژەکە عاقڵو باڵغ بوو تەمەنی گەیشتبووە پازدە ساڵ".

**مەرجی چوارەم: نابێت میراتگر بێت.**

ئەم مەرجە بۆچوونی جیاوازی لەسەرە بەم شێوەیە:

أ/ هەندێك لەزانایان وتوویانە[2]:راسپاردنکردن بۆ میراتگر دروست نیە بەرەهایی، ئیدی میراتگرەکان مۆڵەت بدەن یان نا، لەگەڵ ئەوەدا مۆڵەت وەرگرتن لە

---

مالکیەکان لە (الشرح الصغیر ٢/٤٧٥)وتوویانە: "ڕێگر بریتیە لەکوشتنی بەئەنقەست بەشێوەی ستەمکارانەو دوژمنکارانە".

شافعیەکان (المهذب ٣/٢٤): "بۆچوونی جیاواز هەیە لەنێویاندا، هەیانە دەڵێت: کوشتنی تەواو ڕێگرە".

حەنبەلیەکان (المغنی ٦/٢٩٢): "وەك حەنەفیەکانن بەڵام بەمەرجی دانانێن راستەوخۆ بێت".

و جەعفەریەکان (الخلاف للطوسي ٢/٣٩): وەك مالیکیەکانە.

ئەبازیەکانیش وتویانە (شرح النیل وشفاو العلیل ٨/٢٦٩) ڕێگری رەهایە کوشتن.

زاهریەکانیش وتوویانە (المحلی ٩/٣٠٦): " کوشتن ڕێگر نیە نە بۆ میراتی نەبۆ راسپاردن، بەهۆی گشتگیری دەقەکانی قورئانو نەچەسپانی فەرموودە ".

[1] وەك یاسای راسپاردنی میسری بەرکار (م١٧)، وسوری (م٢٢٣) وتونسی فەصلی (١٧٩).

[2] زاهریەکان لە (المحلی ٩/٣١٦) وتوویانە: "راسپاردن بەهیچ شێوەیەك بۆ میراتگر نابێت، ئەگەر راسپاردنی کرد بۆ کەسێك دواتر لەکاتی مردنی راسپاردنکاردا ئەو کەسە بووە میراتگری، راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر راسپاردنی کرد بۆ میراتگرێك پاشان بەمیراتگر نەما ئەوا راسپاردنەکەی بۆ نابێت، چونکە دانانەکەی بەتاڵ بووە ئیدی میراتگرەکان مۆڵەتی ئەوەیان دابێت یان نا".

←

کەسەکانی راسپاردنەکە دەگۆڕێت بۆ خەڵات لە میراتگرەکانەوە بۆ راسپاردن بۆکراو، جا ئەوەی لە بەخشەرو پێبەخشراودا مەرج بێت لە مۆڵەتدەرو راسپاردن بۆکراویشدا دەبێتە مەرج.

چەند بەڵگەیەکیان بۆ ئەو دروست نەبوونە هێناوەتەوە، لەوانە:

١- لەراسپاردنکردن بۆ میراتگردا زیان بەمیراتگرەکانی دیکە دەکەوێت، قورئانی پیرۆزیش نەهی کردووە لەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ﴾ [1]. پێغەمبەر (ﷺ) نەهی لەوە کردووە: ((الإضرار في الوصية من الكبائر))، واتە: زیان گەیاندن لەراسپاردندا لەگوناهە گەورەکانە. [2]

٢- قورئانی پیرۆز مافی هەر میراتگرێکی دیاری کردووە، پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت: ((إن الله أعطى كل ذي حق حقه، فلا وصية لوارث))، واتە: خوای گەورە مافی هەر خاوەن مافێکی داوە، بۆیە راسپاردن بۆ میراتگر رێگەپێنەدراوە. [3]

یاسای وڵاتە عەرەبیەکانیش ئەم ئاراستەیان وەرگرتووە [4].

ب/ هەندێك وتوویانە[1]: راسپاردنەکە دروستەو جێبەجێکردنەکەی لەسەر رازیبوونی میراتگرەکان راوەستاوە، ئەگەر رێگەیان پێدا پاش مردنی

---

مالیکیەکان لە (الخرشي ١٧١/٨) وتوویانە: "راسپاردن بۆ میراتگر بەتاڵە بەوەی راسپاردنەکەی پێچەوانەی مافەکانیان بێت یان بۆ هەندێکیان بێت و بۆ ئەوانی تریان نەبێت"... شافیعیەکانیش لە (المهذب ٤٥١/٢)وتوویانە: "گوتەی شافیعی سەبارەت بەراسپاردن بۆ میراتگر جیاوازی تێدایە، لەیەکێك لەدوو بۆچوونەکەیدا دەڵێت دروست نیە لەبەر ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ): ((لا وصية لوارث)). هەندێك لە زەیدیەکانیش وتوویانە دروست نیە (التاج المذهب ٣٦٦/٤) و(الدراري المعنية ٢٦٠/٢).

[1] النساء : ١٢

[2] رواه سعيد بن منصور بإسناد صحيح عن ابن عباس، ورواه النسائي مرفوعا ورجاله ثقاة.

[3] سبل السلام (٣٨/٣).

[4] وەك یاسای مەغریبی فەصلی (١٧٦): "راسپاردن بۆ میراتگر نابێت".

راسپاردنکار ئەوا دروستەو جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر نا ئەوا بەتاڵ دەکرێتەوە، یاسای هەندێ لەوڵاتە عەرەبیەکانیش هەمان بۆچوونیان پەیرەو کردووە.

ئەوانەی ئەم بۆچوونەیان هەیە چەند بەڵگەیەك دەهێننەوە، گرنگترینیان:

١- هۆکاری قەدەغەکردنی راسپاردن بۆ میراتگر ئەو زیانەیە کەدەگات بەمیراتگرەکانو ئەو رقو کینەو هەستکردن بەجیاوازیو جیاکارییە کەدروستی دەکات، ئەم هۆکارەش بوونی نابێت کاتێك میراتگرەکانی دیکە پاش مردنی راسپاردنکارەکە مۆڵەت بدەنو لەو کاتەدا شایستەیەتی ئەو مۆڵەتدانەیان تێدا بێت.

٢- فەرموودەی: ((لا وصية لوارث)) راسپاردن بۆ میراتگر نابێت، لەهەندێ گێڕانەوەدا ئەم زیادەیەی لەگەڵدایە: ((إلا أن يُجيزها الورثة)). [2] مەگەر میراتگرەکان مۆڵەت بدەن، بەپێی ئەم جیاکردنەوەیەش بێت راسپاردن بۆ میراتگر دروستەو جێبەجێکراوە ئەگەر میراتگرەکانی دیکە مۆڵەتیان داو شایستەیەتی ئەو مۆڵەتدانەیان تێدا بوو.

---

[1] حەنەفیەکان لە(البدائع الصنائع ١٠/٤٨٥٠)دا وتوویانە: "ئەگەر راسپاردنی بۆ هەندێ لەمیراتگرەکانی کردو میراتگرەکانی دیکەی رێگەیاندا ئەوا راسپاردنەکە دروستە، چونکە نەبوونی رەزامەندی ئەوەیە بەهۆی هەندێکی دیکەیانەوە زیانو خراپەیان پێدەگات، لەهەندێ گێڕانەوەشدا هاتووە: (لا وصية لوارث إلا أن يجيزها الورثة))"... بۆچوونی دووەمی شافیعی (المهذب ١/٤٥١): "دروستە راسپاردن بۆ میراتگر بەهۆی ئەو فەرمودەیەی کە ئیبن عەباس لەپێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: ((لا تجوز لوارث وصية إلا إن شاء الورثة)) واتە: راسپاردن بۆ میراتگر نابێت مەگەر میراتگرەکان رەزامەند بن لەسەری.

حەنبەلیەکان وتوویانە (المغني ٦/٦): "راسپاردن بۆ میراتگر نیە بەبێ رەزامەندی میراتگران".

[2] نيل الأوطار ٦/٤٦.

ج/ زانایـانی جەعفـەری[1] و زانایـانی زەیـدی[2] وتوویانـە: راسـپاردن بـۆ میراتگـر لەسنووری سێ یەکدا بەرەهایی دروستە، ئیـدی میراتگرەکـانی دیکـە مۆڵـەت بدەن یان نا.

چونکە فەرمانەکەی خوای گـەورە بـۆ بەدەمەوەهاتنـە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ...﴾ بەئایەتـەکانی مـیرات هـەڵگیراوە (رفـع)، ئەگـەر بەدەمـەوەهاتن (وجوب) هەڵگیرا ئەوا رێگەپێدان (جواز) جێگەی دەگرێتەوە، لەسەر ئەم بنەمایە ئـەو فـەرموودەی پێغەمبـەر (ﷺ): ((لا وصـیە لـوارث)) راسـپاردن بـۆمیراتگر نیـە، واتـە رەتکردنەوەی بەدەمەوە چوون (وجوب) نـەك مۆڵەتـدان (جـواز)، واتـە بـە پێویسـت (واجب)ی نەماوەتەوە وەك ئەوەی پێش هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی میراتی وابوو.

یاسادانەری عێراقیش لەمادە (١١٠٨- یاسای مەدەنی)دا ئەم بۆچوونەی هێنـاوە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:" دروستە راسپاردن بۆ میراتگر و مـیرات نـەگر لەسـێ یەکداو ئەگەر لەسێ یەك زیاتر بوو جێبەجێ ناکرێت بەبێ رەزامەندی میراتگرەکـان"، پـرۆژە یاسای مەدەنی نوێش هەمان ئاراستەی گرتووە.

جێی ئاماژەیە لەو ناکۆکیەی باسمان کرد کەلەنێوان زانایـانی شـەریعەتدا[3] هەیـە کاتی مردنی راسپاردنکارەکە لەبەرچاو دەگیرێت لەدانانی ئەوەی کەراسپاردن بـۆکراو ئایا میراتگرە یان میراتگر نیە[4].

---

[1] لە (الروضة البهية) (٢/٥٥)دا هاتووە: "راسپاردن بۆ خزم بەباش زانراو (مستحب)ی ئیدی میراتگر بێت یان میراتگر نەبێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ... الآيـة﴾. لەبەر ئەوەش کەپەیوەندی خزمایەتی تێدایە.

[2] التاج المذهب (٤/٤٠٣)

[3] جگە لەزانایانی زاهری (المحلى ٩/٣١٦) هەروەك پێشتر باسمان کرد دەڵێن بەرەهایی بەتاڵە ئیدی لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا میراتگر بوویێت یان کاتی مردنەکە.

[4] لە (الخرشي) (٨/١٧١)دا هاتووە: "هەر کەسێك راسپاردنێکی کرد بۆ برایەکی کـاتێ کەتەندروسـتی بـاش بوو یان نەخۆش بوو، پاش ئەوە کوڕێکی بوو، راسپاردنەکە دروستە، چـونکە میراتگرەکـە بـەمیراتگری نەمایەوە، لەراسپاردنەکەدا ئەو کاتەی پێی دەدرێت لەبەرچاو دەگیرێت کەئەویش رۆژی مردنەکەیـەتی، ←

**بۆچوونی پەسەند:**

پاش ئەم پوختەیە لە لێکدانەوەی بۆچوونی زانایانی موسڵمان (رەحمەتی خوایان لێبێت) بۆچوونی چوارەممان لا دروست دەبێت کەدەکرێت هەموو بەڵگە دژ یەکەکانی سێ بۆچوونە جیاوازەکەی تێدا کۆ بکرێتەوە، ئەویش بریتیە لە رێگەپێدانی راسپاردن بۆ هەندێ لەمیراتگران لەسنووری سێ یەکدا بەرەهایی، ئیدی میراتگرەکانی دیکە رێگەی پێبدەن یان نا، ئەگەر هاتوو پێویستیەك یان بەرژەوەندییەك لەئارادا بوو کەئەو راسپاردنکردنەی دەخواست کە بۆ هەندێك لەمیراتگرەکان بکرێت، هەروەك لەم حاڵەتانەدا:

أ. ئەگەر راسپاردن بۆکراو خوێندکار بوو بۆ تەواوکردنی خوێندنەکەی پاش مردنی راسپاردنکار پێویستی بەو راسپاردنە هەبوو.

ب. یان ئەگەر کەم ئەندام یان توشبوو بەنەخۆشیەکی درێژخایەن بوو یان بەتەمەن بوو بەجۆرێك کەنەتوانێت بژێوی خۆی دابین بکاتو ئەمیش بەرپرس بووبێت لەدابینکردنی بژێویەکەی.

ج. یان لەنێوان میراتگرەکاندا جیاوازی رۆشنبیری یان ئابووری یان پلەی فەرمانبەری هەبوو... وەك ئەوەی یەکێك لەمیراتگرەکان پزیشك یان ئەندازیار یان پارێزەر بێت، ئەوانەی دیکە بێ بەش بن لەو پلەیەو لەرووی ئابووریەوە دەستکورت بن و بەوجۆرە....

د. یان راسپاردن بۆکراو لەکاتی ژیانی راسپاردنکاردا بەشدار بووە لەگەڵی لەپێکهێنانی ئەو سامانە کەپاش مردنی دەگۆرێت بۆ میراتی.

---

ئەگەر راسپاردنی کرد بۆ ئافرەتێك پاشان لەکاتێکدا تەندروستی باش بوو بووە هاوسەریو پاشان مرد، راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێت، چونکە ئەوەی میراتگر نەبوو بووە میراتگر، کاتی مردنەکە لەبەرچاو دەگیرێت".

هـ. يـان ئـەوەتا ژنـی نـەهێناوەو بەپێچـەوانەی ئەوانـەی دیکـەوە زۆر پێویـستی بەژنهێنانەو، پێویستی بە خەرجیو پێداویستیەکانی ژنهێنانە.

و. یان هەر هۆکارێکی دیکەی رەوشتیو ئاینیو مرۆیی کەئەوە بخوازێت جیاکاری بکرێت لەنێوان میراتگرەکاندا لەرێگەی راسپاردنەوە بۆیان.

بەڵام ئەگەر هەموویان لەیەك ئاستدا بوون لەرووی ئـابووریو رۆشـنبیریو توانـای جەستەییەوە، لێرەدا جیاکاری لەنێوانیانداو بەرزکردنەوەی هەندێکیان بەسەر ئـەوانی دیکەدا بەراسپاردن کارێکی حەرامە، بەهۆی ئەو رقو کینەو ئیرەییو پەرتـەوازەیی — کەلەهەندێ حاڵەتدا— و کاری دیکەیـە کـە دروسـتی دەکـاتو ئیسـلامو عـەقڵی سـاغ بەباشی نازانن.

**مەرجی پێنجەم: نابێت راسپاردنبۆکراو بۆ کاری گوناهکاری بێت:**

پێویستە بۆ دروستی راسپاردن ئەم مەرجە هەبێت، ئیـدی راسـپاردنکار موسـڵمان بێت یان ناموسڵمان [1]، لەسەر ئەم بنەمایـە: دروسـت نیـە راسـپاردن بۆئەنجامـدانی کۆبوونەوەی پرسەو تازیێو ناندانی ئەوانەی لـەماڵی مردووەکـە کۆبوونەتـەوەو هـاتو هاوارو قیژەیانە، چونکە ئەوە بەتەواوی حەرامە [2].

ئەوەی لەئێستادا باوە خەرجکردنی سامانێکی زۆر بۆ خۆ دەرخستنو شانازیکردن لەکارە نوێیەکانو داهێنراوە خراپەکاندا کەپێویستە موسـڵمانان خۆیـان بـەدووربگرن لێـی، لەسـەر بەرپرسـانیش پێویسـتە سـنوورێك بـۆ ئـەم دیاردانـە دابنـێن کـەهیچ بنەمایـەکیان نیـە لـە ئیسـلامداو، لەعـەقڵی ساغیشـدا جێگـەی نابێتـەوە بەتایبـەت ئەنجامـدانی چـلەو، رۆژی نوێکردنـەوەی ئـەم کـارە خراپانـەو، سـاڵیادی یەکـەمی مردنەکەی.

---

[1] المغني (١٠٥/٦)، الأنوار (٢٣/٢)، المحلى (٣٢٧/٩).

[2] بدائع الصنائع (٤٨٩١/١٠). المغني (١٠٤/٦).

**مەرجی شەشەم: نابێت راسپاردن بۆکراو دوژمنکار (حربی) بێت:**

ئەم مەرجەش پێویستە بۆدروستی راسپاردن، ئیدی راسپاردنکار موسڵمان بێت یان نا، چونکە بەخشینی سامان پێی وەك هاوکاریکردنیەتی لەسەر سەرپێچی، لەبەر ئەوە دروست نیە، دەکرێت ئەم مەرجە لەنێو پێنج مەرجەکەدا دابنرێت، چونکە راسپاردن بۆ دوژمنکار گوناهکردنە (معصیە)یە.

**مەرجی حەوتەم: نابێت راسپاردنبۆکراو تەواو نادیار بێت:**

بۆ دروستی راسپاردن پێویستە راسپاردن بۆکراو نادیارنەبێت بەشێوەیەکی تەواو کەنەتوانرێت پەیدا بکرێت، چونکە نادیاریەك نەتوانرێت پەیدابکرێت دەبێتە رێگر لەوەی کەکراوەتە راسپاردن بدرێتە راسپاردن بۆکراو، بۆ نمونە ئەگەر راسپاردنی کرد بۆ یەکێك لەدانیشتوانی بەغدا، بێگومان دروست نیە، بابشڵێت: راسپاردن دەکەم بۆ یەکێك لەو دوو پیاوە، بابەتەکە جێی ناکۆکیەو لای هەندێك دروستەو بەتاڵیشە لای هەندێکی دیکە لەبەر ئەوەی نادیاریەکەی تەواوە[1]، بەڵام ئەگەر راسپاردن بکات بۆ هەژارانی گوندێك یان شارێك یان ناوچەیەك راسپاردنەکەی دروستە، چونکە بائەوان ئەژماریش نەکرێن بەڵام بەهۆی ناساندنی هەژاری یان نەداری جیادەکرێنەوە [2].

**مەرجی هەشتەم: راسپاردنبۆکراو رازی بێت بە راسپاردنەکە:**

لەدەروازەی یەکەمدا بەدرێژی لەم مەرجە دواین، هەیانە وتوویانە مەرجی جێبەجێکردنە -کەئەمەشیان پەسەندە- هەشیانە بۆ ئەوە چووە کەمەرجی دروستیە.

---

[1] لە (البدائع الصنائع)(١٠/٤٨٩٤)دا هاتووە: "ئەگەر راسپاردنی کرد بۆیەکێك لەو دوو پیاوە بەپێی گوتەی ئەبو حەنیفە دروست نیە، لای ئەوان (مەبەست دوو هاوەڵەکەیەتی) دروستە: لای ئەبو یوسف راسپاردنەکە دەکرێتە نیوە لەنێوان هەردووکیاندا، لای محەمەد میراتلێگیراو سەرپشکە کامیان دیاری بکات ".

[2] سەرچاوەی پێشوو(١٠/٤٨٦٦)، الروضة البهية (٢/٤٩).

## دەروازەی چوارەم
## بابەتی راسپاردنەکە و مەرجەکانی
## (الموصی به وشروطه)

بابـەتی راسـپاردنەکە –هـەروەك لەپێشـەکیەکەدا باسـکرا– خاوەنـداریێتی بـوونی گواستراوەو نەگوێزراوەو، ئـەو مافانـەی کەبـەپارە دەقەبلێنـدرێن (المقومـە بالمـال) دەگرێتەوە، وەك مـافی هاوشـانێتی (جقـوق الارتفـاق)و، ئـەو مافانـەی پـەیوەنـدداره بەسـامانەوە، وەك دواخسـتنی قـەرز کـەکاتی دانـەوەی هاتبێـتو، بوونـە خـاوەنی سوودی نشیتەجێبوون لەخانوو و کشتوکاڵو چنینەوەی بەروبومو بەرهەم، هەروەها وەك لێخۆشبون لەقەرزار لـەو قـەرزەی کەلەسـەریەتیو لەکـەفیل لـەوەی کردویەتیـە کەفیلی.

بۆ دروستی راسپاردنیش دەبێـت بابـەتی راسـپاردنەکە ئـەم چـوار مەرجـەی تێـدا بێت[1]:

---

[1] الأنوار (٢٣/٢): "پایەی سێیەم راسپاردنکراوەکەیەو چەند مەرجێکی هەیە:
یەکەم: دەبێت شتێکی باش بێت ئەوەی بەکارهێنانو سوودی لێ وەرگرتنی حەرام بێـت وەك ئـارەقو بـەرلز دروست نیە.
دووەم: نابێت حەرام بێت
سێیەم: بکرێت لەکەسێکەوە بگوێزرێتەوە بۆ کەسێکی دیکە بەبێ رێگەی میراتی، دروست نیە بەتۆڵـەو سزای قەزف و مافی هاویەشیو سەرپشکی.
چوارەم: لەسامانەکەی بێت (واتە لەوماڵە بێت کەخۆی خاوەنیەتی).
پێنجەم: دەبێت زیاتر بێت لەدانەوەی قەرزەکانیو خەرجی کفنو دفنی..."

**مەرجی یەکەم: لەو شتانە بێت کە بەمیراتی دەگوێزرێنەوە:**

مەرجە ئەوەی دەکرێتە راسپاردن بتوانرێت لەمیراتی لێگێراوەوە بگوازرێتەوە بۆ میراتگر، وەك سامانی ماڵینە (الاموال العينية)و، مافە هاوبەشەکان (حقوق الارتفاق)و، ئەو قەرزانەی لەئەستۆی کەسانی تردایە... ئەگەر وانەبوو مەرجە کە بشێت بەوەی بکرێتە بابەتی گرێبەست لەکاتێکدا کە راسپاردنکار لەژیاندایە، وەك ئەو سوودەی دەکرێت بە شێوەی کرێ یان خواستن بکرێتە موڵك[1].

ئەگەر بەوجۆرە نەبوو کەئەو دووەی لەسەر جێبەجێ بکرێت، ئەوا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتو، ئەو میراتیەشی کە بەمیراتی دەگوێزرێتەوە بریتیە لەهەموو جۆرەکان سامان، ئیدی خانوبەرە بێت یان گواستراوە، هاوشێوەیی بێت یان بەهایی بۆ دابنرێت (مثلية أم قيمية)، لەژێر رکێفی خاوەنەکەیدا بێت یان بەدەستی بریکاریەوە بێت، وەك خواستن یان کرێ یان بەدەستی دەستدرێژیکار یاخود دزەوە بێت... ئیدی دیاریکراو بێت یان بەشێکی لەهاوبەشدا، مافێکی ماڵینە بێت، مافێکی ماڵی چەسپاو لەئەستۆی کەسێکی دیکەدا بێت وەك قەرز، بەپێی ئەم مەرجە دروست نیە راسپاردن بەشتێك کەتەرخان کرابێت بۆ بەرژەوەندی گشتی وەك ئەو سامانەی بەپێی شەریعەتی ئیسلامی دەکرێتە وەقف، ئەو شتانەی بەپێی یاسا دەبنە شوێنەوار. چونکە رێگەنەدراوە مامەڵەیان پێوە بکرێت پاش ئەوەی خەسڵەتی گشتێتیان وەرگرت.

یاسادانەری عێراقی لەمادە (٦٩)ی یاسای باری کەسی دانی بەم مەرجەدا ناوە، کەئەمە دەقەکەیەتی: "مەرجە لەبابەتی راسپاردندا کە بتوانرێت پاش مردنی راسپاردنکار خاوەندارێتی بکرێت"، یاسای وڵاتە عەرەبیەکانیش بەهەمان شێوەیان کردووە.[2]

---

[1] الروضة البهية (٤٩/٢): "دروست نیە راسپاردن بەشتێك کەنەتوانرێت بگوێزرێتەوە".

[2] وەك یاسای راسپاردنی میسری بەرکار (م١٠) وسوری (م٢١٦).

**مەرجی دووەم: دەبێت بەهادار -متقوم- بێت:**

ئەوەی کراوەتە راسپاردن -وەك پێشتر باسمان کرد- لەوانەیە سامان بێتو دەکرێت مافێك بێت لەومافانەی وەك سامان وایە، ئەگەر سامان بوو ئەوا دروستی راسپاردنەکە مەرجە کە بەهادار بێت لەشەریعەتی راسپاردنکاردا، بەهادار-متقوم- ئەو سامانەیە کەبەتەواوی لەبەردەستدایەو، بەپێی شەرع لەهەردوو حاڵەتی توانا و سەرپشك[1] بووندا سوود لێوەرگرتنی دروستە، بە بەهادار-متقوم- ناودەبرێت چونکە بەهایەکی هەیە کاتێ دەستدرێژی دەکرێتە سەرو لەناو دەبرێت.

**مەرجی سێیەم: دەبێت راسپاردنکار ئەو کاتەی دەکرێتە راسپاردن خاوەنی بێت، ئەگەر شتەکە دیاریکراو بوو:**

ئەوەی کراوەتە راسپاردن یان ئەوەتا خۆی سامانە -ماڵە-، یان بەشێکی دیارە لەشتێکی دیاریکراو، یان ئەوەتا جۆرەکەی دیاریکراوە یان بەشێکی دیاریکراو تێیدا، یان بەتەنهایە یان ژمارەیەکی دیاریکراوە لەو شتەی جۆرەکەی دیارە، یان سوودمەند بوونە یان ئەوەی لەحوکمیدایە وەك بەش (غلە)و بەروبوومەکەی، یان پشکێك لەهەموو سامانەکە، ئەگەر خۆی دیاری نەکرابوو یان بەشێکی دیار نەبوو لەشتێکی دیاریکراو بەخۆی، ئەوا مەرج نیە کاتی راسپاردنکردنەکە لەدەستی راسپاردنکاردا بێت، بەڵکو مەرجە کاتی مردنی لەخاوەندارێتیدا بێت.

ئەگەر وتی: کتێبەکانم دەکەمە راسپاردن بۆ فڵان کەس، لەکاتی راسپاردنکردنەکەشدا کتێبی نەبوو، ئەوا راسپاردنەکەی دروستە ئەگەر کاتی مردنی بووە خاوەنی کتێب ئەگەر نەشبووە خاوەنی کتێب، ئەوا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێت.

---

[1] المهذب (٢/٤٥٢): "دروستە راسپاردن بەهەر شتێکی پیسیش کە رێگەدرابێت سوودی لێ وەربگیرێت وەك پەیین و سەگی راهێنراوو پێستی مردارەوە بوو، چونکە دروستە هەڵگرتنو سوود لێوەرگرتنیان، دروستیشە لەدەستێکەوە بەراسپاردن بگوازرێتەوە بۆ دەستێکی دیکەو، ئەو شتانەی دروست نیە سوودیان لێ وەربگیرێت دروستیش نیە بکرێنە راسپاردن وەك خواردنەوەو بەرازو سەگی هار".

**مەرجی چوارەم: دەبێت راسپاردنكراو لەسنووری سێ یەكی لێجێماودا بێت:**

زانایـانی شـەریعەت بۆچـوونی جیاوازیـان هەیـە سـەبارەت بـەم مەرجـە، ئـەم پرسیارانەی لەسەر دەكرێت:

ئایا مەرجی دروستی یە یان مەرجی جێبەجێكردن؟

ئایا بەهای هەیە ئەگەر هاتوو راسپاردنكار میراتگری نەبوو؟

ئایا پابەند بوون بەدیاریكردنی ئەو سـێ یەكـە لـەكاتی راسـپاردنكردنەكەدایە یـان كاتی مردنی؟

ئایا بەهای دەبێت ئەگەر میراتگران لەكاتێكدا راسپاردنكار لەژیاندا بـوو مۆڵەتیانـدا یان پێویستە پاش مردنی بێت؟

فەرموون لەگەڵ وەڵامی ئەم پرسیارانە بەشێوەیەكی پوخت:

**یەكەم: بۆچوونیان جیاوازە لەدیاریكردنی سروشتی مەرجەكە:**

أ/ زۆرینـەی زانایـان وتوویانـە بـۆ جێبـەجێكرانی راسـپاردنەكە ئـەوەی كراوەتـە راسپاردن مەرجە لەسنووری سـێ یەكدا بێت، راسپاردن ئەوەی كە لەسـێ یـەك زیـاتر بوو دروستە بەڵام لەسەر رەزامەندی میراتگرەكان وەسـتاوە [1]، ئەگـەر میراتگرەكـان

---

[1] حەنەفیەكان لە (بدایة المبتدي والهدایة مع تكملة فتح القدیر ١٠/٤١٥) وتوویانە: "ئەوەی زیاتر لەسـێ یـەك بوو دروست نیە، پێغەمبەر (ﷺ) بەسەعدی كوڕی وەقاصی فەرموو: ((الثلث والثلث كثیر))، واتە: سـێ یەك و سێ یەكیش زۆرە، ئەمە پاش ئەوە بوو راسپاردنكردن بە هەموو ماڵ یان بەنیوەی رەتكردەوە، چونكە مافی میراتگرانی تێدایە.. مەگەر میراتگرەكانی كە گەورە بن پاش مردنی رێگەی پێبدەن ".

شافیعیەكانیش لە (مغني المحتاج ٣،٤٦)وتوویانە: "دەبێت راسـپاردن بـەزیاتر لەسـێ یـەكی ماڵەكـەی نەكات، ئەگەر راسپاردنەكەی زیاتر بوو لەسـێ یـەكو میراتگری تایبـەتی خـاوەن هەڵسوكـەوتی رەهـا رەتی كردەوە ئەوا زیادەكە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر رێگەشی پێدا ئەوا رێگە پێدانەكەی جێبـەجێكردنو وازلێهێنانە بۆ هەڵسوكەوتكردنی راسپاردنكار بەزیادەكەوە ".

حەنبەلیەكانیش لە (المغني ٦/١٢)وتوویانە: "هەر كەس راسپاردنی كـرد بـۆ كەسـێك كـەمیراتگر نـەبوو بەزیاتر لەسێ یەك ئەگەر پاش مردنی راسپاردنكار میراتگرەكان مۆڵەتیاندا بـەوە ئـەوا دروسـتە، ئەگـەر مۆڵەتیان نەدا ئەوا دەكرێتەوە بەسێ یەك ".

←

مۆڵەتیاندا ئەوا بەزیادەکەوە جێبەجێ دەکرێت بەکاریگەری پێشتر، ئەگەر ڕەتیشیان کردەوە ئەوا زیادەکەی بەکاریگەری پێشتر بەتاڵ دەبێت.

بەڵگەیان: ڕێگری لە ڕاسپاردنکردن بەزیاتر لەسێ یەك بەمەبەستی پاراستنی مافی میراتگرەکانە، ئەگەر هاتوو بەرەزامەندی خۆیان دەستبەرداری ئەو مافە بوون لەکاتێکدا کەئەو میراتگرانە لێوەشابوون بۆ بەخشین (اهل للتبرع) ئەوا ڕاسپاردنەکە بەزیادەکەوە ڕێگەدراوە.

ب/ زاهریەکان وتوویانە: مەرجی ڕاسپاردن نەکردن بەزیاتر لەسێ یەك مەرجی دروستی یە، ئەگەر زیاتر بوو ئەوا بەتاڵە ئەو زیادەیە، ئیدی میراتگری هەبێت یان نا، یاخود میراتگرەکانی ڕێگەی پێبدەن یان نا، ئەمەش لەبەر ناڕەزای دەربڕینی پێغەمبەر (ﷺ) لە زیاتر لەسێ یەك و ناڕازیبوونیشی لە شتێك بەتاڵ بوونی دەخوازێت[1].

لەوتەی هەندێك لەزانایانی مالیکیش [2] ئەوە دەخوێندرێتەوە کە ئەوان بۆچوونیان

---

شیعەی ئیمامیش لە (الروضة البهیة ٢/٥٠) وتوویانە: "بۆ ئەوەی کەزیاترە لەسێ یەك مەرجە میراتگرەکان مۆڵەتی بدەن ئەگەرنا بەتاڵە".

مالیکیەکانیش لە (الشرح الصغیر مع الصاوي ٢/٤٣٦)وتوویانە: "ئەگەر ڕاسپاردنی بەزیاتر لەسێ یەك کرد بۆ میراتگرێك لەکاتێکدا تەندروستی باش بوو یان لەکاتی نەخۆشیندا، ئەوا بۆ میراتگرەکانی دیکە هەیە یان بۆ ئەو میراتگرەش هەیە مۆڵەت بەوە بدەن یان ڕەتی بکەنەوە ".

١ ئیبن حەزم لە (المحلی ٩/٣١٧)وتوویەتی: " ڕاسپاردن بەزیاتر لەسێ یەك دروست نیە، بۆ میراتگر بێت یان بۆ میرات نەگر، میراتگری هەبێت یان نەیبێت، میراتگرەکانی ڕێگەی پێبدەن یان نەیدەن، لەڕێگەی سەعدی کوڕی وەقاصەوە گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (ﷺ) سەردانی کردم کاتێ نەخۆش بووم پێم وت: ماڵەکەم هەمووی دەکەمە ڕاسپاردن؟ فەرمووی: نەخێر، وتم: نیوەی؟ فەرمووی نەخێر، وتم: سێ یەکی؟ فەرمووی بەڵێ و سێ یەکیش زۆرە.... تا کۆتایی فەرمودەکە ". بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی (المحلی) (٩/٣١٧– ٣٢٢).

٢ خرشي (٧/١٧١) دەڵێت: "بەو جۆرەی کە ڕاسپاردن بۆ کەسێك کەمیراتگر نیە بەزیاتر لەسێ یەکی ئەوەی هەیبوو لەڕۆژی جێبەجێکردندا بەتاڵ دەبێتەوە و ئەرزش بۆ ڕۆژی مردن دادەنرێت، ئەگەر میراتگران ڕازی بوون بەوەی ڕاسپاردنکار کردویەتیە ڕاسپاردنو بۆ هەندێ لەمیراتگرەکانی یان ئەوەی زیاترە لەسێ یەك بۆ کەسێك کەمیراتگر نیە، ئەوا ئەوە بە پێدان دادەنرێت لەلایانەوە نەك ←

جیاواز نیە لەگەڵ زاهریەکاندا لەدانانی مەرجەکە بەمەرجی دروستیو بەتاڵبوونی ڕاسپاردن لەزیادەکەیداو ئەمەش یەکێکە لە دوو بۆچوونەکەی شافیعی[1].

شەوکانیش وتوویەتی: لەرووی واتاوە بەڵگەیان هێناوەتەوە کە ڕێگریی لەبنچینەدا بۆ مافی میراتگرەکان بووە، بۆیە ئەگەر ئەوان مۆڵەتیان پێدا نابێتە ڕێگر.[2]

**دووەم: هەندێك لەزانایان جیاوازیان کردووە لەنێوان ئەو کەسەی میراتگری هەیە و ئەوەی میراتگری نیە:**

أ/ هەندێك لەزانایان وتوویانە: ڕاسپاردن کردن بەزیاتر لەسێ یەك کاتێك کە هیچ میراتگرێکی تایبەتی نەبێت بەتاڵە، چونکە دوو لەسەر سێیەکەی دیکە خاوەندارێتیەکەی دەگوازرێتەوە بۆ بەیتولمال (گەنجینەی گشتی)و کەسێك نیە مافی خاونی مافی مۆڵەتدان بێت لەماڵی گشتیدا، چونکە ئەو کەسەی بۆی هەیە مۆڵەت بدات دەبێت خاوەنی بێتو خاوەنی بەیتولمالیش هەموو ئومەتە، هەروەها لەبەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە بەشێوەیەکی ڕەها کە ڕاسپاردن بکرێت بەزیاتر لە سێ یەكو ئەمەش نابەسترێتەوە بەبوونی میراتگرەوە بەبەڵگە نەبێت بۆ ئەمەش بەڵگە نیە[3]، بۆچوونی زۆرینەی زانایان لەسەر ئەمەیە.

---

جێبەجێکردنی ڕاسپاردنەکە، پێویستە ئەو کەسەی ڕاسپاردنی بۆ کراوە پێی ڕازی بێتو بەدەستداری تەواو دەبێت" چونکە دیاری یە نەك ڕاسپاردن.

[1] المهذب (٤٥٠/١): ئەگەر میراتگری هەبوو ئەوا دوو بۆچوون هەیە لەبارەیەوە: یەکێکیان ئەوەیە ئەوەی لەسێ یەکی ڕاسپاردنەکە زیاتر بوو بەتاڵ دەبێتەوە چونکە پێغەمبەر نەهی لەسەعد کرد کەڕاسپاردن بکات بەزیاتر لەسێ یەك نەهیش وادەخوازێت خراپە.

[2] نیل الأوطار ٤٧،٦

[3] شافیعیەکان لە (مغني المحتاج ٤٧/٣) وتوویانە: " بەڵام ئەگەر میراتگرێکی تایبەتی نەبوو، ئەوا ڕاسپاردن بەزیاتر نابێت، چونکە مافی موسڵمانانی تێدایە، بۆیە ڕێگەپێدراو نیە ".

حەنبەلیەکان لە (المغني ١٠٧/٦) وتوویانە: "کەسێك هەموو ماڵەکەی بکاتە ڕاسپاردن و هیچ میراتگرێکی نەبێت لەخاوەن پشکە دیاریکراوەکان و خزمانی پشت، لە ئەحمەدیان گێڕاوەتەوە ڕاسپاردن بەهەموو ماڵەکەی دروستە، ئەمە لەلای ئیبن مەسعود سەلمێندراوەو خەڵکی عێراقیش هەمان شتیان وتووە، گێڕانەوەکەی دیکە (واتە هی ئەحمەد) "(تەنها بە سێ یەك دروستە مالیكو ئەوزاعیو ←

ب/ هەندێکی دیکە بۆ ئەوە چوون کە راسپاردن بەهەموو سامانەکە دروستە ئەگەر راسپاردنکار میراتگری تایبەتی نەبوو، خاوەنانی ئەم بۆچوونە بەڵگەیان بەوە هێناوەتەوە کەرێگری لە راسپاردنکردن بەزیاتر لەسێ یەك لەبەر بەرژەوەندی میراتگرەکانەو زیان نەگەیاندنە پێیان، هەروەك ئەم لێکدانەوەیە لەفەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) دەخوێندرێتەوە:((إنك إن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تذرهم عالة يتكففون الناس)).

واتە: ئەگەر میراتگرەکانت بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت باشترە لەوەی بەنەداری جێیان بهێڵێتو دەست لەخەڵکی پان بکەنەوە.

لەبەر ئەوە کاتێ راسپاردنکار میراتگری تایبەتی نابێت کەبەهۆی راسپاردنەکەیەوە زیانی پێ بگات پاساو-علە-کە نامێنێت، حوکمیش لەگەڵ پاساوەکەیدا دەسوڕێتەوە بەبوونو نەبوونی.[1]

---

ئیبن شبرمەو شافیعیش هەمان شتیان وتووە، چونکە کەسی تر هەیە جێی بگرێتەوە (مەبەست بەیتولمالە) لەبەر ئەوە راسپاردنەکەی لەوەی زیاترە لە سێ یەك جێبەجێ ناکرێت، هەروەك ئەوەی کە میراتگرێکی تایبەتی لەپاش بەجێما بێت ".

ئیبن حەزم لە (المحلى ٩/٣٢٧-٣٢٨) وتوویەتی: "دروست نیە راسپاردنکردن بەزیاتر لەسێ یەك ئیدی میراتگری هەبێت یان نەبێت، میراتگرەکانی رێگە بەوە بدەن یان نەیدەن، بەهۆی فەرموودەکەی سەعدەوە (الثلث والثلث كثير)".

شەوکانی لە (نيل الأوطار ٦/٤٤) وتوویەتی: "کۆدەنگی لەسەر ئەوە جێی گرتووە کە رێگە نەدرێت بەراسپاردنکردن بەزیاتر لەسێ یەك، بەڵام بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بەوکەسەی میراتگرێکی تایبەتی نیە، زۆرینەی زانایان بۆئەوە چوون رێگەی پێنەدەن بەزیاتر لەسێ یەك و حەنەفیەکان رێگەیان داوە بەزیادەکە بەهەمان شێوە ئیسحاقو شریكو ئەحمەد لەریوایەتێکدا ئەمەش بۆچوونی عەلیو ئیبن مەسعودە ".

[1] حەنبەلیەکان لە (١٠٧/٦) لە دلنیایانانی یەکێك لەو دوو ریوایەتەی لەئەحمەدەوەیەو رێگە بەزیاتر لەسێ یەك دەدات: "رێگەنەدان بەزیاتر لەسێ یەك بەهۆی ئەوەیە مافی میراتگرانی تێدایە بەو بەڵگەیەی کەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((إنك إن تذر ورثتك أغنياء خير من أن تدعهم عالة يتكففون الناس)) واتە: ئەگەر میراتگرەکانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت باشترە لەوەی بەجێیان بهێڵیت چاویان لەدەستی خەڵك بێت، لێرەدا هیچ میراتگرێك نیە تا مافی لەسامانەکەدا هەبێت ".

←

**سێیەم: بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بە کاتی دیاریکردنی سێ یەکەکە:**

أ. زۆرینەی زانایان وتوویانە: لەدیاریکردنەکەدا ڕەچاوی کاتی مردنی دەکرێت، ڕووی جێگەی بایەخ بەهای لێجێماوەکەو ئەوەی کراوەتە ڕاسپاردنو دەرکردنی لەسێ یەکەکە لەکاتی مردنیدایە لای زۆربەی زانایان، چونکە کاتی پێویستبوونی ڕاسپاردنەکەیەو پەیوەستبوون (تعلق)ی ڕاسپاردنەکەیە بەلێجێماوەکەوە [1].

ب. زاهریەکان وتوویانە: کاتی ڕاسپاردنکردنەکە لەبەرچاو دەگیرێت، چونکە گرێبەستێکە ئەو شتە دەگرێتەوە کەکاتی بڕیاردانەکە هەبووە، هیچ گوێ بەو زیادەیە نادرێت کەلەنێوان ڕاسپاردنەکەو مردنی ڕاسپاردنکاردا ڕوودەدات، هەموو

---

لە (سبل السلام) (١٣٨/٣) هاتووە: "فەرموودەکە لەبارەی ئەوانەوەیە کە میراتگریان هەیە، بەڵام ئەوانەی میراتگریان نیە، مالیك بۆ ئەوە چووە کە هەروەك ئەوانەیە کەمیراتگریان هەیە، هادویەو حەنەفی ڕێگەیان بەڕاسپاردنکردن بەهەموو ماڵ داوە ئەمەش بۆچوونی ئیبن مەسعودە".

لە (نیل الأوطار) (٤٤/٦) هاتووە: "بۆچوونیان جیاوازە لەوەی کەمیراتگرێکی تایبەتی نیە، حەنەفیەکانو ئیسحاقو شریكو ئەحمەد لەگێڕانەوەیەکیدا کەئەوەش بۆچوونی عەلیو ئیبن مەسعودە".

[1] حەنبەلیەکان لە (المغني ١٥٤/٦) وتوویانە: "کاتی مردنەکە جێی بایەخە لەدیاریکردنی بەهای ڕاسپاردنەکەو دەرکردنو دەرنەکردنی لەسێ یەك، چونکە ئەو کاتە کاتی پێویستبوونی ڕاسپاردنەکەیەو بەهای ماڵەکە بەپێی ئەو کاتە دیاری دەکرێت، ئەمەش بۆچوونی شافعیو (أصحاب الرأي)یە و هیچ ڕاجیاییەکی تێدا نابینم".

ئیمامیەکانیش لە (الروضة البهية ٥٠/٢) وتوویانە: "ئەوەی بەلێجێماو دادەنرێت بەسەرنجدان لەبڕەکەی تا سێ یەکی لێ جیابکرێتەوە کاتی مردنیەتی نەك کاتی ڕاسپاردنکردنو ئەو کاتەی کەوتۆتە نێوانیان، چونکە ئەو کاتە کاتی پەیوەست بوونی ماڵەکەیە بەڕاسپاردنەکەوە".

حەنەفیەکان لە (البداية والهداية مع تكملة فتح القدير ٤٤٩/١٠) وتوویانە: "هەر کەسێك ڕاسپاردنی کرد بەسێ یەکی ماڵەکەیو ماڵی نەبوو دواتر دەستی کەوت، ئەو کەسەی ڕاسپاردنی بۆ کراوە شایستەی سێ یەکی ئەوەیە کەکاتی مردن ڕاسپاردنکار هەیبووە، چونکە ڕاسپاردن گرێبەستی جێگرتنەوەیە دواخراوە بۆ پاش مردنو پاش مردنی حوکمەکەی دەچەسپێت، بۆیە مەرجە سامانەکە هەبێت کاتی مردنەکە نەك پێش مردنی".

زیادەیەك كەلەو ماوەیەدا دروست ببێت راسپاردنەكە ناگرێتەوە[1].

ج. مالیكیەكان وتوویانە: لەرۆژی جێبەجێكردندا بڕی راسپاردنكراوەكە دیاری دەكرێت، چونكە كاتی سەقامگیربوونو پەیوەستبوونی مافی راسپاردن بۆكراوە بەراسپاردنكراوەوە.[2]

**چوارەم: بۆچوونیان جیاوازە سەبارەت بەكاتی رێگە پێدانەكە:**

أ/ زۆرینەی زانایانی فیقهی ئیسلامی وتوویانە: كاتی مۆڵەتدانی میراتگرەكان بەوەی كەزیاترە لەسێ یەك كاتی پاش مردنی راسپاردنكارەكەیە نەك ئەو كاتەی لەژیاندایە، ئەمەش لەبەر دوو هۆ:

یەكێكیان: لەكاتێكدا راسپاردنكار لەژیاندایە مۆڵەت بدەن ئەمەش پێش سەلماندی مافەكەیە بۆ ئەو كەسەی رێگەدەدات كەسێكیش خاوەنی شتێك نەبێت مافی دەست لێ هەلگرتنی نیە.

دووەمیان: مۆڵەتدان دەست هەلگرتنە لەمافێك بۆیە پێویستە رەگەزی رەزامەندی تێدا بێتە دی، هەبوونی ئەمەش لەكاتێكدا لەژیاندایە ئەوا بەدڵنیاییەوە نیە، چونكە ئەگەری هەبوونی زۆرلێكردنی مەعنەوی (ئەدەبی) لەئارادایە وەك شەرمكردن یان

---

[1] ئیبن حەزم لە (المحلی ٩/٣٢١) وتوویەتی: " كەسێك راسپاردن بكات بەزیاتر لەسێ یەكی ماڵەكەی و دواتر ماڵی تری دەستكەوت، راسپاردنەكە تەنها بەرادەی سێ یەكی ئەوەی كاتی راسپاردنكردنەكە هەیبووە رێگە پێدراوە، چونكە ئەوەی زیاترە لەوە وەك گرێبەستێكی حەرام ولیە و حەلاڵ نیەو هەر شتێكیش بەتاڵ بوو ئەوا دروست نیە بۆ یەكێكی تر ببێت ئەگەر نەبەسترابێت ".

[2] (خرشي) (٨/١٧١) وتوویەتی: " راسپاردنكردن بۆ میراتگر بەتاڵە هەروەها بۆ جگە لەمیراتگریش ئەوەی زیاترە لە سێ یەك لە رۆژی جێبەجێكردندا بەتاڵە لەمەشدا رۆژی مردن لەبەرچاو ناگیرێت".
شافیعیەكان دوو بۆچوونیان هەیە، یەكێكیان لەگەڵ بۆچوونی زاهریەكاندا یەكدەگرێتەوە و دووەمیشیان ئەوەیە كە زۆرینەی زانایان بڕیاریان لەسەر داوە بەوەی كاتی مردن رەچاو دەكرێت (المهذب ١/٤٥١).

مادی وەك ترسان لەزیانێکی ماڵی یان جەستەیی.[1]

ب/ هەندێك وتوویانە: تەنها مۆڵەتدان لەوکاتەی راسپاردنکار لەژیاندایە بەسە، چونکە میراتگرەکان مافیان هەیە لە سامانەکەیدا بەو بەڵگەیەی بۆیان هەیە رێگری بکەن لەهەڵسوکەوت بەسامانەکەیەوە کەزیانی هەبێت، ئیدی تەندروستی باش بێت یان لەنەخۆشی سەرەمەرگدا بێت[2].

ج/ مالیکیەکان[3] زیاتر درێژەیان پێداوەو وتوویانە: ئەگەر لەکاتی نەخۆشی سەرەمەرگدا راسپاردنی کرد بەزیاتر لەسێ یەكو میراتگرەکانی پێش مردنی رێگەیان پێدا، ئەگەر دوور بوو لە گومانی زۆرلێکردن ئەوا ئەو رێگەپێدانە لەسەر میراتگرەکانی پێویست دەبێت، بەڵام ئەگەر عوزرێکی هەبوو بەوەی کە خەرجی لەسەر راسپاردنکار بووەو ترساوە لەوەی ئەگەر رێگەی نەدایە بەراسپاردنەکەی ئەوا خەرجی پێنەدەدرا، یاخود قەرزێکی راسپاردنکاری لەسەر بووەو ترساوە ئەگەر رێگەی پێنەدایە ئەوا داوای قەرزەکەی لێدەکردەوەو بەندی دەکرد... لێرەدا رێگەپێدانی ئەو کاتەی

---

[1] لە (البداية والهداية مع تكملة فتح القدير (٤١٧/١٠) هاتووە: "مۆڵەتدانیان لەکاتێکدا لەژیاندا بێت بەهای نیە، چونکە پێش سەلماندنی مافەکەیە لەبەر ئەوەی بەمردنی مافەکەیان دەسەلمێت ، بۆیان هەیە پێش مردنی رەتی بکەنەوە بەپێچەوانەی پاش مردنەوە، چونکە پاش سەلماندنی مافەکە بۆیان نیە لێی پاشگەز ببنەوە ".

لە (المهذب) (٤٥٠/١)دا هاتووە: رەتکردنەوەو مۆڵەتدان دروست نیە پاش مردن نەبێت، چونکە پێش مردن هیچ مافێکی تێدا نیە، هەربۆیە راست نیە دەست لێ هەڵگرتنی وەك لێبوردن لە هاوبەشی پێش فرۆشتنی ".

لە (المغني) (١٢/٦): دا هاتووە "هەر کەس راسپاردنی کرد بۆ کەسێ کەمیراتگر نیە بەزیاتر لەسێ یەك میراتگرەکان پاش مردنی راسپاردنکار مۆڵەتی ئەوەیاندا ئەوا دروستەو ئەگەر مۆڵەتیشیان نەدا ئەوا دەگەڕێندرێتەوە بۆ سێ یەك ".

[2] زانایانی ئیمامی لە (الروضة البهية ٥٠/٢) وتوویانە: " رێگەدان لەکاتی ژیانی راسپاردنکاردا بەسە با میراتگرەکە خاوەنیشی نەبێت لەو کاتەدا لەبەر ئەوەی مافی پەیوەستە بەماڵەکەوە ئەگەر وانەبوایە نەیدەتوانی رێگری بکات لەراسپاردنکار لەهەڵسوکەوت بەسامانەکەیەوە ".

[3] الخرشي ١٨٠/٨.

راسپاردنکار لەژیاندا بووە لەسەری پێویست نیە، بۆی هەیە پاش مردنی لێی پاشگەز ببێتەوە.

دەرئە نجام

پاش خستنە رووی ئەو چوار بابەتە کەپەیوەنددارن بەمەرجی چوارەمەوە دەکرێت ئەم ئەنجامانەمان دەست بکەوێت:

١. هۆکاری ناکۆکی لەبابەتی یەکەمدا: بریتیە لە جیاوازی بۆچوون لەو نەهیەی لەفەرموودەکەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاصدا هاتووە سەبارەت بەراسپاردنکردن بەزیاتر لە سێ یەك، جا ئەوانەی وتوویانە: مانای خراپی (فساد) ئەوە دەگەیەنێت کە نەهی لێکراوە[1] ئەوا وتوویەتی مەرجەکە بۆ دروستییە، ئەوانەشی وتوویانە مانای خراپبوون ناگەیەنێت چونکە بۆ وەسفی ناپێوست (وصف غیر لازم)ە کەئەویش زیان پێ گەیشتنی میراتگرەکانە، ئەمانە وتوویانە مەرجەکە بۆ جێبجێکرانە (شرگ نفاذ)، ئەو میراتگرەی زیانی پێدەگات سەرپشك کراوە لەنێوان رێگەدان بەزیادەو رەتکردنەوەی‌و هەڵوەشاندنەوەی راسپاردنەکە تێیدا.

٢. بەرهەمی ناکۆکیەکە: بەپێی بۆچوونی یەکەم زیادەکە بەخشینە (هبە) لەرێگەپێدەرەوە بۆ راسپاردن بۆکراو، بۆیە دەکەوێتە ژێر حوکمەکانی بەخشین، بەپێی بۆچوونی دووەمیش راسپاردنەکەی لەراسپاردنکارەوە دەکەوێتە ژێر مەرج‌و حوکمەکانی.

رای پەسەند ئەوەی دووەمیانە لەبەر بەهێزی بەڵگەکانی زۆرینە.

٣. سەرچاوەی ناکۆکی لەبابەتی دووەمدا: جیاوازی بۆچوونە لە (تعلیل)ی نەهی لەزیادەکە، ئەوەی کەوتی: عیللەتی رێگەنەدانەکە پێویستبوونی میراتگرەکانە

---

[1] ئەوەش بۆچوونی زاهریەکان‌و مالیکیەکان‌و گوتەکەش هی شافیعیە.

به لێجێماوەکە، دەڵێت: ئەگەر میراتگری نەبوو بۆی هەیە چۆنی بوێت وا ڕاسپاردن بکات لەسامانەکەیدا، چونکە حوکم بەنەمانی عیلەکەی خۆیشی نامێنێت، ئەوەشی لەم تەعلیلەی نەڕوانیوەو ڕێگەنەدانەکەی بەسنووری خوای گەورە زانیوە کە خوای گەورە نەهی کردووە لەبەزاندنی: ﴿تِلْكَ حُدُودُ اللّٰهِ فَلاَ تَعْتَدُوهَا﴾ [1]، ئەمانە وتوویانە بەرەهایی ڕێگە پێنەدراوە ئیدی میراتگری هەبێت یان نەی بێت جیاوازییەکی نیە. [2]

ڕای پەسەند بریتیە لە دروستی ڕاسپاردن بەهەموو لێجێماوەکە لەحاڵەتی نەبوونی میراتگری تایبەتدا ئەمە ئەگەر دارایی گشتی (بەیتولمال) پێویستی پێی نەبوو، چونکە میراتگری ئەوانەیە کەمیراتگریان نیە، ئەگەر وانەبوو ئەوا پێویستیەکەی وەك میراتگری تایبەت دادەنرێت، کارەکەش بۆ مەزندەی قازی بەجێهێڵدراوە.

٤. سەرچاوەی ناکۆکیەکە لەبابەتی چوارەمدا: بریتیە لەناکۆکی لەکاتی دروستبوونی هۆکارەکە، جا ئەوەی وتوویەتی: لەکاتی مردنەکەوە دێتە دی، دەڵێت بەهای لێجێماوەکە لەوکاتەوە دەخەملێندرێت، ئەوەشی بۆ ئەوە چووە کە بەدەرچوونی ڕاسپاردنەکە لەڕاسپاردنکارەوە کاتەکە دەچەسپێت کار بەو کاتە دەکات.

---

[1] البقرة:٢٢٩.

[2] ئیبن حەزم لە (المحلى ٣١٨/٩) وتوویەتی: "دەستەیەکیش وتوویانە ئەوەی میراتگری نیە، بۆی هەیە هەموو سامانەکەی بکاتە ڕاسپاردن، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ ڕێگرییەکەی بەپێویستبوونی میراتگرەکانی بە لێجێماوەکە پاساو داوەو فەرموویەتی: ((أن تدع ورثتك أغنياء... الى آخره)). ئەگەر میراتگری نەبوو ئەوا پاساوەکە نامێنێتو بۆی هەیە چەندی بوێت بیکاتە ڕاسپاردن ".

پاشان ئیبن حەزم وەڵامی ئەم لێکدانەوەیە دەداتەوەو دەڵێت: "دروست نیە ئەوە بدرێتە پاڵ پێغەمبەر ﷺ کە (علل فاسدة منكرة) حاشا ئەو دوورە لەوە ".

ڕای پەسەند بریتیە لە کارپێکردن بەکاتی مردنەکە ئەگەر هاتوو ڕاسپاردنەکە بەبەشێکی دیاریکراوی هاوبەشی (شائع) لێجێماوەکە بوو، وەك سێ یەك یان چوار یەكو بەوجۆرەو، بەکاتی ڕاسپاردنەکەش ئەگەر بەبەشێکی دیاریکراو بوو کەنابێت لە سێ یەکی لێجێماوەکە زیاتر بێت لەکاتی مردنیدا.

٥. سەبارەت بەجیاوازیان لەبابەتی کۆتاییدا (کاتی ڕێگەدان): سەرچاوەکەی جیاوازی بۆچوونیانە لەدیاریکردنی کاتی پەیوەستبوونی مافی میراتگرەکان بەسامانی میراتی لێگیراوەکەیانەوە، جا ئەوەیان کەوتوویەتی: بەرەهایی ئەو مافە هەیە ئەوا کاری بەرێگەدانی میراتگرەکان کردووە ئەو کاتەی ڕاسپاردنکار لەژیاندایە، ئیدی ڕاسپاردنەکەی لەکاتێکدا کردبێت کەتەندروستی باش بووە یان لەنەخۆشینی سەرەمەرگدا بووە جیاوازی نیە لایان.

ئەوەشی وتوویەتی: ئەم مافە لەئارادا نیە تا پاش مردنی ڕاسپاردنەکارەکە، بۆچوونی وایە: کاتێ ئەو لەژیاندایە ڕێگەدانی ئەم زیادە ڕەوییە، چونکە کەسێك شتێکی نەبێت ناتوانێت ببەخشێت، ئەوەشی جیاوازی کردووە لەنێوان حاڵەتی تەندروستی باشو نەخۆشبوونیدا، بۆچوونی وابووە: لەنەخۆشی سەرەمەرگدا مافی میراتیگرەکان پەیوەستە بەسامانی میراتی لێگیراوەکەیانەوە، ئەمانە ڕایان وابووە ئەگەر ناتەواوی (عیب)ی ئیرادەی تێدا نەبوو لەم حاڵەتەدا دەتوانێت ڕێگە بدات [1].

ئەمەی کۆتاییان پەسەندترین بۆچوونیانە بەهۆی کۆدەنگیان لەسەر ئەوەی کە ماڵ بەخشینەکانی نەخۆش لەکاتی نەخۆشینی سەرەمەرگدا حوکمەکانی ڕاسپاردنی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت. [2]

---

[1] ئەم بۆچوونەش مەزهەبی ئیمامی مالیکە.

[2] جگە لەزاهریەکان کەئەوان جیاوازی ناکەن لەنێوان حوکمی بەخشین لەکاتی تەندروستیو کاتی نەخۆشینی سەرەمەرگ.

شایانی باسه كه ڕێگەدانی میراتگر كاتێ جێگای بایەخە كەشیاوی ئەو ڕێگەدانە بێتو بزانێت بڕە زیادەكە چەندە، بەم پێیە ئەگەر پاش ڕێگەدانەكە وای بانگەشە كرد كەوای زانیوە زیادەكە كەم بووەو دواتر هەڵەكەی خۆی بۆ دەركەوتووەو ئێستا ئەو ڕێگەدانە ڕەت دەكاتەوە، لەم كاتەدا دەڕوانرێتە:

أ. ئەگەر بەڵگەیەك هەبوو دەریدەخست بڕی ڕاستەقینەی زانیوە، لێرەدا پاشگەزبوونەوەكەی لێ قبوڵ ناكرێت مەگەر بەپێی گوتەی ئەوانەی كەبۆچوونیان وایە ڕێگەدان بەخشینێكی دەستپێشخەرییە.

ب. ئەگەر بەڵگەیەك نەبوو پێچەوانەی داواكەیو سامانەكەش وادیار نەبوو كە لێی شاراوە نەبێت، لێرەدا قسە قسەی ئەوە لەگەڵ سوێند دانی، چونكە ڕێگەدان وەك دەست لێ بەردان (ابراء) وایە، دروستیش نیە دەست لەشتی نادیار هەڵبگیرێت، ئەسڵەكە ئەوەیە كەنەیزانیوە.

**هەڵوێستی یاسا دانەری عێراقی:**

أ. زیاتر نەبوون لەسێ یەكی بەمەرجی جێبەجێكردن داناوە نەك مەرجی دروستی، بۆیە دروستە ئەگەر زیادیشی هەبوو، بەڵام لەسەر ڕێگەدانی میراتگرەكان رادەوەستێت، لەم بارەیەوە لەمادە (٧٠)ی یاسای باری كەسیدا هاتووە كە:" دروست نیە راسپاردن بەزیاتر لەسێ یەك بەبێ ڕێگەدانی میراتگران، دەوڵەتیش بەمیراتگری هەركەس دادەنرێت كەمیراتگری نەبێت".

ب. جیاوازی نەكردووە لەنێوان راسپاردن بۆ میراتگرو بۆ میرات نەگر، لەمادە (١١٠٨)ی لەیاسای مەدەنی بەركاردا هاتووە كە: "راسپاردن دروستە بۆ میراتگرو بۆ میرات نەگریش لەسێ یەكی لێجێماوداو ئەگەر زیاتر بوو جێبەجێ ناكرێت بەبێ ڕێگەدانی میراتگرەكان".

ئەمەش هاوشێوەی مادە (٢٢٧)ی پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ یە، بەڵام یاسا دانەر دیاری نەكردووە چ كاتێك بۆ ئەو مۆڵەتدانە دروستە، یاسا دانەری

سووریش کارێکی باشی کردووه لەماده (٢٣٨)ی[1] یاسای باری کەسی بەرکاردا کاتێ کاتی مۆڵەتدانەکەی بەوە دیاری کردووه کەپاش مردنی بێت و بە راشکاوی باسی شیاوێتی رێگەپێدەری کردووەو پەیڕەوی لەو بۆچوونە کردووە کەدەڵێت بەرەهایی راسپاردنکردن بۆ میراتگر دروست نیە بەرێگەپێدانی میراتگران نەبێت.

ج. لەراسپاردنکردن بەتەواوی لێجێماوەکە یاسا دانەری عێراقی بۆچوونی ئەوەی پەیڕەو کردووە که وتوویەتی دروستە ئەو کاتەی میراتگری تایبەتی نەبێت، ئەمەش لەماده (٨٨)ی یاسای باری کەسیدا هاتووە کەئەمە دەقەکەیەتی:

شایستەبووانی لێجێماو ئەم پێڕانەن:

١-میراتگران بەخزمایەتیو، هاوسەرگیری دروست.

٢-ئەو کەسەی دان بەڕەچەڵەکیدا نراوە.

٣-ئەو کەسەی هەموو سامانەکەی بۆ کراوەتە راسپاردن.

٤-بەیتولمال.

د. یاسا دانەر باسی لەکاتی خەملاندنی لێجێماوەکە نەکردووە بۆ دیاریکردنی سێ یەکەکەی، بەڵکو لەوەدا بەپێی مادەی یەکەمی یاسای باری کەسی دادوەری ئاراستە کردووە بۆ لای فیقهی ئیسلامی.

لێرەدا ئەوەی جێی باسە کە کەسانێك[2] بانگەشەی ئەوەیان کردووە کە دژیەکی هەیە لەنێوان مادە (٧٠) کەدەوڵەتی داناوە بەمیراتگری ئەوانەی میراتگریان نیە، لەگەڵ مادە (٨٨)[3] برگەی سێیەم کەدانی ناوە بە راسپاردنکردن بەهەموو سامانەکە، چونکە یاسا دانەر راسپاردن بۆکراوی بەهەموو سامانەکەی لەپێڕی

---

[1] لە مادە (٢/٢٣٨) هاتووە: " جێبەجێ ناکرێت بۆ میراتگرو ئەوەشی زیاترە لەسێ یەك، مەگەر میراتگرەکان پاش مردنی راسپاردنکار رێگەی پێبدەن و رێگەدەریش شیاوێتی تەواوی هەبێت ".

[2] وەك بەڕێز (دکتور أحمد الخطیب) لەکتێبەکەیدا ( الوقف والوصایا)، ص٢٨٣.

[3] ئەمەش هاوشێوەی مادە (٢/٢٢٧) پرۆژە یاسای مەدەنی نوێ یە "تکون الدولة وارثة لمن لا وارث له".

شایستەبووانی لێجێماو ئەژمار کردووە، هەر کەسێك مردوو میراتگری نەبوو لەرێی خزمایەتیو هاوسەرگیری دروستەوە، هەروەها دانپێدانراو بەرەچەڵەکیشی نەبوو، بۆ نوێنەری بەیتولمالیش مافی رێگەدان نیە.

لەراستیدا دژیەکی ئەو کاتەیە کە وادابنرێت کەراسپاردن بەهەموو ماڵەکە دەتوانرێت بکرێت بەبێ رێگەدانی هیچ کەس لەکاتی هەبوونی میراتگری تایبەت بەخزمایەتی یان هاوسەرگیرێتی دروست.

بەڵام لەنێوان راسپاردن بەهەموو سامانەکە لەگەڵ دانانی دەوڵەت بەمیراتگری ئەوانەی کە میراتگریان نیە، لێرەدا هیچ دژ یەکیەك بوونی نیە، نە لەفیقهی ئەبو حەنیفەو، ئەوانەی هاوبۆچوونی بوون، کە یاسادانەری عێراقیش لەوی وەرگرتووە، نەلەیاسا دەستکردەکانیشدا. [1]

زانایانی شەریعەتیش کۆدەنگن کە بەیتولمال میراتگری هەر کەسێکە کەمیراتگری نەبێت، هەرچەندە هەندێکیان [2] وتوویانە دروستە راسپاردنکردن بەهەموو سامانەکە

---

[1] لە مادە (٣٧)ی یاسای (الوصیة) میسریدا هاتووە: " راسپاردن بەهەموو ماڵ یان بەبەشێکی جێبەجێ دەکرێت بەبێ راگرتن لەسەر رێگەدانی گەنجینەی گشتی ئەگەر کەسەکە قەرزی لەسەر نەبووو میراتگریشی نەبوو".

لە (فصل)ی (٨٧) تونسیشدا هاتووە: " ئەگەر میراتگری نەبوو لێجێماوەکە یان ئەوەی لێی دەمێنێتەوە دەدرێتە سندوقی دەوڵەت".

لەگەڵ (فصل)ی (١٨٨) تونسی: " هەرکەس قەرزی لەسەر نەبوو، میراتگریشی نەبوو، راسپاردنەکەی جێبەجێ دەکرێت بابەهەموو ماڵەکەشی بێت بەبێ راوەستان لەسەر میراتی سندوقی دەوڵەت".

مادە (٢٦٢)ی یاسای باری کەسی سوری: ٣- ئەگەر ئەوانە نەبوون ئەوا لێجێماوەکە یان ئەوەی لێی دەمێنێتەوە دەدرێتە گەنجینەی گشتی".

لەگەڵ مادە (٢٣٨) لەهەمان یاسا: "٤- راسپاردنی ئەو کەسە جێبەجێ دەکرێت کەقەرزی لەسەر نیەو میراتگری نیە با بەهەموو ماڵەکەی بێت بەبێ راوەستان لەسەر رێگە پێدانی هیچ کەس".

[2] لە (البدائع) ٤٩٢٦/١٠: "ئەگەر راسپاردنی کرد بەزیاتر لەسێ یەکو میراتگری نەبوو، لای ئێمە راسپاردنکردن بەهەموو ماڵەکەی دروستە ".

لە (تنویر الأبصار) ٦٥٢/٦): "یاساوی بەهەمووی لەکاتی نەبوونی میراتگریدایە.

←

•

ئەگەر میراتگری تایبەتی نەبوو.

لەفیقهی ئیسلامیشدا رێگری نەکراوە کەموسڵمان راسپاردن بکات بۆ هاوسەرەکەی کە پەیڕەوی ئاینێکی ئاسمانی تر بێت کە میراتی لەم بەرناکەوێت بەهۆی جیاوازی ئاینەوە دەتوانێت هەموو ماڵەکەی بکاتە راسپاردن بۆی، یان بۆ هاوسەرە موسڵمانەکەی بەزیاتر لەوەی شایستەیەتی دەتوانێت راسپاردن بکات چونکە لەوانە نیە کە زیادە (رد)ی بۆ بگەڕێتەوە.

مەبەستیش لەوەی (دەوڵەت میراتگری هەر کەسێکە کە میراتگری نەبێت) ئەوەیە کەلێجێماوی مردووەکە دەدرێتە گەنجینەی گشتی ئەو کاتەی میراتگری تایبەتی نەبوو، هەروەها ئەگەر کەسێك نەبوو کەهەموو ماڵەکەی بۆ کردبێتە راسپاردن، بە تێگەیشتنی ئەوەی کە یاسا دانەر لە مادە (٨٨)دا ریزبەندی بەیتولمالی خستۆتە پاش پلەی راسپاردن بۆکراو بەهەموو ماڵەکەو، بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەوەی یاسا دانەری عێراقی کردوویەتی لەیاساکانی وڵاتە عەرەبیەکاندا هەیەو کەس دژایەتی نەکردووە لەو وڵاتانەدا.

---

لە (المغني)ی (أبن قدامة) ٦٠٧/٦: "گێڕانەوەکان لەئەحمەدەوە جیاوازن لەوەی میراتگری لەپاش بەجێ نەماوە لەگەڵ خاوەن بەش، لێی دەگێڕنەوە کەراسپاردنەکەی بەهەموو سامانەکەی دروستە، ئەمەش لە ئیبن مەسعودەوە چەسپاوەو عوبەیدەی سەلمانیو، مەسروقو ئیسحاقو، خەڵکی عێراق پەیڕەویان لێ کردووە ".

## باسی دووەم
## حوکمەکانی راسپاردن

راسـپاردن یـان ئـەوەتا بـەخودی شـتەکەیە یـان بەسـوودەکەیەتی، بـۆ هەریەکەشـیان حـوکمی تایبـەت هەیە، هەروەك چۆن حوکمی هاوبەشیشیان هەیە، پاشان یـان ئـەوەتا سەرپشـکیی یـە (ئیختیاریـە) یـان ئـەوەتا پێویسـتە (واجبـە)، دەشـبێت فـرە بێـتو کەڵەکـەبوون (تزاحم) تێیاندا رووبدات، لەهەموو حاڵەکاندا یـان ئـەوەتا راسپاردنەکە دەبێـتو جێبـەجێ دەکرێـت ئەگـەر پایـەو مەرجەکانی تێدا بـوو هـەروەك ئـەوەی زیـاتر بـاوە، یـان بـەهۆی هۆکارێـك لـەهۆکارە بەتاڵکارەکانـەوە بـەتاڵ دەکرێتـەوە، لێکۆڵینـەوەی بابـەتی ئـەم حوکمانـەش وادەخوازێـت کـە لـەرووی رووکـارەوە بـۆ پێـنج دەروازە دابەش بکرێت.

# دەروازەی یەکەم

## حوکمەکانی راسپاردن بەشتی دیار

## (الوصية بالاعيان)

راسپاردن یان ئەوەتا بەشتێکی دیاریکراوە کەخودی شتەکە دیارە یان بەبەشێکی دیاریکراو تێیدا، یان بەشتێکە کەجۆرەکەی دیاریکراوە یان بەبەشێك لێی، یاخود بەبەشێکی دیاریکراو لەلێجێماو وەك سێ یەك یان چواریەك.... یان بەبەشی یەکێك لەمیراتگرەکان، یان بەپشکێك.. بۆ هەر حاڵەتێکیش حوکمی تایبەت بەخۆی هەیە.

یەکەم: ئەگەر راسپاردنەکە بەشتێك بوو کەئاماژە بەخودی شتەکە کرابوو، یان بەوەسفێکی بچوکی کرابوو، وەك: راسپاردنم کرد بەو ئۆتۆمبێلە، یان بەماڵەکەم کە گەڕەکەکەی دیاری کرد، لەگەڵ رووبەرەکەی‌و سنوورەکەی... ئەم حوکمانەی پێ دەچەسپێت:

١. دەبێت شتە دیاریکراوەکە هەبێت‌و، لەکاتی راسپاردن کردنەکەدا هی خۆی بێت ئەگەر وانەبێت بەبەتاڵ دادەنرێت با پاش راسپاردنکردنەکەش ببێتە خاوەنی.

٢. کاتی مردنەکە بەکاتی مەزەندە (تقويم)ی ماڵە دیاریکراوەکەو دەرکردن‌و دەرنەکردنی لە سێ یەکەکە دادەنرێت. [١]

---

[١] لە (المغني) (٦/١٥٥) دا هاتووە: "بۆ دیاریکردنی بەهای ئەوەی کراوەتە راسپاردن‌و دەرکردنی لەسێ یەك یان دەرنەکردنی رەچاوی حاڵەتی مردنەکە دەکرێت، چونکە ئەو کاتە کاتی پێویست بوونی راسپاردنەکەیە بۆیە بەهاکە ئەو کاتە دیاری دەکرێت، ئەمەش گوتەی شافیعی‌و (اصحاب الرای) یەو هیچ ناکۆکیەکی تیا نابینم، سەرنج دەدرێت: ئەگەر ئەوەی کردویەتیە راسپاردن لەکاتی مردنەکەدا سێ یەکی لێجێماوەکە بوو یان کەمتر لەوە بوو ئەوا راسپاردنەکە جێبەجێ دەکرێت و راسپاردن بۆکراو شایستەیەتی هەمووی بیات، ئەگەر بەهاکەی زیادی کرد تا وای لێهات یەکسان بوو لەگەڵ هەموو ←

٣. كە راسپاردن پەیوەست بوو بە شتە راسپاردن پێکراوەکەوە، دروست نیە پاشگەز بوونەوە لێی، بەڵکو پێویستە خودی ئەو شتە دەربکرێت وەك کارکردن بەو دیاریکردنەی راسپاردنکارەکە بەویستی خۆی ئەو شتەی دیاری کردووە، مەگەر ئەو شتەی کرابووە راسپاردن بۆ کەسێکی دیاریکراوی بالغ بووو بەویستی خۆی رازی بوو بەگۆرینی بەشتێکی دیکە، هەروەها دروستە کەنوێنەری راسپاردن بۆکراوی دیاری نەکراو یان کەسی مەعنەوی بەدیلەکە قبولّ بکات ئەگەر هاتوو ئەوە لەبەرژەوەندی راسپاردن بۆکراودا بوو، لەهەموو حاڵەتەکاندا پێویستە پاشگەزبوونەوەو پێدانی شتێکی دیکە لەبری دژ نەبێت لەگەڵ مەبەستی راسپاردنکار لەراسپاردنەکەیدا. (١)

٤. ئەگەر ماڵەکە فەوتا (هلك) یان شایستەی هەموو ماڵە راسپاردن بۆکراوەکە بوو:

أ. ئەگەر ئەمە لەکاتێکدا روویدا راسپاردنکار لەژیاندا بوو ئەوا راسپاردنەکە هەڵدەوەشێتەوە.

ب. ئەگەر پاش مردنی بوو هەڵدەوەشێتەوە، چونکە گرەنتی شتە شایستەبووکەی لەسەرە، دەگۆرێت بۆ قەرەبوو ئەگەر فەوتانەکە بەهۆی میراتگرەکانەوە یان بەهۆی لایەنێکی بیانیەوە بوو، بەڵام ئەگەر فەوتانەکە بەهۆی هێزێکی بەدەر لەتوانا (قوە قاهرە) بوو ئەوا فەوتانەکە لەسەر

---

ماڵەکەدا یان زیاتر لێی یان هەموو ماڵەکە تیاچوو جگە لەو، ئەوا ئەوەی بۆ راسپاردن بۆکراوەو هیچی بۆ میراتگرەکان تێدا نیە، ئەگەر لەکاتی مردنەکەدا زیاتر بوو لەسێ یەك ئەوا راسپاردن بۆکراو بەقەدەر سێ یەکی کاتی مردنەکەی بۆ هەیە".

(١) لە (التاج المذهب) (٣٧٢/٤)دا هاتووە: "ئەگەر راسپاردنی کرد بە شتێکی دیاریکراو بۆ کەسێکی دیاریکراو دروست نیە پاشگەز بوونەوە لێی، بەڵکو پێویستە خودی ئەوەی بدرێتێ چونکە راسپاردنکار دیاری کردووە، مەگەر راسپاردن بۆکراوە دیاریکراوەکە رازی بێت ئەو کاتە دەکرێت پاشگەزبوونەوە، خۆ ئەگەر دیاریکراو نەبوو وەك هەژاران ئەوا بەرەزامەندی ئیمام یان حاکم (قازی) بەرژەوەندی دەبێت، ئەمە ئەگەر پێچەوانەی مەبەستی راسپاردنکار نەبوو".

راسپاردن بـۆكراوە، ئەمـە ئەگـەر بەرپرسـی جێبـەجێكردنی راسـپاردنەكە كەمتەرخـەم نـەبوو لـەدوا خسـتنیدا، چـونكە گـەر كەمتەرخـەم بێـت ئـەوا پاراستنەكەی لەسەر ئەوە[1].

ئەگەر هەموو ماڵەكە فەوتا جگە لەوەی كراوەتە راسپاردن ئەوا ئەوە بۆ راسـپاردن بۆكراوەكـە[2] دەبێـت چـونكە مـافی ئـەوە لەوەدایـە نـەك لەهـەموو ماڵەكـەدا، مـافی میراتگرەكانیش لەهەموو ماڵەكەدایە جگە لەوە، هەربۆیە هەركامیان پشـكەكەی فـەوتا لەبەشی ئەوی دیكە پێی نادرێت.

١. ئەگەر فەوتا یـاخود شایسـتەی بەشـێك لەماڵـە دیاریكراوەكـە بـەخودی بـوو، راسـپاردنەكە لـە فەوتاوەكـەو شایسـتەبووەكەدا هەڵدەوەشـێتەوەو، مـافی راسپاردن بۆكراو دەكەوێتە سەر ئەوەی دیكەی.
٢. ئەگەر راسپاردنەكە بەبەشێكی دیاریكراو لـەپارە یـان بەماڵینەیـەكی دیـاریكراو بەخۆی بوو، لە لێجێماوەكەشدا قەرز یان سامانێكی دیارنـەبوو (مـال غائـب)ی تێدا بوو، ئەوەی كرابوویە راسپاردن لە سێ یەكی ئەو لێجێماوە زیاتر نەبوو كە لەبەردەسـتدایە ئـەوا راسـپاردن بـۆكراو شایسـتەیەتی، ئەگـەر وا نـەبوو ئـەوا بـەرادەی سـێ یـەكی ئـەوەی لەبەردەسـتدایە پێـی دەدرێـت، هـەركاتێ ماڵـە لەبەردەستدا نەبووەكە هاتەوە یان قەرزەكە وەرگیرایەوە ئەوا بـۆ ئـەو كەسـە

---

[1] لەسەرچاوەی پێشوودا (٣٧٥/٤): "پێویستە شتە دیاریكراوەكە كە كراوەتە راسپاردن بدرێتـە راسـپاردن بۆكراو ئەمە لەسەر راسپاردنكار یان میراتگرە كەدەست بەجێ بیدەنە دەستی، چونكە پێویستبووەكان دەستبەجێ جێبەجێ دەكرێن، لەبەر ئەوەگرەنتیكردن پێویستە".

[2] لە (المغني) (١٥٤/٦) دا هاتووە: "ئەگەر هەموو ماڵەكە تیاچوو جگە لەوەی ئەو، ئەوا ئەوە بۆ راسـپاردن بۆكراوە، چونكە مافی میراتگرەكان پەیوەست نیە پێوەی لەبەر ئەوەی بۆ راسپاردنبۆكراو دیاریكرابوو، بۆیە بۆی هەیە بەبێ رەزامەندیو مۆڵەتی ئەوان بیبات ".

ههیه کەراسپاردنی بۆ کراوە سێ یەکی ببات تا تەواوی مافەکەی خۆی بەربکەوێت[1].

٣. ئەگەر ئەو شتەی کرابووە راسپاردن لە مولکی راسپاردنکار کرا بە بەرژەوەندی گشتی وەك تاپۆ کرانی لەلایەن دەوڵەتەوە، ئەوا تاپۆ کردنەکە وەك بێ فەوتاوی مەعنەوی (هلاك معنوی) دادەنرێت، ئەگەر ئەو تاپۆ کردنە لەکاتێکدا روویدا کەراسپاردنکار لەژیاندا بوو ئەوا راسپاردنەکەی هەڵدەوەشێتەوە، ئەگەر پاش مردنیشی روویدا ئەوا لەپێبژاردنەکەدا جێبەجێ دەکرێت چونکە بەرانبەر بەوە قەرەبوو دەدرێت.

---

١ لەو حاڵەتەشدا کە راسپاردنکرلو شتێکی دیاریکرلو بوو بەخۆی ئەو جیاوازی بۆچوونانە هەیە لەنێوان زانایاندا:

أ- هەندێك وتوویانە: لە ماڵەکە بەرادەی سێ یەکی ئەوەی ئامادەیە پێی دەدرێتو ئەوەی دیکە لەو قەرزەی دێتەوەو لەو ماڵەی دیار نیەو پەیدا دەبێتەوە دەیدرێتێ، ئەگەر راسپاردنی کرد بەخانوویەك کەبەهاکەی (٣٠) هەزار دینار بوو، لێچێماوەکەش ئەوەی لەبەردەستدا بوو بایی (٤٥) هەزار دینار دەبوو، لەم کاتەدا راسپاردن بۆکرلو لەو خانووە تەنها شایانی سێ یەکی پارە لەبەردەستدا بووەکەیە کەدەکاتە (١٥) هەزار دینار، کەئەمەش نیوەی پارەی ئەو خانوە دەکات کەبەراسپاردن دراوەتە ئەمو میراتگرەکان خاوەنی نیوەکەی دیکەن، لەهەمان کاتدا راسپاردن بۆکرلو (١٥) هەزار دیناری ماوە وەریبگرێت لەسێ یەکی ئەو پارانەی کەلەقەرزو وەردەگیرێنەوە یان ماڵی نادیارو دەست دەکەونەوە.

ب- زۆرینەی زانایان وتوویانە: پێویستە جێبەجێکردنی راسپاردنەکە پێچەوانەی ویستی راسپاردنکار نەبێت کەئەویش هەموو شتەکە (خانووەکە) بووە بۆ راسپاردن بۆکرلو. نهایة المحتاج ٥٧/٦. والمبسوط ١٣٥/٢٨. کشاف القناع ٥٢٢/٢.

ت- هەندێ لەزانایانی مالیکیش (المنتقی ١٦٤/٦) وتوویانە: "میراتگرەکان سەرپشك دەکرێن لەنێوان رێگەدان بەراسپاردنەکە لە پشکەکەی دیکەی ماڵەکەدا لەگەڵ ئەوەی رێگەنەدنو تەنها بەرادەی سێ یەکی ئەوەی ئامادەیەو لەبەردەستدایە پێی بدەنو ئەوەی مایەوە لەو قەرزانەی وەردەگیرێنەوە یان لەو ماڵەی دیار نیەو دەست دەکەوێتەوە تەواوی بکەن، لەم کاتەشدا ماڵەکە هاوبەشە لەنێوان راسپاردن بۆکراوو میراتگرەکاندا".

بۆچوونی پەسەند بریتیە لە بۆچوونی زۆرینەی زانایان چونکە مەبەستی راسپاردنکار دێنێتە دی لەوەی کەهەموو ماڵە راسپاردن بۆ کراوەکەی دەداتێ ئەگەر زیان بەمیراتگرەکان نەگات.

٤. ئەگەر ئەو ماڵەی کرابووە راسپاردن لەبارمتـەدا بـوو، خـاوەن قەرزەکـە پـاش مردنی راسپاردنکار مافەکەی خۆی لـێ هەڵگرتـەوە، راسـپاردن بـۆکراو مـافی گەڕانـەوە هەیـە بـەرادەی ئـەوەی خـاوەن قەرزەکـە لەماڵـە بارمتـە کراوەکـە بردوویەتی لەوەی ماوەتەوە لەلێجێماوەکە وەریبگرێتەوە.

٥. ئەگەر راسپاردنکار ئەو خانوویەرەی (عقار) کە کردبوویە راسپاردن تێکی بـداو سەر لەنوێ دروستی بکاتەوەو شـێوەکەی بگۆڕێـت بـەجۆرێکی دیکـەی جیـا، لێرەدا ئەو خانووە بەم شێوە نوێ یە راسپاردنەکە تێیدا دەمێنێتـەوە، ئەگـەر هاتوو راسپاردنکار راینەگەیاندبوو کە بەو گۆڕانکاریەی ئەنجامیداوە مەبەسـتی پاشگەز بوونەوە بووە لەراسپاردنەکەی.

٦. ئەگەر هاتوو راسپاردنکار ئەو ماڵەی کردویەتیە راسـپاردن لەگـەڵ ماڵێنەیـەکی دیکەدا لێکیدان بەجۆرێك کەنەتوانرا ئـەوەی کراوەتـە راسـپاردن بەتـەنها پێـی بـدرێت، لێـرەدا راسـپاردن بـۆکراو لەگـەڵ میراتگرەکانـدا لـەنرخی ماڵەکـەدا بەرادەی پشـکەکەی خـۆی هاویـەش دەبێـت، ئەمـە ئەگـەر راسـپاردنکار ئـەو کاتەی لەژیانـدا بـوو راینەگەیانـدبوو کەمەبەسـتی لـەو لێکدانی ماڵـە پاشـگەز بوونەوە نیە لەراسپاردنەکەی.

٧. ئەگەر زەویەکی بەتاڵی کردە راسپاردنو پاشـان خانوویـەکی لەسـەر دروسـت کرد، ئەمە نابێتە هۆی بەتاڵبوونەوەی راسـپاردنەکە، بـەڵکو دەبێتـە هاوبـەش لەگەڵ میراتگرەکاندا، میراتگرەکان بەبەهای بونیاتنانی خانووەکە بـەپێی ئـەو رۆژەی دروستکراوەو راسپاردن بۆکراویش بە بەهای زەویەکە، بەهەمان شێوە چاندنی رووەکیش [1].

دووەم: ئەگەر راسپاردنەکە بە شتێك بوو کە جۆرەکـەی یـان بەشـێکی دیـاریکراو لێی دیار بوو، وەك راسپاردن بەمـەڕەکانی یـان بەبەشـێکی دیـاریکراو لێیـان، یـاخود

---

[1] بۆ زیاتر ئاگادلربوون بڕوانە: (شرح الخرشي ١٧٣/٨) و لاپەڕەکانی دواتر.

بەکتێبـەکانی کتێبخانەکـەی یـان بەبەشـێك لێیـان وەك نیـوەو سـێ یـەك، ئـەوا ئـەم حوکمانەی هەیە:

أ- ئەگەر ئەوەی کرابووە راسپاردن کاتی راسپاردنکردنەکە لەبەردەستدا بوو ئـەوا راسپاردنەکە پەیوەستە پێـوەیو ئـەم پەیوەسـت بوونـە بـەدیاریکردنی خـودی شتەکە دادەنرێتو، ئەم حوکمانە دەیگرێتەوە:

١. ئەگەر ئەمجۆرە هەمووی فەوتا(هلك) یان شایستەی هـەمووی بـوو، ئـەوا هـیچ شتێ بەراسپاردن بۆکراو نادرێت، هەروەك حاڵـەتی ئـەو شـتەی کـە خـودی شتەکە دیاری کرابوو.

٢. ئەگـەر شـتەکە فـەوتا یـاخود شایسـتەی بەشـێکی بـوو، راسـپاردنەکە بـەتاڵ دەبێتەوە بەرادەی ئەوەی کە فەوتاوە یان ئەوەی شایسـتەی بـووە، ئەگـەر هـاتوو نیـوەی مـەڕەکانی کردبـووە راسـپاردنو لـەکاتی راسـپاردنکردنەکەدا هەزار سەر مەڕی هەبوو، پاشان هەنـدێکیان تیاچـوون یـان شایسـتەی بـوو، لێرەدا مافی راسپاردن بۆکراو نیوەی ئەو مەڕانەیە کەماوەتـەوە نـەك نیـوەی هەمووی لەکاتی راسـپاردنکردنەکەدا، چـونکە شایسـتەبوون یـان فەوتانەکـە وەك ئەوە دادەنرێت کەرووی نەدابێت، بەو جۆرە راسپاردنەکە بەسەر ئەوەی ماوەتەوە جێبەجێ دەکرێت.

٣. ئەگـەر ئـەو جـۆرە لـەکاتی مردنـی راسـپاردنکاردا زۆرتـر بـوو ئـەوا مـافی راسـپاردنکارەکە بەزیادەبووکـەوە نیـە، بـەجۆرێك ئەگـەر مـەڕەکان لـەکاتی راسپاردنکردنەکەدا (٣٠) سـەربوونو کـاتی مردنـی راسـپاردنکار بوونـە (٩٠) سەر مەڕ، لێرەدا مافی راسپاردن بۆکراو تەنها لە (٣٠) مەڕەکەدایە.

٤. ئەگـەر ئـەوەی کراوەتـە راسـپاردن ژمارەیـەکی دیـاریکراو بـوو لـەجۆرێکی دیـاریکراو، وەك ئــەوەی راسـپاردن بکـات بـۆ کەسـێك بـە (٢٠) سـەر لەمەڕەکانیو لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا ژمارەی مەڕەکانی هەزار مـەڕ بـوو، لێـرەدا راسـپاردنەکە تـەنها پەیوەنـدداره بـەو ژمارەیـەی لـە راسـپاردنەکەدا

هاتووه، بەجۆرێك ئەگەر تەنها ئەوەندەیان لێ مایەوە کە کراوەتە راسپاردنەکەو ئەوانی تر فەوتان، لێرەدا شایستەی هەموویەتی ئەگەر لەسێ یەك زیاتر نەبوو لەکاتی مردنی راسپاردنکاردا، چونکە راسپاردنکار مەبەستی بووە خاوەندارێتی ئەو ژمارەیەی پێ بدات.

ب- ئەگەر ئەوەی کرابووە راسپاردنو جۆرەکەی دیاریکرابوو لەکاتی راسپاردنکردنەکەشدا بوونی نەبوو، لێرەدا راسپاردنەکە پەیوەست دەبێت بەوەی کە راسپاردنکار هەیەتی لەو جۆرەی کردوویەتیە راسپاردن کاتی مردنی ئیدی بەدەستی هێنا بێت یان پاش راسپاردنەکە بوویێتە خاوەنی[1]، لەم حاڵەتەدا چاوەڕوانی حاڵەتی فەوتان یان شایستەبوونی راسپاردن کراوەکە ناکرێت پێش مردنی راسپاردنکار، چونکە مافەکەی راسپاردن بۆکراو تەنها پەیوەستە بەوەی کەهەیەو دەمێنێتەوە کاتی مردنی راسپاردنکار.

ج- ئەگەر راسپاردنەکەش بەبەشێکی دیاریکراوی جۆرێك لە لێجێماوەکە بوو وەك سێ یەکی باخ یان چواریەکی مەڕەکانیو بەو جۆرە، لێجێماوەکەشی لێی بەقەرز درا بوو یان سامانی نادیار (مال غائب)ی تیا بوو، لەم حاڵەتەدا سەیر دەکرێت بزانرێت:

١. ئەگەر ئەو پشکە زیاتر لەسێ یەکی لێجێماوەکە نەبوو، ئەوا راسپاردن بۆکراو پشکە دیاریکراوەکەی بەتەواوی لەوەی لەبەردەستدایە لەو جۆرە بەری دەکەوێت.

---

[1] لە (التاج المذهب) (٣٨٢/٤)دا هاتووە: "گەر راسپاردنی بەشتێك کرد کەلەکاتی راسپاردن کردنەکەیدا هیچی نەبوو، پێویستە لەوەی کەهەیەتی لەکاتی مردنیدا ئەوەی کردوویەتیە راسپاردن بدرێت، چونکە ئەگەر وتبووی لەماڵەکەم ئەوە بدەنو ماڵیشی نەبوو، دەبێت ئاماژەکەی بۆ ئەو کاتەش بێت کەماڵی دەبێت، چونکە پێدان لەهیچ مەحاڵەو کەسی ژیریش فەرمانی وا دەرناکات، تێدەگەین مەبەستی ئەوەیە کەکاتی مردنی دەیبێت، ئەگەر مردو هیچی نەبوو ئەوا راسپاردنەکەی بەکۆدەنگی زانایان بەتاڵ دەبێتەوە".

٢. ئەگەر زیاتر بوو لەسێ یەکی لێجێماوەکە، لێرەدا شایستەی پشکەکەیەتی بەرادەی سێ یەکی ئەوەی لەبەردەستدایە، ئەوەی لەپشکەکەی کەماوە وەربیگرێت بەدەستی میراتگرەکانە، هەرکاتێ شتێ لەماڵە نادیارەکە هاتەوە یان شتێ لەقەرزەکان وەرگیرایەوە، راسپاردنکار ئەوەی ماوەتەوە لەپشکەکەی‌و بەدەستی میراتگرەکانە وەریدەگرێتەوە تا دەگاتەوە رادەی سێ یەکی لێجێماوەکە[1].

سێیەم: راسپاردن بەبەشێکی دیار لەهەموو لێجێماوەکە وەك سێ یەکی یان چواریەکی یان پێنج یەك‌و.... بەوجۆرە، بۆ ئەم حاڵەتەش چەند حوکمێك هەیە، گرنگترینیان:

١- پێویستە ئەو بەشە هەروەك پێشتر باسمان کرد زیاتر نەبێت لەسێ یەکی لێجێماوەکە، بەبێ رەزامەندی میراتگرەکان لەوەی زیاد بوو راسپاردنەکە جێبەجێ ناکرێت[2]، ئەمەش لەبەر ئەو فەرموودەیەی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، کە دەڵێت: لەساڵی حەجی ماڵئاواییدا پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێکدا ئازارم هەبوو هاتە سەردانم، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئازار ئەوەی بەسەر هێناوم کەدەیبینی، من خاوەن سامانم‌و تەنها کچێکم هەیە میراتگرم بێت، ئایا دوو لەسەر سێی ماڵەکەم ببەخشم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: نەخێر،

---

[1] ئەمە ئەگەر هاتوو هەڵس‌و کەوتێکیان نەکرد کەببێتە هۆی نەمانی موڵکەکە یان هەڵس‌و کەوتێك ببێتە هۆی زیادبوونی یان چاککردنی، لەم حاڵەتانەدا راسپاردن بۆکراو وەریناگرێتەوە، بەڵکو سێ یەکی ئەوەی بۆ هەیە کەلەقەرز وەردەگیرێتەوە یان لەماڵی دیارنەبوو دەست دەکەوێتەوە، چونکە لەوەرگرتنەوەیدا زیان بەمیراتگرەکان دەگات‌و ئیسلامیش ئەوەی ناوێت، لەبەر ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿من بعد وصية يوصي بها أو دين غير مضار﴾، و پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: ((لا ضرر ولا ضرار)) رواه ابن ماجه.

[2] ئەگەر هەندێکیان رێگەیان داو هەندێکیان رێگەیان نەدا ئەوا تەنها لەبەشی ئەوانەدا جێبەجێ دەکرێت کەرێگەیان داوە.

وتم: ئەی نیوەی[1]؟ فەرمووی: نەخێر، پاشان پێغەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: سیێ یەك و سیێ یەکیش زۆرە، تۆ ئەگەر میراتگرەکانت بەدەوڵەمەنـدی بـەجیێ بهێڵیت، باشترە لەوەی بەجێیان بێڵیتو چاویان لەدەستی خەڵکی بێت[2].

ڕێگەپێدرانی راسپاردن لەوەی زیاترە لەسیێ یەك دەوەستێتە سەر رەزامەنـدی میراتگر کە دەبێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

أ. دەبێت باڵغ و عاقڵو تێگەیشتوو بێـت چـونکە ئـەوە دەسـت هەڵگرتنـە لەماف.

ب. پێویسـتە رەزامەندیەکـە بـەپێی بۆچـوونی پەسـەندکراو پـاش مردنـی راسپاردنکار بێت.

ج. دەبێـت ئـەو کەسـەی رەزامەندیەکـە دەدات رادەی ئـەوەی لەسـیێ یـەك زیـاترە بزانێـت ئەگـەر وانـەبوو ئـەوا بـۆ ڕێگـەدەر هەیـە لـەو ڕێگەدانـەی پاشگەز ببێتەوە.

٢- ئەگـەر لێجێماوەکـە قـەرز یـان سـامانی نادیـار (مـال غائـب) هـەبوو لێـرەدا راسپاردن بۆکراو پشکەکەی خۆی لەوەی لەبەر دەستدایە دەدرێتـیێ هـەرکاتیێ لەوەی قەرزەکە یان ئەوەی نادیارە هاتـەوە ئـەوا بـەرادەی پشـکەکەی خـۆی تێیدا دەیدرێتیێ.

٣- ئەگەر پاش مردنی راسـپاردنکار هەنـدیێ لەماڵەکـەی تیاچـوو، ئـەم تیاچـوونە لەبەشی راسپاردن بۆکراوو میراتگرەکانیشە، هەریەکەیان بەپێی بەشـی خـۆی لەلێجێماوەکە.

---

[1] واتە جۆر.

[2] المنتقى شرح الموطأ ٦/١٥٥ لاپەڕەکانی دواتر.

چوارەم: ئەگەر بەشی میراتگرێکی دیاریکراوی کردە راسپاردن (واتە نیوەی) وەك هی کوڕەکەی یان کچەکەی، لەم کاتەدا:

١. ئەگەر ئەو میراتگرە مردبوو ئەوا راسپاردن بۆکراو دەچێتە جێگاکەی‌و ئـەوەی بەشی ئەو میراتگرە بووە ئەگەر زیندوو بوایە بەر ئەم دەکـەوێت، نابێت ئەمـە لەسێ یەکی لێجێماوەکە زیـاتر بێت هـەروەك ئـەوەی لەراسـپاردنی پێویسـت (الوصیة الواجبة)دا هەیە[1].

٢. ئەگەر زیندوو بوو ئەوا یەکێك وەك پێڕی ئەو میراتگرە زیـاد دەکرێـت کـە وەك پشـکەکەی ئـەوی کردۆتـە راسـپاردن، ئەگـەر وەك بەشـی کوڕەکـەی کـردە راسپاردن‌و دوو کوڕی هەبوو ئەوا راسپاردن بۆکراو سێ یـەکی بەردەکـەوێت؟، ئەگەر سێ کوڕی هەبوو ئەوا چوار یـەکی بەردەکـەوێت‌و... بـەوجۆرە، ئەگـەر بەرادەی بەشی کچێکی کـردە راسـپاردن‌و دوو کچـی هـەبوو، ئـەوا راسـپاردن بۆکراو بەشی کچی سـێیەمی بەردەکـەوێت، وەك ئـەوەی سـێ کچـی لـەپاش بەجێ مابێت[2].

---

[1] ئەگەر راسپاردنم کرد بۆ کوڕی کچەکەم بەبەشی کچەکەم‌و مـردو کچـێك‌و دایـك‌و بـاوك‌و ژنەکـەی لـەپاش بەجێما، وا دادەنرێت کە:

| | باوك | دایك | ٢ كچ | ژنەکەی | |
|---|---|---|---|---|---|
| **میراتگرەکان:** | باوك | دایك | ٢ كچ | ژنەکەی | بنچینەی بابەتەکە ٢٤ ە بچوکترین چەندجارەی هاوبەش بەرز دەکرێتەوە بۆ ٢٧ |
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٦/١ | ٣/٢ | ٨/١ | بۆ هەریەك لەدایك‌و باوك ٢٧/٤، |
| پشکەکان: | ٤ | ٤ | ١٦ | ٣ | بۆ ژنەکەی ٢٧/٣، بۆ کچەکەی‌و کوڕی کچەکەی بەراسپاردن ٢٧/٨. |

[2] لە (الشرح الکبیر مع الدسوقي) (٤/٤٤٦)دا هاتووە: "ئەگەر وتی لەگەڵ کوڕەکەمدا بیکەنـە میراتگر یـان وتـی پێـی بـدەن یـان پلـەی خـۆی بـدەنێ یـان بیخەنـە ریـزی کوڕەکـەم، راسـپاردن بـۆکراو بـەزیاتر لەمیراتگرەکان مەزەندە دەکرێت و لێجێماوەکە لەنێوانیاندا بـەش دەکرێـت (ئەگـەر میراتگرەکـە تـەنها یەکێك بوو) دووبەش بۆ راسپاردن بـۆکراو دەبێـت ئەگـەر (میراتگرەکـە) رێگەیـدا بـەزیاتر لەسـێ یـەك، ئەگەر ولنەبوو هەر سێ یەك، ئەگەر دوو کوڕ بوون ئەوا سێ یـەکی بـۆ هەیـە رێگـە بـدەن یـان نەیـدەن، ئەگەر سێ کوڕ بوون ئەوا ئەو وەك کوڕی چوارەم بەشی دەدرێتێ‌و بەو جۆرە... ئەگەر سێ کوڕو سـێ
←

پێنجەم: ئەگەر بەشی یەکێك لەمیراتگرەکانی یان هاوشێوەی بەشی یەکێك لەمیراتگرەکانی (بەبێ دیاریکردنی ئەوەی نێر یان مێ بێت) کردە راسپاردن‌و لەپاش خۆی کوڕو کچی بەجێ هێشتبوو، ئەوا بەشێك لەژمارەی ئەوانی بۆ هەیە، ئەگەر سیان بوون ئەوا سێ یەکی لێجێماوەکەی بۆ هەیە، ئەگەر چوار بوون ئەوا چواریەکی بۆ هەیەو بەوجۆرە... [1]، لێرەدا سەیری ئەوە ناکرێت کەهەر میراتگرێك چەندی بەر دەکەوێت، دوای ئەوە ئەوەی مایەوە لەنێوان میراتگرەکاندا بەش دەکرێت.

شەشەم: ئەگەر بەشێك لەماڵەکەی یان پشکێك لێی کردە راسپاردن، ئەوا پشکێك لە بنچینەی بابەتەکەی بۆ هەیە پاش بەرزکردنەوە ئەگەر هاتوو بەرزکراوەبوو، ئەگەر بنچینەکەی لە (٦) بوو، ئەوا راسپاردن بۆکراو شەش یەکی بۆ هەیە ئەگەر راسپاردنکار میراتگری هەبوو، ئەگەر لە (٢٤) بوو ئەوا ١/٢٤ی بۆ هەیە، ئەگەر بەرزکرایەوە بۆ (٢٧) ئەوا ١/٢٧ ی بۆ هەیە[2]، ئەمە ئەگەر میراتگری هەبوو، خۆ ئەگەر میراتگری نەبوو ئەو کاتەی مرد ئەوا بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کەراسپاردن بۆکراو شایستەی شەش یەکی لێجێماوەکەیە، چونکە کەمترین ژمارەیە لەمیراتەکەدا بەخزمایەتی.

---

کچ بوون، ئەو وەك کوڕی چوارەم دەبێت، ئەگەر راسپاردن بۆ کراو کچ بوو ئەوا وەك کچی چوارەم دەبێت.

[1] لەبابەتی راسپاردنکردن بەبەشی میراتگرێك یان هاوشێوەی بەشی میراتگرێکدا یان بەشێکی یان پشکێك یان بەشێك یان وەك بەشی میراتگرێك بەبێ ئەوەی دیاری بکات بۆچوونی فیقهی مالیکیمان وەرگرتووە چونکە تێگەیشتوانەترەو نزیکترە لەدادپەروەری‌و واقیع.

[2] لە (الخرشي) (١٨٧/٨) دا هاتووە: "ئەگەر راسپاردنی کرد بەبەشێك یان بەپشکێك لەمیراتەکەی، نەك لەوەی کە دروستە تێیدا، ئەگەر پشکەکان کورتیان هێنا لەسەر هەندێ لەمیراتگرەکان، ئەگەر بنچینەی بابەتەکە لە نۆ بوو ئەوا بەیەك بەش دەبێت لێی، ئەگەر لە بیست‌و چوار بوو ئەوا بە پشکێکی، ئەگەر بنچینەکەش بیست‌و چوار بوو بەرزکرابوویەوە بۆ بیست‌و حەوت، ئەوا لەبیست‌و حەوتەکە یەك بەشی هەیە، چونکە بەرزکردنەوە لەکۆی راستیەکەیە.

ئەگــەر بــەڵێنی دا بەکەســێك کــە بیکاتــە میراتگــریو هــیچ پەیوەندییــەکی هاوســەرگیریو خزمایــەتی لەنێوانیانــدا نــەبوو، ئــەو بــەڵێن دانــە بــە تاڵ دەکرێتــەوەو دەگۆڕدرێت بۆ راسپاردن بەپێی بنەمای گۆڕانی گرێبەست کە زانایـانی موسـڵمان بـەر لە یاسا بڕیاریان لەسەر داوەو پشکە دیاریکراوەکانی[1] لێ دەردەکرێت بۆ کەسەکانی.

---

[1] لە (الشرح الصغیر) (٤٣٧/٢)دا هاتووە: "ئەگەر خاوەن پشکی دیاریکراوی نەبوو وەك ئەوەی لەبنەڕەتـدا میراتگری نەبێت ئەوا لەهەر شەش پشکێك پشکێکی بۆ هەیە ئەمەش گوتەی ئیبن قاسمە، یـان لەهـەر هەشت پشکێك ئەمەش گوتەی ئەشهەبە، چونکە هەشت لەجێی کەمترین پشـکەکانە کـەخوای گـەورە دیاری کردووە.

## دەروازەی دووەم

# حوكمەكانی راسپاردن بەسوود لێوەرگرتن

## (أحكام الوصية بالمنافع)

سوود لێوەرگرتن لای هەندێك لەزانایان[1] ئەوە دەگرێتەوە كە هاوتای ماڵینەیە (الاعیان) وەك نیشتەجێ بوون لەخانوو یان بەكارهێنانی ئۆتۆمبێلو وەبەرهێنانی زەوی كشتوكاڵیو، لەبری كرێ (بدل ایجار)و هاوشێوەی ئەوانە.

هەروەها مافی سوود لێوەگرتن (حق الارتفاق)یش دەگرێتەوە، بەڵام ئەو ماڵینە(الاعیان) ناگرێتەوە كەبەهۆی شتی ماڵینە (اعیان) دیكەی دێنە بوون، وەك بەروبوومو بەرهەمی ئاژەڵ، لەگەڵ ئەوەشدا راسپاردن بەبەروبوومیان وەك راسپاردن بەسوود لێوەرگرتن داناوە لە حوكمەكاندا، ئەمە ئەگەر هەڵگرتنەكەی لەسەر یەك جۆر بەرهەمی دیاریكراو نەبوو.

لای زۆرینەی زانایانی موسڵمانیش سوود لێوەرگرتن گشتگیرەو ئەوەش دەگرێتەوە كەلەشتەكە بەرهەم دێت، ئیدی سوود لێوەرگرتن بێت وەك نیشتەجێ بوون لەخانوودا یاخود شتێك بێ كەلەشتێكی دیكە هاتبێتە بەرهەم، وەك بەروبوومی رووەكو بەرهەمی زەوی، هەموویان یەك حوكمیان هەیەو بەهۆیەوە دەبنە راسپاردن.

هەندێ لەزانایان[2] نارازی بوون لەراسپاردن بەسوود لێوەرگرتنو چەند بەڵگەیەكیان هێناوەتەوە لەوانە:

---

[1] وەك زانایانی حەنەفی (الزیعلي في تبين الحقائق. ٢٠٢/٦)، (ابن عابدین ٦٠٦/٥).

[2] وەك زانایانی زاهری ، المحلی ٣٢٢/٩ و وەك (أبي لیلی)، بدائع الصنائع ٤٨٨٧/١٠.

أ- سوود لێوەرگرتن لەکاتی مردندا راسپاردنی پێ جێبەجێ ناکرێت، بۆیە دروست نیە راسپاردن بەشتێك کەجێبەجێ نەکرێت بۆ راسپاردن بۆکراو یاخود لەوەی کردویەتیە راسپاردن لەکاتی مردنی راسپاردنکاردا [1].

مەبەست لەوەش کەراسپاردن لەچرکەساتی مردنەوە جێبەجێ دەکرێت ئەوەیە ئەو شتەی سوودی لێوەردەگیرێت هەبێت ئەمە ئەگەر مەرجەکانی تێدا هاتە دی، ئەمەش وێڕای نوێبوونەوە بە نوێبوونەوەی کات بەپێی گومانی ئەوان لەگەڵ ئەوەشدا دروستە ببێتە بابەتی گرێبەست وەك گرێبەستی بەکرێدانو خواستن بەهاودەنگی بۆچوونەکان.

ب- راسپاردنکردن راسپاردنە بەسامانی میراتگر، چونکە جێبەجێکردنی راسپاردن ئەو کاتەیە کەراسپاردنکار مردووەو لەو کاتەشدا شتەکە موڵکی میراتگرەکانەو خاوەندارێتی سوود لێوەرگرتنیش سەر بەخاوەندارێتی خودی شتەکەیە.

ئەم بەڵگەیەش بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە خاوەندارێتی سوود لێوەرگرتن سەربە خاوەندارێتی شتەکە نیە کاتێ بەتەنها بەناو دەکرێت، چونکە راسپاردنکار کاتێ تەنها خودی سوود لێوەرگرتنەکەی کردۆتە راسپاردن ئەوا خودی ئەوەی کردۆتە مەبەست، لەبەر ئەوە بەبەشێك لەشتەکە نامێنێتەوە.

راسپاردنکردن بەسوود لێوەرگرتن لەواتادا خواستنە (الاعارە)یە، چونکە خواستن خاوەندارێتی سوود لێوەرگرتنە بەبێ بەرانبەر، ئەوەشی کراوەتە خوازراو بەمردنی خواستەرەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، لێرەدا مردن کاریگەری هەیە لەسەر بەتاڵ بوونەوەی

---

[1] المحلى ٩/٣٢٢، ولە (المغني (٦/٥٩): "ئەگەر راسپاردنی بە بەرهەمی رووەکێك یان باخێك یان نیشتەجێبوون لەخانوو( غله دار) کرد، دروستە ئیدی ئەگەر بۆ ماوەیەکی زانراو راسپاردنی بەوە کردبوو یان بەهەموو بەرهەمەکەیو سوودلێوەرگرتنی لەهەموو کاتێکدا، ئەمە گووتەی زۆرینەی زانایانە، لەوانە (مالك والثوري والشافعي واسحاق وابو ثور وأصحاب الرأي). ( ابن أبي ليلى)ش دەڵێت: راسپاردن بەسوود لێوەرگرتن دروست نیە چونکە بوونی نیە (معدومة). ئێمە بەدروستی دەزانین چونکە دەکرێت بە گرێبەستی بەبەرامبەر(المعاوضة) ببێتە خاوەنی، هەربۆیە وەك شتی دیار(الأعيان) دروستە."

گرێبەستەکە لەسەر سوودمەند بوون لێی پاش ئەوەی بەدروست دانرا، جا لەبەر ئەوەی رێگرە لەدروستێتی لەپێشترە چونکە رێگری (پاڵنەر) ئاسانترە لەبەرزکردنەوە.

هەروەها ئەمەش بەوە وەڵام دەدرێتەوە کە ئەگەر خاوەندارێتی سوود لێوەرگرتن ئەو کاتەی لەژیاندایە بەگرێبەستی بەکرێدانو خواستن دابنرێت، جالەبەر ئەوەی بەگرێبەستی راسپاردن خاوەنیەتی کە لەپێشترەو فراوانترینی گرێبەستەکانە، لەبەر ئەوە ئەوەی گرێبەستەکانی دیکە نایانگرێتەوە ئەم بیانگرێتەوە لەنەبوونی شوێن و دیارنەبوون ( عدم المحل والجهالە).. [1]

یاسادانەری عێراقیش بۆ چوونی زۆرینەی زانایانی وەرگرتووە لە چەمکی سوود لێوەرگرتنەکانو دەستدانی بۆ ئەوەی ببێتە بابەتی گرێبەست، ئیدی راسپاردن بێت یان کرێ یان خواستن یان دیکە، مادەکانی (٧٢٢-٨٦٣ مەدەنی بەرکار) ئەو حوکمانەی کردووە کەلەسەر سوود لێوەرگرتن هاتوونو، پرۆژە یاسای مەدەنی نوێش سیو نۆ مادەی تەرخان کردووە بۆ خستنە رووی حوکمەکانی گرێبەستەکانی سوود لێوەرگرتن[2]، بەهەمان شێوە پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی.

راسپاردن بە سوود لێوەرگرتن چەندین حوکمی هەیە، هەیانە لەگەڵ حوکمەکانی راسپاردن بەشتی دیار یەکدەگرێتەوە، هەشیانە جیاوازە لێی، گرنگترینیان ئەمانەیە:

---

[1] بۆ زیاتر ئاگادار بوون بڕوانە: بدائع الصنائع ٤٨٨٧/١٠ لاپەڕەکانی دواتر، المبسوط ١٨١/٢٧، كشاف القناع ٥١٩/٢ لاپەڕەکانی دواتر.

[2] مادەکانی ٧٣٠- ٨١٠.

**یەکەم: ڕاسپاردن بەسوود لێوەرگرتن بۆ ماوەیەکی دیاری کراو:**

١- ئەگەر ماوەکەی لە بنەرەتدا دیاری کراو بوو کەی دەست پێدەکاتو کەی تەواو دەبێت، وەك ڕاسپاردن بەنیشتەجێ بوون لەخانوویەکدا بۆماوەی سێ ساڵ، بۆ نمونە لەمانگی شوباتی ساڵی ١٩٩٩ دەست پێدەکات، لەم کاتەدا:

أ. ئەگەر ماوە دیاری کراوەکە پێش مردنی ڕاسپاردنکار تەواو بوو ئەوا ڕاسپاردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوەو وەك ئەوە دادەنرێت کە ڕاسپاردن نەکرابێت.

ب. ئەگەر ماوەیەکی لێ تێپەڕی پاشان ڕاسپاردنکار مرد ئەوا ڕاسپاردن بۆکراو بۆی هەیە ئەو ماوەی کەماوە تا سێ ساڵەکە تەواو بکات لێی سوود مەند ببێت.

ج. ئەگەر پێش هاتنی وادە دیاریکراوەکە ڕاسپاردنکار مرد ئەوا ڕاسپاردن بۆکراو شایستەیە هەموو ماوەکە سوودی لێ وەربگرێت ئەگەر هاتوو پاش مردنی ڕاسپاردنکار ئەم ڕاسپاردنەکەی قبوڵ کرد. [1]

د. لەهەردوو حاڵەتی (ب ، ت) دا کەباسکران ڕاسپاردنەکە ئەگەر ماوەی دیاریکراو بوو ئەوا بەمردنی ڕاسپاردن بۆکراو کۆتایی دێت.

هـ. ئەگەر لەسەرەتای وادەی سوود لێوەرگرتنەکەوە ئەوەی کراوەتە ڕاسپاردن نەبوو، پاش کۆتایهاتنی ماوە دیاریکراوەکە پەیدا بوو ئەوا ڕاسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر پێش کۆتایی وادەکە پەیدا بوو، ئەوەندەی ماوەی ماوە لەکاتی پەیدابوونیەوە شایستەیەتی سوودی لێ ببینێت.

---

[1] لە مادە (٢٢٩)دا هاتووەکە: "دروستە ئەوەی کراوەتە ڕاسپاردن سوود لێ بینین بێت یاخود سوود لێوەرگرتنی خانوبەرە یان ماڵی گوێزراوە بۆ ماوەیەکی دیاری کراو یان دیاری نەکراو".
لە یاداشتی ڕوونکردنەوەی ئەو پرۆژەیە لاپەڕە ١٧٥ ئەم دەقە هاتووە: "مەبەست لە سوود لێبینینو بەکاربردن ئەوەیە کە بەرووبوومو بەکارهێنان و بەکرێدانو بەقەرزدانو نیشتەجێبوونو مافەکانی کەڵك لێوەرگرتن بگرێتەوە

٢- ئەگەر راسپاردن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بوو بەڵام نەدەزانرا کەی دەست پێدەکات، وەك راسپاردنکردن بە سوود بینین لەباخێك بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەبێ ئەوەی سەرەتاکەی دیاری بکات، لەم کاتەدا ماوەکە لەبەرواری مردنی راسپاردنکارەوە دەست پێدەکات، چونکە لەو کاتەدا دەبێتە شایستەی راسپاردنەکە ئەگەر راسپاردنکار شتێکی نەوتبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێتو، هیچ رێگرییەك نەبێت لەبەردەم راسپاردن بۆکراودا کەسوود لەراسپاردنەکە وەربگرێت راستەوخۆ پاش مردنی راسپاردنکار.

شایانی باسە راسپاردن بۆکراو بەنیشتەجێبوون لەخانوویەکدا بۆی نیە بیدات بەکرێ[1]، چونکە کەسیی راسپاردن بۆکراو جێی بایەخە لای راسپاردنکار، لەبەر ئەوە راسپاردن بەشێوەیەکی رەها بەمردنی راسپاردن بۆکراو کۆتایی دێت، ئەگەر هاتوو دەقێك نەبوو لە راسپاردنکارەوە کەپێچەوانەی ئەمە بگەیەنێت. بەڵام ئەگەر راسپاردنی کردبوو سوود لەخانووەکە ببینێت ئایا بۆی هەیە تێیدا نیشتەجێ ببێت؟ بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەیە، بۆچوونی پەسەند وادیارە ئەوەیە کەدروست نیە.

٣- لەحاڵەتی هەبوونی رێگری لە سوود لێبینین:

أ. ئەگەر رێگریەکە لەیەکێك لەمیراتگرەکانەوە بوو لەبری سوود لێبینینەکە قەرەبووی بۆ دابین کردبوو بەجۆرێ کەمیراتگرەکان هەموویان رازی نەبن ماوەیەکی دیکە سوودی لێ ببینێت.

---

[1] ئەگەر راسپاردنی کرد بە سوود بینین لەخانووەکەی بۆ ماوەی یەك ساڵ، ئەگەر خانوەکە لەسێ یەك زیاتر نەبوو یان زیاتر بوو بەڵام میراتگرەکان رێگەیان پێدا کەخانوەکە بدرێتە راسپاردن بۆکراو تێیدا نیشتەجێ بێت ئەو ماوەی کەدیاری کراوە، پاشان دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکان، ئەگەر میراتگرەکان رێگەیان بەزیادەکە نەدا لەو کاتەدا راسپاردن بۆکراو رۆژێك تێیدا نیشتەجێ دەبێتو میراتگرەکان دوو رۆژ تا ماوەی سێ ساڵ، پاشان دەگەڕێندرێتەوە بۆ میراتگرەکان.. بڕوانە:(المیراث والوصیة في الإسلام)ی محمد زکریا البرديسي ص١٢٣.

ب. ئەگـەر ڕێگریەکـە لەهـەموو میراتگرەکانـەوە بـوو، بژاردەیـەك لەبـەردەم ڕاسپاردن بۆکراودا هەیـە یـان ئـەوەتا ماوەیـەکی دیکـە سـوود لەشـتەکە وەربگرێت یاخود لەبری سوود لێبینینەکە قەرەبووی بۆ بکەنەوە.

ج. ئەگـەر ڕێگریەکـە لەلایـەنی ڕاسـپاردنکارەوە بـوو[1]، یـان بـەهۆی هێزێکـی لەرادەبەدەر(قوە قاهرە) بووە ڕێگر لـەنێوان ئـەوەی کراوەتـە ڕاسـپاردن و سوود لێ بینینی[2]، پێویستە ماوەیەکی دیکە لـەپاش نـەمانی ڕێگرەکـەوە سوودی لێ ببینێت.

د. ئەگەر ڕێگرەکە دەرەکی بوو، ئەوا دەستدرێژیکار جێگـرەوەی ئـەو سـوود لێوەرگرتنەی بۆ دابین دەکات بەپێی بنەماکانی قەرەبوو.

هـ. ئەگـەر ڕێگریەکـە لەراسـپاردن بـۆکراوەوە بـوو وەك پشـتگوێ خسـتن و کەمتەرخەمی لەسوود لێبینینی لەو مـاوەی کـەبۆی دیـاری کـراوە، لێـرەدا مافەکەی دەفەوتێت ئەگەر ماوەکە تەواو بوو سوودی لێ نەبینی.

**دووەم: ڕاسپاردن بەسوود لێوەرگرتن کە ماوەکەی دیاری نەکرابێت بۆ کەسێکی دیاری کراو یان کەسانێکی دیاریکراو:**

١. ئەگەر شێوەی دەربڕینی ماوەکـە کـۆ (جمـع) بـوو وەك ئـەوەی بڵێـت کردمـە ڕاسپاردن بۆ فلانە کەس بەنیشتەجێ بوون لەخانووەکەمدا –بۆنمونـە– چـەند

---

[1] هەر هۆکارێك کار یـان هـەڵسو کـەوت کەبـەپێی نـەریت یـان ئامـاژەدان بگەیـەنێت لەراسپاردنەکە، وەك ئەوەی راسپاردن بکات بەنیشتەجێ بوون لەخانووەکەیدا بۆ ماوەی پێنج ساڵ بۆ فـلان کـەس، پاشـان هەستا بەگۆڕانکاریو نوێکاری تێیدا بەجۆرێك کەنەتوانرێت تێیدا نیشـتەجێ بێـت تـا لـەو دەسـتکاریانە دەبێتەوەو پێش کۆتایی هاتنی ئەوەش راسپاردنکار مـرد، ئـەم کـارەی راسـپاردنکار ئـەوە ناگەیـەنێت کەلەراسپاردنەکەی پاشگەز بۆتەوە، حوکمەکە بەهەمان شێوەیە ئەگەر هـاتوو راسـپاردنی بـۆ کەسـێك کرد کەبۆ ماوەی سێ ساڵ لەخانووەکەیدا نیشتەجێ ببێت پاشـان خانوەکـەی بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ دابەکرێ بەکەسێکی تر، پێش کۆتایی هاتنی ئەو بەکرێدانە راسپاردنکار مرد.

[2] وەك ئەوەی لەهەموو ماوەکە یان هەندێکی بڕیاری بەندکردنی درابێت.

مانگێـك، یـان چـەند سـاڵێك، لـەم كاتـەدا ماوەكـە بەكـەمترین مـاوە كـە دەستەواژەی كۆ لەزمانی عەرەبیدا بیگەیەنێت دیاری دەكرێت كە ئەویش سێ یە، هـەر بۆیـە دەسـتەواژەی چـەند مانگێك(شـهور) بەسـێ مـانگ دادەنرێـت، دەستەواژەی چەند ساڵێك (سنوات) بەسێ ساڵ دادەنرێت.

٢. ئەگـەر وتـی راسـپاردن دەكـەم فـلان كـەس تـا لەژیاندایـە لەخانووەكەمـدا نیشتەجێ ببێت، لەپاش مردنی راسپاردنكارەوە راسـپاردن بـۆكراو شایسـتەیە لەخانووەكەیدا نیشتەجێ ببێت تا لەژیاندایە، بەڵام كـە مـرد ناگوێزرێتـەوە بـۆ میراتگرەكانی بەڵكو كۆتایی دێتو سوودەكەی دەگەڕێتەوە بـۆ میراتگرەكـانی راسپاردنكار.

٣. ئەگەر وتی راسپاردن دەكـەم بـۆی كـە نیشـتەجێ ببێـت لـە خانووەكـەم لـەو كاتەوە یاخود راسپاردنەكەی بەرەهایی كرد:

أ. زۆرینـــەی زانایـــان بۆچـــوونیان وایـــە كـــە راســـپاردنەكە دەگوێزرێتـــەوە بـــۆ میراتگرەكـانی راسـپاردن بـۆكراو وەك پێوانـەكردن (قیـاس) بـە سـوود لێوەرگیراوەكان (الاعیان)و، لەبەر نەبەستنەوەی بـەماوەی ژیـانی راسـپاردن بۆكراوەوە[1].

ب. هەندێك لەزانایانیش –لەنێویاندا حەنەفیەكان– وتوویانە: سوود لێبینینەكەی ناگوێزرێتـــەوە بـــۆ میراتگرەكـــانی راســـپاردن بۆكراوەكـــە بـــەڵكو بـــەمردنی راسپاردن بۆكراو كۆتایی دێتو دەگەڕێتەوە بـۆ میراتگرەكـانی راسـپاردنكار،

---

[1] لە (الخرشی) (٨/١٨٨)دا هاتووە: "ئەگەر راسپاردنی كرد بەندەیەك لەبەنـدەكانی خزمـەتی فـلان كـەس بكاتو ماوەكەی دیاری نەكردبوو، لێرەدا تا ماوە لەژیاندا خزمەتی دەكات، ئەگەر راسپاردن بۆكراو مـرد ئەوا میراتگرەكانی لەپاش خۆی دەبنە میراتگری، چونكە راسپاردنكار كەدیاری نـەكردووو رەهـای كـرد مەبەستی ئەوەیە ماوەی تەمەنی بەندەكە خزمەتی بكات (راسپاردنەكە كۆتایی نایەت بەمردنی بەندەكە نەبێت) ئەگەر ماوەكەشی دیاری كرد وەك كرێگرتەیە.

چونکە سوود لێبینراوەکان سامان (مـال) نیـە تـا گوێزرانـەوە بـۆ میراتگـران قبولّ بکات.

ج. ئاراستەی باو لەیاسا دانراوەکاندا کارکردنە بـەم بۆچـوونە، لەوانـە یاسـادانەری یاسای مەدەنی نوێی عێراقی[1] لەسەر ئەو بنەمایـەی کـەدیاریکردنی کەسـی راسپاردن بۆکراو تا سوودی لێوەربگرێت وا لێك دەدرێتـەوە مەبەسـتی ئـەوە بووە کەپاش مردنی نەگوێزرێتەوە بـۆ کەسـی دیکـە بـا ئـەو کەسـەی دیکـە میراتگری راسپاردن بۆکراویش بێت.

**سێیەم: راسپاردنکردن بەسوود لێبینین کە ماوەکەی دیاری نەکرابێت و بۆ کەسانێکی دیارینەکراو یان کەسانێکی مەعنەوی بێت:**

أ. ئەگەر بۆ کۆمەڵە کەسێکی ئـەژمار نـەکراو(غیر محصـورین) بـوو کـەوا گومـان دەکرا کەدابڕێن، ئەوا شایستەی ئەوەن کەکراوەتـە راسـپاردن بۆیـان تـا ئـەو کاتەی کۆتاییان دێـت، وەك ئـەوەی راسـپاردن بکـات بـۆ منالّـەکانی براکـەی و منالّی منالّەکانیان، ئەگەر هەموویان مردن لێرەدا راسـپاردنەکە کۆتـایی دێـت و سوودەکەی دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرانی راسپاردنکار[2].

ب. ئەگەر ژمارەیان دیاری نەکراو بوو بەجۆرێکیش بوو گومان نـەدەکرا کۆتاییـان بێت وەك راسپاردن بۆ هەژاران و نەداران، لێـرەدا راسـپاردنەکە دەکەوێتـە ژێـر حـوکمی وەقفـی خێرخـوازی هەمیشـەیی ئەگـەر هـاتوو بـەهۆی سروشـتی

---

[1] لەمادە (٢٣١) پرۆژە یاساکەدا هاتووە: " مافی سوود لێبینین بریتیە لە مافی خاوەندارێتی سوودی مالّێك کەخاوەندارێتیەکەی کەسێکی دیکەیە بەجۆرێك کە سوود لێوەرگر دەتوانێت ئـەو مالّـە بـەکار بهێنێـت و لێی سوود وەربگرێت".

لـە مـادە (٢٣٢)شـیدا هـاتووە: "بەگرێبەسـت یـاخود راسـپاردن دەبێتـە خـاوەنی سـوودلێبینینی لەگـەلّ رەچاوکردنی رێسا تایبەتەکانی تۆمارکردن".

[2] لەهەندێ لەیاساکاندا راسپاردن بەسوود لێبینین دروست نیە تـەنها بـۆ یـەك چـین نـەبێت و بەنـەمانی ئـەو چینەش شتەکە دەگەڕێتەوە بۆ میراتگرەکانی راسپاردنکارەکە، وەك یاسای تونسی فەصلی (١٨٢).

راسپاردنەکەوە نەچووە چوارچێوەی راسپاردنە جێبەجێ نەکراوەکان لەوەیدا کەزیاتربێت لەسێ یەکی ماڵەکەی بەبێ رێگەدانی میراتگرەکانی، بەم پێیە راسپاردنەکە لەنەوەی کۆتاییهاتووەوە دەگوێزرێتەوە بۆ نەوەی نوێ.

ج. ئەگەر هەمیشەیی بوو بۆ جێگایەك لەجیگا خێرخوازییەکان وەك مزگەوتو قوتابخانەو نەخۆشخانەو لایەنە خێرخوازییەکانی دیکە کەسوودی گشتیان هەیە، لێرەدا راسپاردنەکە حوکمی وەقفی خێرخوازی دەبێتو بەردەوام دەبێت ئەگەرهاتوو جێگاکە دیاری نەکراوبوو وەك بڵێت فلانە مزگەوت یاخود ئەو قوتابخانە، چونکە لەم حاڵەتەدا راسپاردنەکە بەوێران بوونی مزگەوتەکەو تێکچوونیو تێکدرانی قوتابخانەکە یان تایبەتکردنی بۆ شوێنێکی گشتی دیکە جگە لەفێربوون کۆتایی دێت و سوودەکەی بۆ میراتگرەکانی راسپاردنکار دەگەڕێتەوە، پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی بەو درێژییە لەخۆی گرتووە[1].

**چوارەم: راسپاردن بەبەکارهێنان (الغلة) و بەرووبووم:**

١. زۆرینەی زانایانی موسڵمان وتوویانە[2]: جیاوازی نیە لەنێوان واتا (معنى)و مەبەستی (دلالە)ی بەکارهێنان (الغلە)و بەرووبوم (الپمرە)دا، چونکە هەردووکیان لە سوودلێوەرگیراوە ماڵیەکانن‌و حوکمی سوود لێوەرگرتنیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت کەپێشتر باسمان کرد، لەبەر ئەوە راسپاردن بەرەهایی بەو دووانە ئەوە دەگرێتەوە کەلەکاتی مردنی راسپاردنکاردا هەیەو لەگەڵ ئەوەی کەلەداهاتوودا تێیدا روودەدات، یاسا دانەری میسری کاری بەم راشکاوییە کردووەو بڕیاری داوە کەلەکاتی رەهاییدا وادادەنرێت راسپاردن بەو دووانەوە ئەو گۆڕانکاریانەش لەخۆ دەگرێت کە روودەدەن تێیدا ئەگەر هاتوو

---

[1] بڕوانە (المجلة العربية للفقه والقضاء)، العدد الثاني السنة الثانية، ص١٧٥ المواد (٢٢٩– ٢٣١).
[2] لەوانە: مالیکیەکان‌و شافیعیەکان‌و حەنبەلیەکان‌و .... هی دیکەش.

(قرینه)یەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێت[1].

لە راپۆرتی روونکردنەوەی پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی ئەوە دەخوێندرێتەوە کە ئەوە تێروانینی پرۆژەکەیە، بەم پێیە ئەگەر ئەو ماڵەی سوود لێبینینەکەی کراوەتە راسپاردن دەکرێت سوودی لێببینرێت یان بەکاربهێنرێت بەشێوەیەکی دیکە جیاواز لەوەی کە بۆی کراوەتە راسپاردن، بۆ راسپاردن بۆکراو دروستە کەبەو جۆرە سوودی لێببینێت یان بەکاری بێنێت کە دەیەوێت بەو مەرجەی زیان بەماڵەکە نەگەیەنێت، چونکە بەکارهێنان (استغلال) جۆرێکە لەجۆرەکانی سوود لێبینین (الانتفاع)، ئەمە ئەگەر هاتوو بەڵگەنامەی راسپاردنەکە (حجه الوصیه) پێچەوانەی ئەوە نەبوو، هەر ئەمەشە کەپرۆژە یاسای مەدەنی نوێی عێراق[2] و پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی[3] بڕیاریان لەسەر داوە، پێش ئەوانیش یاسای میسری[1] و

---

[1] مادە (٥٥) ی یاسای راسپاردنی میسری: " ئەگەر راسپاردن بە سوودلێبینین یان بەرووبووم بوو ئەوا سوودلێبینین یان ئەو بەرووبوومەی هەیەتی لەکاتی مردنی راسپاردنکارداو ئەوەی دواتر پەیدا دەبێت بۆ راسپاردن بۆکراوە ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێت".

یاسای باری کەسیی سوریش تەنها ناوی بەرووبوومی هێناوە لەمادە (١٤٩)داو دەڵێت: " ئەگەر راسپاردنەکە بەبەرووبووم بێت، ئەوا راسپاردن بۆکراو ئەو بەرووبوومەی کەهەیە لەکاتی مردنی راسپاردنکارداو ئەوەی دواتر دێتە بەرهەم ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بگەیەنێت".

[2] مادة (٢٣٢): " مافی سوودلێوەرگرتن بەگرێبەستو راسپاردن بەدەست دێنێت".

مادە (٢٣٣): " بۆ سوودلێوەرگر هەیە هەڵسوکەوت بەمافەکەیەوە بکات بەقەرەبوو یان بەخشین (تبرع)، ئەگەر لەقەواڵەکە (سند) بۆ ئەو مافە کرابوویەتیەوە پێچەوانەی ئەوە نەگەیەنێت".

[3] مادە (٢٣١): " بۆ راسپاردن بۆکراو بەسوودلێبینینی ماڵێکی دیاریکراو هەیە کەبەکاری بێنێت یان بەرهەمی بێنێت (استغلال) بابەپێچەوانەی ئەو حاڵەتەشەوە بێت کەلەراسپاردنەکەدا هاتووە بەمەرجێك زیان بەماڵەکە نەگەیەنێت".

لەراپۆرتی روونکردنەوەش (ل١٧٦) هاتووە: " بەڵام مادە (٢٣١) هاتووە بۆ روونکردنەوەی ئەوەی کە راسپاردن بۆکراو بەسوودلێبینین لەماڵێکی دیاریکراو مافی خۆیەتی ئەو ماڵە بەکاربێنێتو بەکرێی بدات بەمەرجێك زیان بەو ماڵە نەگەیەنێت، مەرجێکی دیکەش هەیە جگە لەم مەرجە کەئەویش زیان نەگەیاندنە بەمیراتگرەکانی، چونکە زیان بەدەق راگیراوە ((لا ضرر ولا ضرار))" .

←

سوری [٢] ئەوەیان کردووە.

٢. هەندێك لەزانایان جیاوازیان کردووە لەنێوان راسپاردن بە سوودلێبینین‌و راسپاردن بە بەروبووم لەهەندێ حوکمدا، لەوانە راسپاردن بەبەروبووم ئەوە ناگرێتەوە کەلەداهاتوودا دێتە بەرهەم مەگەر بەتایبەت ئەوەی وتبێت، وەك ئەوەی بڵێت بەروبوومی باخەکەم بۆ هەمیشە کردە راسپاردن بۆ فلان کەس، بەڵام راسپاردن بە سوودلێبینینی باخ ئەوا ئەو بەروبومەی هەیەو بەروبووم داهاتووش دەگرێتەوە.

بناغەی ئەو جیاوازیکردنەش نەریتە چونکە بەروبووم بەپێی نەریت باوە بۆ هەبوو، ئەوەی کەنەبێت لەو کاتەدا نایگرێتەوەك مەگەر بەتایبەت بیلێتك بەڵام بەکارهێنانی ئەوەی کە هەیەو ئەوەشی کەدواتر پەیدا دەبێت دەگرێتەوە، بەم پێیەش حوکمەکە دەکەوێتە ژێر باری نەریتی باو [٣].

**پێنجەم: چۆنیەتی سوود وەرگرتن لەو سوودەی کراوەتە راسپاردن:**

١. سوود وەردەگیرێت لە بەشی سوودەکە (الغلە) یان بەروبوومەکەی لەنێوان راسپاردن بۆکراوو میراتگرانی راسپاردنکاردا بەهەمان رێژەی کە بۆ هەریەکەیان هەیە، ئەگەر ماڵەکە خانوو بوو راسپاردنەکەش بەسوودوەگرتن لەنیوەی بوو، بۆ راسپاردن بۆکراو هەیە لەنیوەیدا نیشتەجێ ببێت‌و میراتگرەکانیش لەنیوەکەی دیکەدا نیشتەجێ ببن‌و ئەو ماوەیە سوودی لێوەربگرن، پاشان ئەوەی کەبەدەست هەریەکەیانەوە بووە لەگەڵ ئەوەی دیکەیان بیگۆڕنەوە تا

وایدەبینم مەرجی یەکەم پێویست بەمەرجی دووەم ناکات وەك ئەوەی مەرجی دووەم نەبوونی دەقێکە لەراسپاردنکارەوە کەپێچەوانەی ئەوە بێت هەروەك باسمان کرد.

[١] مادە (٥٤) یاسای راسپاردن.

[٢] مادە (٢٤٨) باری کەسیی.

[٣] بۆ زیاتر ئاگاداربوون بڕوانە: بدائع الصنائع للكاساني ٤٨٩١/١٠.

لەهەموو رووبەکەوە یەکسانی لەسوود وەگرتنیدا لەنێوانیاندا بێتە دی.

٢. ئەگەر ماڵەکە زەوی کشتوکاڵی بوو رووبەرەکەی لەرووی باشێتیو نرخو لەباری بۆ کشتوکاڵ وەك یەك بوو ئەوا لەنێوان راسپاردن بۆکراوو میراتگراندا دابەش دەکرێت بەپێی ئەوەی بۆ هەریەکەیان دیاری کراوە.

٣. ئەگەر ماڵەکە دابەش نەدەکرا وەك ئۆتۆمبێلو وڵاخ، راسپاردن بۆکراو بۆی نیە داوای دابەشکردنی بکات، بەهەمان شێوە ئەگەر دابەش دەبوو بەڵام بەشکردنەکەی زیانی دەگەیاند بەمیراتگرەکان، وەك ئەوەی ماڵەکە خانوو بێت دەتوانرێت بەش بکرێت بەجیاکردنەوەی هەریەشێك لەوی دیکە، بەجۆرێك کە دروستکردنی دیوارێك لەنێوان بەشی راسپاردن بۆکراوو بەشی میراتگرەکاندا پێویست بوو، لەمەدا زیان بەمیراتگرەکان دەگات بەوەی تێچوونی دروستکردنی دیوارەکە لەکاتی دابەشکردنەکەدا بکەوێتە ئەستۆیان، هەروەها تێچووی رووخاندنی ئەو دیوارە پاش کۆتاییهاتنی ماوەی سوودلێوەرگرتنەکە، لەبەر ئەوە بۆ راسپاردن بۆکراو نیە لەسەر داوای دابەشکردنەکەی سووربێت لەکاتێکدا ئەوا رازی نەبن، بەڵکو بەپێی کاتو شوێن بەنۆرە سوودی لێوەردەگرن.

بۆ دادوەریش هەیە لەکاتی هەبوونی ناکۆکی لەسەر ئەو شێوازانەی لەو سێ برگەیەی باسکرا یەکێکیان دیاری بکات.

٤. ئەگەر سوودی لێوەرگرتنی راسپاردنەکە بۆ کەسێك بوو خودی ماڵەکەش (رقبە) کە بۆ کەسێکی دیکە بوو، لەم حاڵەتەدا ئەوەی وەك باج دەخرێتە سەر ماڵەکەو ئەوەی پێویستە بۆ سوودلێوەرگرتنەکەی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوەیان کەراسپاردنی بۆکراوە بەسوودلێوەرگرتن.

**شەشەم: مەزەندەکردنی ئەو سوودلێوەرگرتنەی کراوەتە راسپاردن:**

زانایینی شەریعەت بۆچوونیان جیاوازە لەمەزەندەکردنی ئەو سوودەی کراوەتە راسپاردن بەپێی جیاوازی بۆچوونیان لە سودەکە ماڵە یان نا و، جیاوازی بەهای ئەو سوودەی کراوەتە راسپاردن بەهەمیشەیی و کاتی:

١. حەنەفیەکان بۆ ئەوە چوون کەمەزەندەی سوودلێوەرگرتن بەپێی مەزەندەی ئەو ماڵە دەکرێت کەسوودلێوەرگرتنەکەی کراوەتە راسپاردن، ئەگەر ئەو ماڵە زیاتر نەبوو لەسێ یەکی میراتیەکە، ئەوا راسپاردنەکە بەبێ راوەستان لەسەر رێگەپێدانی میراتگرەکان جێبەجێ دەکرێت، ئەگەر زیاتر بوو ئەوا جێبەجێکردنی زیادەکە لەسەر رەزامەندیان رادەوەستێت، ئیدی سوودلێوەرگرتنەکە هەمیشەیی بوو یان کاتی، چونکە راسپاردن بەسوودلێوەرگرتن بەپێی بۆچوونی ئەوان واتە ماڵەکە بەدرێژایی ماوەی سوود لێوەرگرتنەکە لەدەستی میراتگرەکاندا نەبێت، بەمەش لەوماوەیەدا لەسوودەکانی بێبەش دەبن[1].

٢. حەنبەلیەکان و شافیعیەکان هاودەنگن لەگەڵ حەنەفیەکاندا لەوەدا ئەگەر هاتوو ئەو سوودلێوەرگرتنەی کراوەتە راسپاردن هەمیشەیی یان رەها بوو، بەڵام ئەگەر دیاریکراو بوو بە ماوەیەکی زانراو ئەوا مەزەندەکردنەکەی تەنها سوودلێوەرگرتنەکە دەبێت، لەو ماوەیەشدا ماڵەکە ئەو سوودەی دەبەخشێت پاشان خۆی دەمێنێتەوە بەدەر لەسوودلێوەرگرتنەکەی، جیاوازیەکە لەنێوان بەهای سوودلێوەرگرتنەکەو بڕی راسپاردنەکەدا دەبێت[2]، بەڵام شافیعیەکان

---

١ بدائع الصنائع ٤٨٨٨/١٠ و لاپەڕەکانی دواتر.

٢ لەم حاڵەتەشدا یان ئەوەتا ئەو ماڵەی کراوەتە راسپاردن لەنێوانیاندا سوودی لێوەربگرن لەنێوانیاندا دابەش بکرێت هەریەکەیان بەپێی ئەوەی بۆی هەیە، یان ئەوەتا ئەو ماڵەی سوودلێبینینەکەی کراوەتە راسپاردن بەش بکرێت لەنێوانیاندا بەنۆبەت بەپێی کات یان جێگا، یان ئەو ماڵەی سوودلێوەرگرتنەکەی کراوەتە راسپاردن ئەگەر هاتوو دەکرا بەش بکرێت بەجۆرێك کەزیان بەماڵەکە نەگات، لەکاتی ناکۆکیدا دادوەر یەکێك لەو رێگایانە دیاری دەکات.

بۆچـوونیان جیـاوازە لەگـەڵ حەنبەلەیـەکان لـەوەی ئەگـەر ئـەوەی کراوەتـە راسپاردن هەندێ لەسوودەکانی ماڵەکە بوو لەو کاتەدا جیاوازیەکـە لـەنێوان ئـەو هەندە سوودەو ئەو ماڵەدا بەهای سوودلێبینینەکەیە کەکراوەتە راسپاردن ئیدی راسپاردنەکە هەمیشەیی بێت یان رەهـا یـان دیـاریکراو بەماوەیـەکی زانـراو یـان نەزانراو.

پرۆژە یاسای باری کەسـیی عـەرەبی یـەکگرتوو هـەمان ئاراسـتەی حەنەفیـەکانی وەرگرتووە لەمادە (٢٣٠)دا کە ئەمە دەقەکەیەتی:"

أ. ئەگەر بەهای ئەو ماڵە دیاریکراوەی کراوەتە راسـپاردن سـوودی لێوەربگیرێـت یان بـەکاربهێنرێت کـەمتر بـوو لەسـێ یـەکی میراتیەکـە، بـەپێی راسـپاردنەکە ماڵەکە دەدرێتە دەست راسپاردنبۆکراو بەمەبەستی سوودلێوەرگرتنی.

ب. ئەگەر بەهای ئەو ماڵە دیاریکراوەی کراوەتە راسـپاردن سـوودی لێوەربگیرێـت یان بەکاربهێنرێت زیاتر بوو لەسـێ یـەکی میراتیەکـە، میراتگرەکـان سەرپشـك دەکرێن لەنێوان رێگەپێدانی یان پێدانی شتێك کەهاوتای سێ یەکی میراتیەکـە بێت".

**حەوتەم: مافی راسپاردن بەسوود لێوەرگرتن لەم حاڵەتانەدا دەفەوتێت:**

١. راسـپاردن بـۆکرا ببێتـە خـاوەنی ئـەوەی راسـپاردنکراوە بـۆی کەسـوودی لێوەربگرێت.

٢. دەست هەڵگرتنی لەو مافەی بۆ میراتگرەکانی راسپاردنکار ئیدی بەبەرانبەر بێت یان بێ بەرانبەر.

٣. بـەمردنی راسـپاردن بـۆکراو پـێش تـەواوبوونی هـەموو سـوودلێوەرگرتنەکەیان هەندێکی.

## دەروازەی سێیەم

# کەلەکەبوونی ڕاسپاردنەکان
## (تزاحم الوصايا)

پێشتر ئەوەمان ڕوون کردەوە کە ڕاسپاردن بەسێ یەکی ماڵو ئەوەشی زیاد بێت دەبێت، بەڵام زیادەکە بەبێ ڕێگەدانی میراتگرەکان جێبەجێ ناکرێت، ئەگەر میراتگرێکی تایبەت نەبوو یان هەبوو وە ڕێگەیاندا بەهەموو ڕاسپاردنەکە، ئەوا لەهەموو ماڵەکەدا جێبەجێ دەکرێت، بەم پێیە ڕاسپاردنەکان کەڵەکە نابن مەگەر زۆر بنو سامانەکە بەشی جێبەجێکردنی هەموویان نەکات ئیدی ئەو سامانەی بۆ جێبەجێکردنی تەرخان کراوە سێ یەك بێت یان زیاتر پاش ڕێگەدانی میراتگرەکان.

لەحاڵەتی هەبوونی کەڵەکەبوون، ئەم بنەماو حوکمانە ڕەچاو دەکرێت:

١. ئەگەر لەنێو ڕاسپاردنەکاندا ڕاسپاردنێکی پێویست (الوصيه الواجبه) هەبوو بەپێی برگەی دووی مادده (٧٤)ی یاسای باری کەسیی هەموارکراو کەدەڵێت:" ڕاسپاردنی پێویست بەپێی برگە (١)ی ئەم مادەیە دەخرێتە پێش ڕاسپاردنەکانی دیکەوە لەپێدانی لەسێ یەکی میراتیەکە، ئەگەر پاش جێبەجێکردنی ڕاسپاردنە پێویستەکە هیچ نەمایەوە، ئەوا ڕاسپاردنە ئارەزومەندانەکانی دیکە بەتاڵ دەکرێنەوە، ئەگەر شتێك مایەوە ئەوا ئەوەی ماوەتەوە بۆ ڕاسپاردنەکانی دیکە خەرج دەکرێت".

٢. ئەگەر ڕاسپاردنی پێویستیان لەنێودا نەبوو بەپێی هەمان یاسای کەباسکرا، بەڵام بەخشینی کاتی نەخۆشی سەرەمەرگ هەبوو کەهەمان حوکمەکانی ڕاسپاردنی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، ئەو بەخشینانە دەخرێتە پێش ڕاسپاردنە ئارەزومەندانەکانی دواخراو بۆ پاش مردن، چونکە با حوکمەکانی

راسپاردنی بەسەردا جێبەجێ بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێ حوکمدا جیاوازە لێی هەروەك لەپێشەکیەکەدا باسمان کرد، لەو حوکمانەش ئەو بەخشینانە هەڵس و کەوتێکن لەگەڵ دەرچوونیان و قبوڵکردنیانەوە لەلایەن پێ بەخشراوەوە خەسڵەتی پێویستبوونیان وەرگرتووە، بەپێچەوانەی راسپاردنەوە کەبریتیە لە هەڵس وکەوتێکی دواخراو بۆ پاش مردن، لەبەر ئەوە هەڵس وکەوتێکی نا پابەندە پاش مردنی راسپاردنکار دەبێتە پابەند.

بەم پێیە ئەگەر کەڵکەبوون دروست بوو لەنێوان ئەم بەخشینانەو راسپاردنەکانی دیکەدا، بەخشینەکان پێش دەخرێن، ئەگەر هیچ نەمایەوە ئەوا راسپاردنەکان بەتاڵ دەبنەوە، ئەگەر مایەوە ئەوا ئەوەی ماوەتەوە بەپێی توانا بۆ جێبەجێکردنی خەرج دەکرێت.

٣. ئەگەر لەنێو راسپاردنەکاندا حەقێکی خوا هەبوو کە لەسەر شانی واجب بووە، راسپاردنکار راسپاردنی کرد کەپاش مردنی جێبەجێ بکرێت وەك زەکات کەلەماڵەکەیدا پێویست بووبێت و خۆی نەیدابێت بەوانەی شایستەینی، لەم کاتەدا ئەم واجبە دەخرێتە پێش راسپاردن ئارەزومەندانەکانی دیکەوە.

٤. ئەگەر هەموو راسپاردنەکان لەیەك نزیکەکان بوو کە لەیەك پلەدان، وەك ئەوەی هەموویان پێویست بن، یان هەموویان موستەحەب بن، لێرەدا بەوەیان دەست پێدەکرێت کە راسپاردنکار پێی دەستی پێکردووە، چونکە دەستپێکردن بەوەیان بەڵگەیە کەلەوانەی دیکە گرنگترە، ئەگەر ریزبەندی نەکردبوون و یەکسان نەبوون لەپلەدا، ئەوا بەبەهێزترین دەست پێدەکات پاشان بەهێزترو بەو جۆرە.

٥. ئەگەر هەموو راسپاردنەکان بۆ پاش مردن دواخرابوون و هیچ واجبێکی خوای گەورە یان بۆ مرۆڤیان تێدا نەبوو، بەڵکو هەموویان ئارەزومەندانە (اختیاری) بوون و زیاتربوون لەسێ یەك، میراتگرەکان رێگەبدەن بەزیادەکە یاخود نەیدەن، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا بەشی هەموو راسپاردنەکانی نەدەکرد، ئەوا

راسپاردنکراوەکە بەپێی رادە لەنێوان راسپاردنەکاندا دابەش دەکرێت واتە هەریەکەو بەپێی ئەو رادەی پشکەی بۆی دانراوە لەسەر شێوازی دابەشکردنی گونجاو هەتا کورت هێنانەکە هەمووان بگرێتەوە بەشێوەیەکی یەکسان بەپێی رادەی پشکەکانیان.

**جێبەجێکردنەکان:**

١- راسپاردنی کرد سێ یەکی ماڵەکەی بۆ راسپاردن بۆکراوی (أ)، بۆ راسپاردن بۆکراوی (ب)چواریەکی ماڵەکەی، میراتگرەکان رێگەیان بەزیادەکە نەدا، بەهای سێ یەکەکە دەیکردە (٢١) هەزار دینار.

برە پارەکە بەم شێوەیە بەسەریاندا دابەش دەکرێت:

پشکە شایستەبووەکان = (١/٣+ ١/٤)= (٤+٣/١٢)= (٧/١٢).

بەشی (أ)= ٧/(٢١×٤)= ١٢ هەزار دینار.

بەشی (ب)= ٧/(٢١×٣)= (٩) هەزار دینار.

٢- راسپاردنی کرد سێ یەکی ماڵەکەی بۆ راسپاردن بۆکراوی (أ)، بۆ راسپاردن بۆکراوی (ب)چواریەکی ماڵەکەی، بۆ راسپاردن بۆکراوی (ج)شەش یەکی ماڵەکەی، ئەو برەی رێگەدرابوو بۆ جێبەجێکردنی راسپاردنەکەی (٢٧) هەزار دینار بوو.

پشکە شایستەبووەکان = (١/٣+ ١/٤+ ١/٦)= (٤+٣+٢)/١٢= (٩/١٢)

بەشی (أ)= ٩/(٢٧×٤)= (١٢) هەزار دینار.

بەشی (ب)= ٩/(٢٧×٣)= (٩) هەزار دینار.

بەشی (ج)= ٩/(٢٧×٢)= (٦) هەزار دینار.

# دەروازەی چوارەم

## راسپاردنی پێویست

## (الوصية الواجبة)

راسپاردنی پێویست لەزاراوەناسی زۆرینەی زانایانی شەریعەتدا واتە: راسپاردنی کەسێك بەدانەوەی ئەوەی لەسەریەتی لەحەقی خوای گەورە یاخود مرۆڤێك لە لێجێماوەکەی پاش مردنی، لەکاتێکدا بەڵگەیەك نەبێت بیسەلمێنێت کە ئەم مافەی لەئەستۆدایە [1].

لەزاراوەناسی هەندێك لەزانایانیشدا بریتیە لە: راسپاردن بۆ دایكو باوكو ئەو نزیکانەی کەبەهۆی رێگریەکەوە یان بەشبڕانەوە (حجب) میراتیان بەر ناکەوێت[2].

لەزاراوەناسی یاساشدا بریتیە لە: گریمانەکردنی راسپاردنی باپیرە یان داپیرە بۆ نەوە بەرادەی پشکی باوکیان یان دایکیان ئەگەر باوك یان دایك پێش مردنی باپیرە یاخود داپیرە یان لەگەڵیاندا پێکەوە مرد بەمەرجێك ئەو پشکە زیاتر نەبێت لەسێ یەکی لێجێماوەکە.

راسپاردن بەو واتایەی کۆتایی یاسا وا مەزەندە دەکات کەماونو لەسەر دادوەر پێویستە حوکم بکات بەجێبەجێکردنی، ئیدی مردووەکە راسپاردنی کردبێت یاخود نەیکردبێت، ئەم راسپاردنە بابەتی باسەکەمانە.

---

[1] لە (التاج المنهب) (٣٦٠/٤)دا هاتووە: "راسپاردنو شایەتی پێویستە لەسەر ئەو کەسەی ماڵی هەیەو مافی مرۆڤێکی دیکەی لەسەرەو بەو شێوەیە، یاخود حەقی خوای گەورە، وەك کەفارەتەکانو شتەکانی هاوشێوەی، بەمەبەستی دەربازکردنی لەوە".

[2] لە (المحلی) (٣١٢/٩) دا هاتووە: "راسپاردن فەرزە لەسەر هەموو کەسێك کەسامانێك لەپاش خۆی بەجێ بێڵێتو فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێك بۆ ئەو خزمانەی کەمیراتیان بەر ناکەوێت، ئەگەر وەهاشی نەکرد هەر پێیان دەدرێت".

پێشتر لەپێشەکی ئەم کتێبەدا ئەوەمان خستە روو کە: زۆرینەی زانایانی شەریعەت گووتوویانە: پێویست نیە راسپاردن بۆ کەس ئیدی نزیك بێت یان دوور، ئەگەر هاتوو مافێکی نەبوو لەسەر راسپاردنکار کەبەڵگەی روونی لەسەر بێت، یاخود ئەمانەتێکی لای بوو بەڵام هیچ شایەتێکی نەبوو، لەوکاتەدا پێویستە راسپاردن بکات بەدانەوەی ئەوە نەبادا پاش مردنی ئەو حەقە بفەوتێت.

هەروەها ئەوەمان روونکردەوە کە وتوویانە راسپاردنی پێویست بەپێی ئەم فەرمایشتەی خوای گەورەیە: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[1] ، بەپێی ئایەتەکانی حوکمەکانی میراتی ئەوە لابرا یان تایبەت کرا بەدایكو باوكو خزمان، ئیدی میراتگر بن یان نا، بەڵام بەباش زانین (الاستحباب) جێگەی ئەو پێویست بوون (وجوب)ەی گرتەوە بۆیان ئەگەر هاتوو میراتگر نەبوون.

بەڵام ژمارەیەکیان کە کەم نین لەخاوەن بیروڕاو ئیجتیهادو مەزهەبەکان گووتوویانە کە: ئەو پێویست بوونە (وجوب)ەی لەو ئایەتەی خستمانە روو چەسپاوە هێشتا لەسەر ئەسڵەکەی خۆی ماوە سەبارەت بەدایكو باوكو ئەو خزمانەی میراتییان بەرناکەوێت، هەر بۆیە نەسڕاوەتەوە نە تایبەت کراوە، چونکە هۆکارای پێویستبوون بریتیە لە شوێنی میراتگرەکە لەو حاڵەتەی کەبەهۆی رێگریەکەوە یاخود بەشبڕیەوە میراتی پێ نادرێتو پێویستبوونەکە لەئارادایەو حوکم لەگەڵ هۆکارەکەیدا دەسورێتەوە بەهەبوونو بەنەبوونی.

ئەم گوتەیەش لەزۆرێك لەشوێنکەوتووان لەوانە (سەعیدی کوڕی موسەیەب، مەسروق، تاوس، قەتادە،ئیاس، حەسنی بەصریو، لەهەندێ لە پێشەوایانی تەفسیرو فەرموودە گێڕدراوەتەوە، هەندێك لە پێشەوایانی مەزهەبەکانیش کاریان پێ

---

[1] سورەتی بقرە: ١٨٠.

کردووه، لەوانە ئیسحاقی کوڕی راهەوەیو، داودی زاهریو، ئیبن جەریری تەبەریو، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەگێڕانەوەیەکدا لێی و، ئیبن حەزمی زاهری[1].

بەڵام ئەو زانایانەی کە راسپاردنی پێویستیان باس کردووە ناکۆکن لەسەر ئەوەی کەبەهۆی وازهێنان لەم پێویستبوونە (واجب)ە دێتە ئارا، بەم شێوەیە:

أ- هەیانە وتوویەتی: ئەگەر مردووەکە پێش مردنی راسپاردنی نەکرد، واگریمانە ناکرێت راسپاردن هەبێت، هەموو ئەوەی کەهەیە بریتیە لە دانانی مردووەکە بەگوناهبار لەبەردەم خوای گەورەدا بەهۆی وازهێنانی لەئەرکێکی ئاینی سەرشانی کەشایانی سزادانە لەسەری، جا ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بوو سزای دەدات یاخود ویستی لەسەر بوو لێی خۆش دەبێت.

بەپێی ئەم ئاراستەیە بۆ دادوەر نیە جێگەی مردووەکە بگرێتەوەو وا دادوەریەکەی بریار لێ بدات کە راسپاردنێك بۆ دایكو باوكو خزمان هەیەو جێبەجێی بکات.

ب- زانایانێکی دیکە بۆ ئەوە چوون کە لەسەر دادوەرە لەبری مردووەکە حوکم بەجێبەجێی کردنی بەراسپاردن لەسنووری سێ یەکی میراتیەکەدا بکات بۆ دایكو باوكو خزمان کەمیراتیان ناکەوێت، ئیدی ئەو میراتی بەرنەکەوتنە بەهۆی رێگریەکەوە بێت لەرێگریەکانی میراتی وەك جیاوازی ئاین بەهەموو لایەك، یاخود بەهۆی بەشبڕکران (حاجب) لەمیرات لەبەر هەبوونی میراتگرێکی بەهێزترلەرووی خزمایەتیەوە بەشبڕاو کراین ئەمە سەبارەت بەخزمان، چونکە چاوەڕوان نەکراوە کە دایكو باوك بەمیراتگرێکی بەهێزتر لەمیراتی بەشبڕاو بکرێن چونکە ئەوان لەریزی یەکەمو پلەی یەکەمن لەخزمایەتیدا.

ئەم قسەیەیان لەو رووەوەیە کە ئەم پێویست بوو(واجب) ە بەئایەتی قورئانی پیرۆز پێویست کراوە، مردووەکە کەپێی هەڵنەستاوە ستەمی کردووە لە ئاست دایكو باوكو ئەو خزمانەی کەمیراتیان ناکەوێت، هەڵگرتنی ستەمیش لەئەرکەکانی سەر

---

[1] (الموجز في شرح قانون الوصية)ی محمد الحسيني حنفي ص٣٧٣.

دادگایە ئەمەش بەگریمانەکردنی راسپاردن دەبێت با بەراستیش لەلایەن مردووەکەوە نەکرابێت، مەزهەبی ئیبن حەزمی زاهری (خوا لێی خۆش ببێت) لەسەر ئەم بۆچوونە دەڕوات.

لە راستیشدا بۆچوونی ئەم زانا مەزنە تێگەیشتوانەترین‌و نزیکترینە لە رۆحی شەریعەتی ئیسلام، رووکاری ئەم ئایەتەی خوای گەورەش بەڵگەیە لەسەر ئەمە: ﴿وَأُوْلُواْ الأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللّهِ إِنَّ اللّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ﴾ [1]، هەروەها ئەم ئایەتەش کەخوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفاً أَوْ إِثْماً فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلاَ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾[2]، کە لەرووکاردا بەڵگەیە لەسەر پێویستی گۆڕانی راسپاردن لەلایەن دادوەرەوە ئەگەر هاتوو وازهێنان لەمافی کەسێك یاخود ستەم یان ئارەزووی بۆ شتێك تێدا بوو.

پاشان ئەو پێویستبوونە بۆ حسابی دایك‌و باوك‌و خزمان بێت بەم ئایەتەی قورئانی پیرۆز: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقّاً عَلَى الْمُتَّقِينَ﴾[3]،بەم جۆرە راسپاردن بۆیان بۆتە مافێکی چەسپاو بەئیرادەی خوای گەورە، بەهەمان شێوەی میراتی کە میرات لێگراوو میراتگر هیچ ئیرادەیەکیان نیە تێیدا.

پێش میرات راسپاردن جێگەی میراتی دەگرتەوەو لەئێستاشدا هەمان جێگای دەمێنێت کاتێ بەهۆی رێگر یان بەشبڕانەوە میراتی نەکەوێت، ئەگەر دایك‌و باوك‌و خزمان لەمیراتگران بوون کەبەشیان دەکەوت ئەوا راسپاردن هیچ جێگایەکی بۆ نیە، ئەگەر بۆشاییەك هەبوو لەوێدا راسپاردن بۆشاییەکە پڕی دەکاتەوە.

---

[1] الأنفال : ٧٥

[2] البقرة : ١٨٢

[3] البقرة: ١٨٠

دادگـای عێـراقیش پـێش هـەمواری ژمـارە (٧٢)ی سـاڵی ١٩٧٩ی یاسـای بـاری کەسیی بەرکار کاری بەبۆچوونی زانایانی شەریعەت دەکرد، بەتایبەت مەزهـەبی ئـەبو حەنیفە (خوا لێی خۆش ببێت) لەفیقهی سونیداو مەزهەبی پێشەوا جەعفـەری کـوڕی صادق (خوا لێی خۆش ببێت) لەمەزهەبی جەعفەریدا، دادگا بەو پێیە بڕیاری دەدا بـە بێ بەشکردنی ئەو نەوانەی کەباوکیان لەکاتێکدا دەمرێـت کـە بـاوکو دایکـی باوکیـان لەگەڵیاندایـە یـان پێکـەوە لەگـەڵ ئەوانـدا لەیـەك رووداودا دەمرێـت، هـەروەك لەرووداوەکانی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەو پێکدادانی ئۆتۆمبێلو نغرۆبـوونی کەشـتیو رووداوی ئاگرکەوتنەوەو لافاوو... رووداوی دیکەی لەو جۆرانە، لەگەڵ ئـەوەی بـاوکی ئـەو نەوانـە لەوانەیـە لـەو کەسـانە بێـت کـە رۆڵـی هـەبووە لـەپێکهێنانی لێجێمـاوی مردووەکـەدا (بـاپیرە یـان داپـیرەی نـەوەکان)، هـەروەها دەکرێـت لەوانـە بـن کـە مردووەکە هەڵدەستا بەبەخێوکردنو دابینکردنی بژێویان.

سەرەڕای هەموو ئەوانە هەموارکردنی دووەمی[1] یاسای باری کەسیی بەرکار کچی مردووەکەی وەك کوڕی داناوە لەمیراتیداو لـەهێزی بەشـبڕکردن (حجـب)دا لەحاڵـەتی نەبوونی کوڕ لەنێو میراتگرەکاندا، ئەمەش بووە مایەی بێ بەشـبوونی نـەوەکان کـوڕ بن یان کچ لەمیراتی باپیرە یان داپیرەکەیان کـاتێ کـە مردووەکـە کچێك یـان چـەند کچێکی هەبێت، ئەمە لەکاتێکدا ئەو نەوانە ئەوەی لەبەشی کچەکان دەمایـەوە پـێش ئەو هەموارە بە هاودەنگی هەموو زانایانی شەریعەت جگە لەمەزهەبی ئیمامی بـەریان دەکەوت، لەبەر ئەوە یاسادانەری عێراقی دەستپێشخەری کرد بۆ هەمواری سێیەم کە بڕیاری راسپاردنی پێویستی بۆیەکەمجار لەیاسا عێراقیەکاندا هێنـا، لەمەشـدا یاسـای هەنـدێ لەوڵاتـە عەرەبیـەکان پێشـتر ئەمـەیان کردبـوو، لەوانـە: یاسـای راسـپاردنی

---

[1] ژمارە (٢١)ساڵی ١٩٧٨.

میسری[1] ، یاسای باری کەسیی سوری[2]، یاسای تونسی (مجله الاحوال الشخصیه)[3] ، لەدواتریشدا یاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی ئەمەی وەرگرت[4].

چاوەڕوان دەکرا کەئەو یاسایەی دواتر هات گشتگیرترو گونجاوترو پێگەیشتوانەترو وردتر بوایە لەیاساکانی پێش خۆی، چونکە ئەگەر ئەوان ناتەواویەکیان تێدا بووبێت ئەم یاسایەی کەدوای ئەو هاتووە پڕی دەکاتەوە، لەبەر ئەوە دەبوو یاسادانەری عێراقی لەرێکخستنی راسپاردنی پێویست باشترو گشتگیر ترو تەواوتر بوایە لەیاسا پێشووەکان، بەڵام دەبینین رەوشەکە پێچەوانەی ئەوەیە، هەندێك لەمەرجی پێویستی فەرامۆش کردووە کەلەیاسای وڵاتە عەرەبیەکاندا هاتووە ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئەو کەمو کورتیانەی هەبووە تێیدا چارەسەری نەکردووە.

لەبەر ئەوە هیوادارین یاسادانەری عێراقی چاوبگێڕێتەوە بەو هەموارەدا بەمەبەستی هەموارکردنەوەی لەبەر رۆشنایی ئەو تێبینیانەی کە دواتر دەیخەینە روو، هەروەها مادده (٧٤) زیاد کراوە بۆ یاسای ژمارە (٧٢)ی ساڵی ١٩٧٩[5]، کەئەمە دەقەکەیەتی:

١- ئەگەر منداڵێك پێش مردنی باوکی یان دایکی مرد نێرینە بوو یان مێینە، حوکمەکەی وەك حوکمی زیندوو بێت لەکاتی مردنی هەریەکێکیاندا دادەنرێت و، ئەوەی شایستەیەتی لەمیراتی دەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکانی نێرینە بن یان مێینە، بەپێی حوکمە شەرعیەکان، بەو پێیەی راسپاردنی پێویستە، بەجۆرێ کەلەسێ یەکی میراتیەکە زیاتر نەبێت.

---

[1] ژمارە (٧١) ساڵی ١٩٤٦- ماددەکانی (٧٦-٧٩).

[2] ژمارە (٣٤) ساڵی ١٩٧٥، مادە (٢٥٧)

[3] ژمارە (٧٧) ساڵی ١٩٥٦، هەردوو فەصلی (١٩١-١٩٢).

[4] ماددەکانی (٢٣٥- ٢٣٨).

[5] المنشور في الوقائع العراقية ٢٧١٦ في ١٩٧٩/٦/١٨.

٢–بەپێی برگەی (٤)ی ئەم ماددەیە راسپادنی پێویست دەخرێتە پێش راسپاردنەکانی دیکە لە سوودمەندبوون لەسێ یەکی میراتیەکە"

**پوختەی ئەو حوکمانەی لەو ماددەیەدا هاتووە:**

١. لەسەر هەموو کەس پێویستە پێش مردنی راسپاردن بکات بۆ منالەکانی ئەو کورەی کەئەم لەژیاندایە مردووەو، چونکە بەو هۆیەوە بێ بەش دەبن لەمیراتی بەهۆی بەشبران (حجب)یانەوە بەکور یان کچ یان بەهەردووکیان.

٢. ئەگەر مردوو راسپاردنی نەکرد ئەوا دادوەر بەپێی حوکمی یاسا کەلەبۆچوونی زانایانی شەریعەت وەك زاهریەکان وەرگیراوە لەوەدا جێی دەگرێتەوە.

٣. راسپاردنەکە وەك پشکی مردووەکە وایە باوکی نەوەکان ئەگەر هاتوو منالی کورەکەی بوون، بەشی دایکەکەیان دەدرێتێ ئەگەر منالی کچەکەی بوون.

بەلام لەبەر ئەوەی ئەم پشکە لەحەقیقەتو سروشتیدا راسپاردنە لەبەر ئەوە حوکمەکانی راسپاردنی بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، لەو حوکمانەش نابێت لەسێ یەکی میراتیەکە زیاتر بێت ئەگەر زیاتر بوو دەبێت رەزامەندی میراتگرەکانی لەسەر بێت[1]، بەو مەرجەی ئەم رێگەدانە پاش مردنی میراتی لێگیراو بێتو ئەو کەسەی رێگە دەدات شیاوی بەخشین بێت.

٤. لەحالەتی دابەشکردنی میراتیدا مردووەکە (باوکی نەوەکان یان دایکیان) وا دادەنرێت هێشتا لەژیاندایەو لەمیراتگران دادەنرێتو بەمیراتی گیرێکی زیندوو ئەژمار دەکرێت، لەبەر رۆشنایی ئەوەدا بریار لەپشکەکەی دەدرێت، پاشان راستەوخۆ دەگوێزرێتەوە بۆ منالەکانی، وەك ئەوەی پاش وەرگرتنی پشکەکەی مردبێت.

---

[1] ئەگەر نەوەکان هی چەند منالێکی بوون کەمردبوون، بۆ هەموویان تەنها یەك سێ یەك هەیەو لەوە زیاتر نابێت.

بۆ نمونە کەسێك مردو کوڕێك‌و کچێکی لەپاش بەجێما، وا دادەنرێت کەلەپاش خۆی کوڕێك‌و دوو کچی لەپاش بەجێماوە، میراتیەکە دەکرێتە چوار پشکەوە (ژمارەی سەری میراتگرەکان پاش دانانی کوڕێك بەدوو کچ)، ئەمجا بەپێی بنەمای (بۆ نێرینە دوو هێندەی مێینە) بەسەریاندا دابەش دەکرێت، کوڕەکە دوو بەش دەبات، هەرکچێکیش بەشێك، پاشان بەشی ئەو کچەیان کەمردووە دەگوێزرێتەوە لەرێگەی راسپاردنی پێویستەوە.

٥. لەمەرجەکانی جێبەجێکردنی راسپاردنی پێویست کۆبوونەوەی منالّە لەگەلّ منالّی منالّ، بەلاّم لەو حالّەتەی مردووەکە منالّی نەبوو، ئەوا بەشی نەوەکانی لەرێگەی میراتیەوە دەبێت، ئەگەر کەسێك مردوو پاش خۆی کوڕێکی کوڕی‌و کچێکی کوڕی لەپاش بەجێما، سامانەکە دەکرێتە سێ بەش لەنێوانیاندا، کوڕی کوڕ دووبەشی دەکەوێت، کچی کوڕیش یەك بەشی دەکەوێت.

٦. ئەگەر راسپاردنی کرد بەسێ یەکی مالّەکەی بۆ فلاّنە کەس وەك راسپاردنێکی ئارەزوومەندانەو مردوو پاش خۆی منالّ‌و منالّی منالّ بەجێماو کەلّکەبوون روویدا لەنێوان راسپاردنی پێویست بۆ نەوەکان‌و راسپاردنی ئارەزوومەندانە بۆ فلاّنەکەسەکە، لێرەدا راسپاردنە پێویستەکە دەخرێتە پێش راسپاردن ئارەزوومەندانەکە.

بەلاّم لەم حالّەتەدا ئەگەر شتێ لەبەشی نەوەکان زیاد بوو مایەوە، وەك ئەوەی کەمتر لەسێ یەکی میراتیەکەیان برد، ئەو زیادەیە دەدرێتە ئەو کەسەی راسپاردنی ئارەزوومەندانەی بۆ کراوە.

٧. ئەگەر ئەو پشکەی کەدەگوێزرێتەوە بۆ نەوەکان کەمتر بوو لەسێ یەك، ئەوا بەرز ناکرێتەوە بۆ سێ یەك، چونکە مەرجە کەپشکەکە زیاتر نەبێت لەسێ یەك، نەك کەمتر نەبێت لەسێ یەك، چونکە ئەوان ئەوەندە دەبەن کە مردووەکە شایستەی بووە.

**تێبینیەکان:**

لەگرنگترین ئەو تێبینیانەی کەدەکرێت لەسەر مادده (٧٤) بخرێتە روو ئەمانەیە:

١. لەم ماددەیەدا بەراشکاوی مەرجەکانی جێبەجێکردنی راسپاردنی پێویست سەبارەت بە نەوەکان باس نەکراوە کەمردووەکە کوڕ یان کچ یان هەردووکیانی هەبێت، چونکە ئەگەر کوڕو کچی نەبێت، ئەوا منالّی منالّەکانی بەشی خۆیان لەمیراتیەکە لەرێگەی میراتیەوە دەبەن بەبێ راسپاردن، ئەم مەرجە لەیاساکانی دیکەدا هاتووە [1].

٢. لەمادده (٧٤)دا نەهاتووە کەنەوەکان شایستەی میراتی نین لەرێگەی راسپاردنی پێویستەوە ئەگەر باپیرەیان یان داپیرەیان لەکاتێکدا لەژیاندا بوو بڕی ئەوەندەی شایستەیێنی بەو راسپاردنە پێویستە بەبێ بەرانبەر پێی دان، ئەمە لەکاتێکدایە کەئەم مەرجە لەیاسای وڵاتە عەرەبیەکانی دیکەدا هاتووە [2].

٣. یاسادانەری عێراقی خۆی لەقەرەی حاڵەتی تەواوکردنی ئەوەی باپیرەیان یان داپیرەیان پێی داون بەبێ بەرانبەر نەداوە، ئەگەر ئەوەی پێیان درابوو کەمتر بوو لەوەی بەراسپاردنی پێویست بەریان دەکەوت، لەکاتێکدایە کەئەم حاڵەتە لەیاسای وڵاتە عەرەبیەکاندا باس کراوە [3].

---

[1] وەك یاسای راسپاردنی میسری (م٧٦): " بۆ نەوە لە میراتیدا پێویستە راسپاردن بەرادەی ئەو پشکە لەسنووری سێ یەکدا، بەمەرجێك کەمیراتگر نەبێت" هەروەها لەحاڵەتێکدا کە بەشبڕاو کرابێت بەهۆی کوڕ یان کچی کەسە مردووەکەوە".

هەروەها یاسای سوری (م٢٥٧/ب): ئەو نەوانە شایستەی راسپاردن نین ئەگەر میراتگر بوون بەهۆی بنەچەی باوکیانەوە باپیرە بێت یان داپیرە.

پرۆژە یاسای عەرەبی یەکگرتووش بۆ باری کەسیی (م٢٣٧/٢): " نەوەکان شایانی راسپاردنی پێویست نین ئەگەر میراتگر بوون لەباپیرە یان داپیرە یان لەهەردووکیان".

بەهەمان شێوە فەصلی (١٨١/٢): لە (مجلة الأحوال الشخصية التونسية).

[2] بڕوانە سەرچاوەکانی پێشوو.

[3] سەرچاوەکانی پێشوو.

٤. باسی بێ بەشبوونی راسپاردن بۆکراوی لەراسپاردنی پێویست نەکردووە ئەگەر بکوژی راسپاردنکار بوو، هەرچەندە ئەم باسکردنە پێویست نیە با بەسوودیش بێت، چونکە دەتوانرێت راسپاردنی پێویست لەگەڵ راسپاردنی ئارەزوومەندانە پێوانە (قیاس) بکرێت لەماددە (١/٦٨) ی یاسای باری کەسیدا.

٥. راسپاردنی پێویستی لای یاسادانەری عێراقی تەنها چینی یەکەمی نەوەکان دەگرێتەوە بەهەمان شێوەی یاساکانی وڵاتە عەرەبیەکان، لەگەڵ ئەوەی ئەم کارە باش نیە، چونکە یاساوەکانی راسپاردنی پێویست بۆ چینی یەکەم بەهەمان شێوە بۆ چینی دووەمو سێیەمیش هەیە، ئەگەر کەسێك مردو پاش خۆی کوڕی کوڕو کچی کوڕو کوڕی کوڕی کوڕی بەجێما، بۆ بابەتی یەکەم هەمان شت هەیە کە بۆ ئەم بابەتە هەیە لەحوکمەکانی دابەشکردنی میراتی.

یاسادانەری سوری باشی کردووە کاتێ تەنها بۆ چینی یەکەمی نەوەکانی دانەناوە [1] ، بەڵام رەخنە لەیاسادانەری سوریش دەگیرێت لەو رووەوە کە منداڵەکانی کچی بەدەر کردووە لەوانەی کەراسپاردنی پێویست دەیانگرێتەوە، لەکاتێکدا کە حوکمەکە لە منداڵەکانی کوڕو منداڵەکانی کچدا یەکێکە.

٦. یاسادانەری عێراقی چارەسەری حاڵەتی مردنی باوکی نەوەکان یان دایکیانی نەکردووە باپیرە یا داپیرە بەهۆی کارەساتێکەوە کەنەدەزانرا کامیان پێش ئەوی دیکەیان مردووە، هەروەك لەرووداوەکانی تێکشکانی فڕۆکەو پێکدادانی ئۆتۆمبێلو هاوشێوەکانیدا.. لەگەڵ ئەوەی کە یاساکانی دیکە حوکمی ئەم حاڵەتەیان باس کردووەو هەمان حوکمی مردنی کوڕ یان کچ پێش باپیرە یان داپیرەی پێداون [2] .

---

[1] المادة (٢٥٧)

[2] مادە (٧٦)ی یاسای راسپاردنی میسری: " ئەگەر مردووەکە بۆ منداڵی کوڕەکەی کەلەکاتێکدا ئەم لەژیاندا بووە مردووە یان لەگەڵیدا مردووە با بەمردنی حوکمیش بێت راسپاردنی نەکردبوو".

←

٧. مـاددە (٧٤) بەراشـکاوی باسـی نـەکردووە کەراسـپاردنی پێویسـت بەسـەر نەوەکاندا بەپێی بنـەمای (بـۆ نێرینـە دوو هێنـدەی مێینـە) دابـەش دەکرێـت، لەکاتێکدا پێویست بوو ئەوە روون بکاتـەوە، چـونکە جیاکـاری لـەنێوان نێـرو مێـدا لەراسـپاردنی ئارەزوومەندانـەدا نیـە، ئەگـەر راسـپاردنکاری خـۆی ئـەو جیاکاریەی نەکردبوو، ئەم جیاکاریە لەراسپاردنی پێویستدا لەیاسـاکانی وڵاتـە عەرەبیەکاندا باس کراوە[1].

٨. هەموارکردنەکە راسپاردنی پێویسـتی تـەنها سـەبارەت بەنـەوەکان چارەسـەر کردووە، بەهەمان شێوەی یاسا عەرەبیـەکان، ئەمـە لەکاتێکدایـە کەچـاوگەی فیقهی ئەم حوکمە راسپاردنی بەپێویست (واجب) دانـا بـۆ دایـكو بـاوكو ئـەو خزمانەی میراتیان بەر ناکەوێت بەهۆی بـوونی رێگرێـك لەرێگریـەکانی مـیرات وەك جیـاوازی ئـاین یـاخود هـەبوونی میراتگـری بـەهێزتر لـەمان لـەرووی خزمایەتیەوە[2] ، هەمان ئـەو دادپەروەریـەی کـەبڕیاری راسـپاردنی پێویسـتی داوە بۆ نەوەکان، هەر ئەویش لەیاسادانەر دەخوازێت گشتگیری بکاتو هەموو ئەو میراتگرانە بگرێتەوە کەلەمیراتی بێ بەش دەبن لەبەر هەر هۆکارێك بێـت، جگە لەکوشتن.

٩. ژمارەیەك هاووڵاتی عێراقی هەیـە کـە ژنـەکانیان مەسـیحین (ئـەهلی کیتـابن)، ئەوانە لەوانەیە پاش شوکردنیشیان دەست بەئاینەکەیانـەوە بگـرن، جیـاوازی ئاینیش رێگرە لـەمیراتی، بـەڵام رێگـر نیـە لـە راسـپاردن، ئـەو دادپـەروەریو

هەروەها مادە (٢٥٧) السوری: " ئەگەر کەسێك مردوو منالّی هەبوو، پێش خۆی یـان لەگـەڵ خۆیـدا منـاڵی مردبوو بۆ نەوەکانی پێویستە.... تا کۆتاییەکەی".

[1] سەرچاوەی پێشوو یاسای سوری (م٢٥٧/ج). مجلة الأحـوال الشخصـية التونسـية الفصـل (١٩٢): "ئـەم راسپاردنە تەنها چینی یەکەمی منالّی منالّەکان دەگرێتەوە کوڕین یان کچو لەنێوانیاندا دابـەش دەکرێـت بۆ کوڕ دوو هێندەی بەشی کچ".

[2] المحلی ٣١٢/٩.

چاکەویستیەی قورئانی پیرۆز فەرمانی پێ کردووە ئەوە دەخوازێت کە ئەوانیش راسپاردنی پێویست بیانگرێتەوە بەتایبەت کەئەوان بەزۆری بەشدار دەبن لەپێکهێنانی ئەو لێجێماوەدا.

١٠. سەرەرای ئەوەی باسمان کرد کەدادپەروەری وادەخوازێت راسپاردنی پێویست بۆ هەندێك لەخزمان بکرێت کەلەفیقهی سوننەدا لەمیراتی بێ بەش دەبن تەنها لەبەر ئەوەی بەخزمانی سك دانراون، بۆ نمونە: کەسێك مردو پاش خۆی کوری برایەکی دایكو باوکیو کچی برایەکی دایكو باوکی بەجێما، لێرەدا میراتیەکە هەمووی دەدرێت بەکوری برا دایكو باوکیەکەی چونکە لەخزمانی پشتەو، کچەکە بێ بەش دەکرێت چونکە لەخزمانی سکە، بەهەمان شێوە منالەکانی خوشکی دایكو باوکی یان-لەسەری باوکەوە یان لەسەری دایکەوە، نێرو مێیان لەمیراتی بێبەش دەکرێن تەنها لەبەر ئەوەی بەخزمانی سك دادەنرێنو میراتیەکە دەدرێت بەمنالەکانی مام لەبەر ئەوەی خزمە پشتن، دیارە منالی خوشك نزیکترە لەمنالی مام، چونکە ئەوان لەپلەی دووەمنو، منالی مامەکان لەپلەی سێیەمدا، دادپەروەریو رۆحی شەریعەت وا دەخوازێت کەئەوانەو نمونەکانیان راسپاردنی پێویست بیان گرێتەوە، بەمەش ناکۆکی نێوان فیقهی سوننە کە بێبەشیان دەکات لەمیراتی لەگەل فیقهی جەعفەریدا کەمیراتیان دەداتێ نامێنێت.

١١. ئەم تێبینیانە لەکاتی نووسینی ئەم کتێبەدا لام دروست بوو، ئەگەر لەجێگەی خۆیاندا بوون پێشنیار دەکەم لەهەموارکردنەوەکانی داهاتوودا یاسادانەری عێراقی هەمووی یان هەندێکیان بەهەند وەربگرێت.

# دەروازەی پێنجەم

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ڕاسپاردن

## (مبطلات الوصية)

ڕاسپاردن ئەگەر پایەو مەرجەکانی تێدا هاتەدی ئەوا دروستە، پاش ئەو دروستیە دەکرێت هەڵبوەشێتەوە بەهۆی هۆکارێك لەم هۆکارانە:

**١- پاشگەزبوونەوە لەڕاسپاردن:**

زانایانی موسڵمان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە گرێبەستی ڕاسپاردن گرێبەستێکی ناپابەندە(غير لازم) پێش مردنی ڕاسپاردنکار، بەم پێیە ڕاسپاردنکار بۆی هەیە لەهەر کاتێکدا بیەوێت بەویستی تاك لایەنەی خۆی بەڕاشکاوی یان وادەرخستن، بەکردار یان گوفتار، لێی پاشگەز ببێتەوە، لەبەر ئەوەی لەژیاندایە، ئیدی بەمەرجی گرتبێت کەلێی پاشگەز نەبێتەوە یان بەمەرجی نەگرتبێت، لەکاتی لەش ساغیدا بێت یان کاتی نەخۆشی[1].

---

[1] لە (اللمعة وشرحها الروضة البهية) (٥٨/٢)دا هاتووە: "بۆ ڕاسپاردنکار هەیە لەڕاسپاردنەکەی پاشگەز ببێتەوە مادام لەژیاندایە چ ئەوەی بەقسە ئەوە بڵێت پاشگەزبوومەوە یاخود هەڵوەشاندنەوە یان نەهێشتنی، یان ئەمە بۆ میراتگرەکەم یاخود بۆ میراتیکەم، یان حەرام بێت لە ڕاسپاردن بۆکرلو، یان ئەوەو ئەوە مەکەنو ئەو دەستەواژانە بەکاربێنێت کەگوزارشت بێت لێی، یان هەستێت بەفرۆشتنی ئەو شتەی کەکردویەتیە ڕاسپاردن با هێشتا کڕیارەکەش وەری نەگرتبێت یان کردبێتیە بارمتە و وەری گرتبێت یان نا، یان کارێك ناوەکەی بەتاڵ بکاتەوە".

لە (الخرشي) (١٧٢/٨)دا هاتووە: "پاشگەزبوونەوە بەچەند کارێك دەبێت لەوانە وتن، وەك بڵێت ڕاسپاردنکەمم بەتاڵ کردەوە یان لێی پاشگەزبوومەوە، هەروەها فرۆشتنی ئەگەر نەیکڕێت، هەروەها جۆری دیکە وەك دورینەوەو چنینەوەو لێکردەنەوەی ئەو کشتوکاڵەی کردویەتیە ڕاسپاردن، چونکە ناوەکەی لەو کاتەدا دەگۆڕێت، هەروەها تێیدا: گرێبەستی ڕاسپاردن بەپێی کۆدەنگ ←

٢- پاشگەزبوونەوەی مۆڵەتدەر پاش ڕێگە پێدان:

ڕاسپاردن ئەوەی زیاتربوو لەسێ یەك ئەگەر مۆڵەتدەر بەرەهایی پاشگەزبوویەوەو، بانگەشەی ئەوەی کرد کەئاگادار نەبووە لەبڕی زیادەکەو، دادوەریش بە ڕوونکردنەوەو بەڵگەکان گەیشتە ئەو بڕوایە.

هەروەها لەزیادەکەدا بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر مۆڵەتدەر پێش پێدانی ڕاسپاردنکراوەکە پاشگەز بوویەوە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە ڕێگەدان بەزیادە بەخشش (هبە)ە لە ڕێگەدەرەوە، بۆ بەخشەریش هەیە پاشگەز ببێتەوە لەبەخششەکەی پێش پێدانی، ئەگەر هاتوو بەڵگەیەك نەبوو پێچەوانەی ئەوە بێت[1].

---

ڕێگەپێدراو(جائز)ی ناپابەندە(غیر لازم)، بۆ ڕاسپاردنکار هەیە لێی پەشیمان ببێتەوە مادام زیندووە ئیدی مەرجی پاشگەز نەبوونەوەی تێدا بێت یان نا جیاوازی نیە ".

لە (المهذب) (٤٦١/١)یشدا هاتووە: "دروستە پاشگەزبوونەوە بەگوتە یان هەڵسوکەوت پێکردن تێیدا، چونکە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکەی تێدایە بەر لەتەواوکردنی، لەبەر ئەوە دروستە بەگوتە یان بەهەڵسوکەوت تێدا کردن".

هەروەها لە (التاج المذهب) (٣٨٤/٤)دا هاتووە: "ڕاسپاردن بەپاشگەزبوونەوەی ڕاسپاردنکار بەگوتە یان کردار لەوەی کردویەتیە ڕاسپاردن بەتاڵ دەبێتەوە ".

دادگای پێداچوونەوە بەبڕیاری ژمارە ٥٨١ و ١٠٩٨/ شەرعی یەککرتوو دەرچوو لە ٩٧٤/٣/٣١ (النشرة القضائية ع١س٥- ص٢٠٣) هاتووە: "ڕاسپاردنکار بەپاشگەزبووەوە دادەنرێت ئەگەر زۆربەی خەسڵەتەکانی ئەو خانووبەرەی لابرد کەکردویەتیە ڕاسپاردن".

[1] لە (التاج المذهب) (٣٨٤/٤)دا هاتووە: "یان بەپاشگەزبوونەوەی ڕێگەدەر ئیدی ڕێگەدەرەکە ئەوەی کردبێتە ڕاسپاردن کەکەسی دیکە هەڵسوکەوتی تیا کردووە یان میراتگری ڕاسپاردنکار بێت ئەگەر لە ڕێگەدانەکەی بەوە ڕاسپاردنەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام بەتاڵ بوونەوەی ڕاسپاردن بەپاشگەزبوونەوەی میراتگر لەڕێگەدانەکەی تەنها بەگوتن دەبێت، ئەو پاشگەزبوونەوەشی تەنها ئەوە دەگرێتەوە کەزیاتر بووە لەسێ یەك نەك هەمووی ".

یاسادانەری عێراقیش[1] بڕیاری داوە کەبەپاشگەزبوونەوەی راسپاردنکار راسپاردن بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام کردویەتیە مەرج کەئەو پاشگەزبوونەوەیە بەبەڵگەیەك بێت کە هێندەی ئەوە بەهێز بێت کەراسپاردنەکەی پێ چەسپاوە[2].

لەگـەڵ ئەوەشـدا باسـی حاڵـەتی هەڵوەشـاندنەوەی راسـپاردنی لـەزیادەدا بەپاشگەزبوونەوەی رێگەدەر نەکردووەو، ئەوەی بەجێ هێشـتووە بـۆ بنـەما گشـتی یەکانو ئەوەی لەفیقهی ئیسلامیدا چەسپاوە.

**٣- نەمانی شیاوێتی (اهلیة) راسپاردنکار پاش راسپاردن:**

هەندێك لەزانایان وتوویانە بەردەوامی شیاوێتی راسپاردنکار مەرجە بۆ بـەردەوامی راسپاردن هەروەك چۆن مەرج بووە لەدانانیدا، ئەگەر لەکاتی راسپاردنکردندا شیاوێتی بەخشینی هەبووبێت، پاشـان تووشـی شـێتی تـەوا و(الجنـون المکبـق) [3] بـوو ، لـەو ماوەیـەدا کەدەکەوێتـە نێـوان راسـپاردنو مردنیـەوە، ئـەوا راسـپاردنەکەی بـەتاڵ دەبێتەوە، ئیدی مردنەکەی پەیوەندی بەو شێت بوونەوە هەبێت یان نەبێت.

---

[1] مادە (٧٢) راسپاردن لەم حاڵەتانەدا بەتاڵ دەبێتەوە:
"١- بەپاشگەزبوونەوەی راسپاردنکار لەوەی کردوویەتیە راسپاردنو پاشگەزبوونەوە بەبەلگەیەك قبوڵ دەبێت کەهاوتای بەهێزی ئەوە بێت کەراسپاردنەکەی پێ چەسپاوە".

[2] دادگای پێداچوونەوە بـەبڕیاری ژمـارە ٨٧/ کەسـیی/ ٩٧٥ دەرچـوو لـە ١٩٧٥/٤/١ (مجموعـة الأحکـام العدلیة ٢٤س ١٩٧٥/٦ ص١٢٢)هاتووە کە: "ئەگەر راسـپاردنەکە لای دادنـووس پەسـەند کرابـوو ئـەوا پاشگەزبوونەوە لێی بە کاغەزێکی ئاسایی ناچەسپێت، ئەگـەر بەهـەمان شـێوە ئـەویش لای دادنـووس پەسەند نەکرابێت، رێگەنادرێت بە بەرپێك (دفـع)ی مـادی کەبووبێتـە رێگـر لەپەسـەندکردنی کاغـەزی پاشگەزبوونەوە لەراسپاردنەکە، چونکە ئەو بەرپێکە سەرەتا بۆ راسپاردنەکە دەچێت و بەهۆی نەبوونی دەقـەوە لەوبارەیـەوە پاشـگەزبوونەوە ناگەیـەنێت لێـی" م١/٧٢ و٢/٦٥ لـە یاسـای بـاری کەسـیی هەموارکراو.

[3] مەزهەبی پێشەوا ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خوای لێ بێت) لەسەر ئەمەیەو شێتبوون تەواو(مطبـق) دەبێـت ئەگەر ساڵێك بەردەوام بوو لای محەمەدی هاوڕێی ئـەبو حەنیفـە. بـەڵام لای ئـەبو یوسـف (رەحمـەتی خوای لێ بێت) بەجێبەجێکراو دادەنرێت ئەگەر یەك مانگ و زیاتر بەردەوامو فەتواشیان لەسەر ئەمەیە.

یاسـادانەری عێـراقیش بڕیـاری لەمـە داوەو شـێتبوونو ئـەوەی ببێتـە هـۆی لەدەسـتدانی شـیاوێتی راسـپاردنکاری بەبەتاڵکـەرەوەی راسـپاردن دانـاوە، بـەڵام کردویەتیە مەرج کەپەیوەندی بەمردنەکەیەوە هەبێت، واتە ئەو نەهێڵەرەی شـیاوێتی بەردەوام بێت تاکاتی مردنی راسپاردنکار[1].

بەڵام ئەگەر ئـەو هۆکـارە پـێش مردنـی نـەماو شـیاوێتی تـەواوی بـۆ گەڕایـەوەو بـەردەوام بـوو لەسـەر راسـپاردنەکەی،و بەپاشـگەزبوونەوە بـەتاڵی نـەکردەوە، ئـەوا بەراسپاردنێکی بەردەوام دادەنرێت کـە ئـەو نەمانـەی شـیاوێتی کەئێسـتا لێـی چـاك بۆتەوە کاریگەری نابێـت، مـەرجی پەیوەنـدی لەدەسـتدانی شـیاوێتی بەمردنـەوە بـۆ بـەتاڵ کردنـەوەی راسـپاردن یاسـای بـاری کەسـیی هەنـدێ لـەوڵاتانی عـەرەبی[2] و پرۆژەیاسای عەرەبی یەکگرتوو بۆ باری کەسیی پەیرەویان لێ کردووە[3].

٤- نغرۆبوونی لێجێماوەکە لەقەرزدا کاتی مردنی:

ئەگەر راسـپاردنکار مـردو لێجێماوەکـەی لەقـەرزدا نغـرۆ بـوو، خـاوەن قـەرزەکان لەهـەموو یـان بەشـێك لەقـەرزەکانی راسـپاردنکار خـۆش نـەبوون،و هـیچ کـەس لەمیراتگرەکان یان کەسێکی دیکـە لـەماڵی خـۆی هەڵنەسـتا بەدانـەوەی هـەموو یـان بەشێکی قەرزەکە وەك بەخشین، لێرەدا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە لەبـەر ئـەوەی بەدانـەوەی هـەموو ماڵەکـە بـەخاوەن قـەرزەکان ئـەوەی کراوەتـە راسـپاردن بـوونی

---

[1] مادە (٢/٧٢): "بەلەدەستدانی شیاوێتی راسپاردنکار تا کاتی مردنی".

[2] فەصلی (١٩٧) (گۆڤـاری بـاری کەسـیی تونسـی): "راسـپاردن بەشـێتبوونی راسـپاردنکار شـێتبوونێکی چەسـپاو بـەتاڵ دەبێتـەوە کەبەهۆیـەوە بمرێـت"... ومـادە (١٤) لـە یاسـای راسـپاردنی میسـری: "راسپاردن بەشێتبوونی راسپاردنکار شێتبوونێکی چەسپاو بەتاڵ دەبێتـەوە ئەگەر پەیوەنـدی هـەبێت بەمردنیەوە". هاوشێوەی مادە (٢٢٠) سوری.

[3] مادە (٢٣٤): "راسپاردن لەم حاڵەتانەدا بەتاڵ دەبێتەوە:
١- پاشگەزبوونەوەی راسپاردنکار لەراسپاردنکەی.
٢- راسپاردنکار شیاوێتی لەدەست بدات تاکاتی مردنی.

نامێنێت[1].

هەروەها راسپاردن ئەوەی زیاتر لەسێ یەکە بەتاڵ دەبێتەوە لەحاڵەتێکدا میراتیەکە لەقەرزدا نغرۆ نەبووبێت، ئەگەر میراتگرەکان رێگە بەو زیادەیە نەدەن.

**٥- مردنی راسپاردن بۆکراو لەکاتێکدا راسپاردنکار لەژیاندایە:**

ئەگەر راسپاردن بۆکراو پێش راسپاردنکار بمرێت، راسپاردنەکە ناگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکانی، بەڵکو بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە راسپاردن بۆکراو پاش مردنی راسپاردنکارو رازیبوون پێی دەبێتە خاوەنی راسپاردن کراوەکە، ئیدی بەهەواڵی مردنی راسپاردن بۆکراو بزانرێت لەکاتێکدا کە راسپاردنکار لەژیاندایە یاخود دواتر بزانرێت جیاوازی نیە، ئەوە گومانی تێدا نیە کە راسپاردن بەتاڵ دەبێتەوە ئەگەر دەرکەوت راسپاردن بۆکراو پێش راسپاردنکردن بۆی مردبێت[2].

**٦- راسپاردن بۆکراو راسپاردنەکە رەت بکاتەوە:**

ئەگەر راسپاردن بۆکراو پاش مردنی راسپاردنکار راسپاردنەکەی رەت کردەوە، ئیدی ئەمە پێش قبوڵکردنی بێت یان پاش ئەوە، راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، لای زۆرینەی زانایانیش قبوڵکردنو رەتکردنەوە ئەو کاتە بەهای نیە کەراسپاردنکار لەژیاندایە[3]، یاسادانەری عێراقی[1] و هەندێ لەیاسا عەرەبیەکان[2] دانیان بەمەدا ناوە

---

[1] یاسای باری کەسیی بەراشکاوی باسی ئەمەی نەکردووە لە مادە (٦٧) کەلەدەقەکەیدا هاتووە: "مەرجە راسپاردنکار بۆ بەخشین شیاو بێت (اهلا للتبرع)و خاوەنی ئەوەش بێت کە کردویەتیە راسپاردن".

[2] یاسادانەری عێراقی لەمادە (٦٨) جەختی لەسەر ئەوە کردووەو ئەمەش دەقەکەیەتی: "مەرجە راسپاردن بۆکراو لەکاتی راسپاردنکردنەکەدا و لەکاتی مردنی راسپاردنکاریشدا زیندوو بێت".

[3] زانایانی زەیدی حوکمی تایبەتیان هەیە بۆ رەتکردنەوە لەوانە: دەبێت دەستبەجێ بێت لەدانیشتنەکەدا یان پاش گەیشتنی هەواڵەکە، چونکە بێدەنگبوون پاش ئەوە مانای رازیبوون دەگەیەنێت، لەوانەش: رەتکردنەوەو قبوڵکردن لەکاتی ژیانی راسپاردنکاردا بەهەند وەردەگیرێت.

لە (التاج المذهب) (٣٨٣/٤)دا هاتووە: "رەتکردنەوەی راسپاردنەکە لەلایەن راسپاردن بۆکراوەوە دەست بەجێ لەدانیشتنەکەدا یان لەدانیشتنی گەیشتنی هەواڵەکەدا با پاش مردنی راسپاردنکاریش بێت، ئەگەر راسپاردنکار وتی ئەوەندە بدەنە فلان کەس پاش مردنم، راسپاردن بۆکراویش وتی: ئەم ←

وەك هۆكارێكی بەتاڵ بوونەوەی راسپاردن، ئیدی ئەو رەتكردنەوەیە بەروونی بوو یان بەناروونی (چمنی)، بەپێی یاساو شەرع مەرجە كە راسپاردن بۆكراو شیاوێتی رەتكردنەوەی هەبێت بەوەی باڵغو عاقڵو تێگەیشتوو بێتو بەویستی خۆی بێت.

٧- تیاچوونی ئەوەی كراوەتە راسپاردن:

ئەگەر ئەوەی كراوەتە راسپاردن ماڵێكی دیاریكراو بوو لەمیراتیەكە، ئەوا بەتیاچوونی راسپاردنەكە بەتاڵ دەبێتەوە، ئیدی ئەو تیاچوونە بەهۆی راسپاردنكارەوە بووبێت یان بەهۆی هێزێكی لەتوانا بەدەر، ئەمەش بەهۆی نەمانی ئەوەی كراوەتە راسپاردن[٣].

---

راسپاردنەم رەتكردەوە یاخود قبوڵی ناكەم یان وەریناگرم یان رەتی دەكەمەوە بۆ فلان میراتگر لەمیراتگرەكان یان شتێكی دیكەی لەو جۆرە كەبەپێی نەریت رەتكردنەوەی دەگەیاند، راسپاردنەكە بەتاڵ دەبێتەوەو بۆ هەموو میراتگرەكان دەبێتو بۆ ئەو كەسە نابێت بەتەنها كەدیاری كرابوو لەرەتكردنەوەكەدا، بەڵكو بۆ ئەوەو هەموو میراتگرەكانی دیكەش دەبێت، بەڵام ئەگەر دەست بەجێ راسپاردنەكەی رەت نەكردەوە لەو دانیشتنەدا یان لەدانیشتنی گەیشتنی هەواڵەكەدا، بەڵكو بێدەنگ بوو، راسپاردنەكە دروستەوبۆ دروستیەكەی پێویستی بەقبوڵكردن نیەو بەهۆی نەبوونی قبوڵ كردنەوە بەتاڵ نابێتەوەو پاش رەتكردنەوەشی بەقبوڵكردنەوەی بۆی ناگەرێتەوە چونكە رەتكردنەوە هەڵوەشاندنەوەیەتی".

[١] مادە (٥/٧٢): "بەرەتكردنەوەی لەلایەن راسپاردن بۆكراوەوە پاش مردنی راسپاردنكار".

[٢] تونسی فەصلی (٤/١٩٧) ومەغریبی فەصلی (٢١١): "بەرەتكردنەوەی راسپاردنەكە لەلایەن راسپاردن بۆكراوی پێگەیشتووەوە پاش مردنی راسپاردنكار".

[٣] لە (المغني) (٦/١٥٤)دا هاتووە: "زانایان لەسەر ئەوە كۆدەنگن كە ئەوەی كراوەتە راسپاردن ئەگەر تیاچوو) پێش مردنی راسپاردنكار یان پاش مردنی، ئەوا لەماڵەكەی دیكەی مردووەكەدا هیچی بۆ نیە، چونكە راسپاردن بۆكراو تەنها بەراسپاردن شایستەیە پێ بدرێت، ئەوەش پەیوەست كرابوو بەشتێكی دیاریكراوەوە، ئەو شتەش لەدەستیدا بەكەڵك نەماو لەگەڵیشیدا راسپاردنەكە نەما. لێچێماویش كەبەدەستی میراتگرەكانەوەیە گرەنتیەكەی لەسەر ئەوان نیە، چونكە بالەدەستی ئەواندا تیاچووبێت بەڵام بەهۆی ئەوانەوە یاخو زیادە رەویانەوە وای لێ نەهاتووە، لەبەر ئەوە ئەوان هیچ شتێكیان گرەنتی نەكردووە، ئەگەر هەموو ماڵەكەی تر جگە لەوەی كراوەتە راسپاردن تیابچێت ئەم راسپاردنەكەی وەردەگرێت، چونكە مافی میراتگرەكان پەیوەندی بەمەی ئەمەوە نەبووە چونكە بەشی ئەم دیاری كرابوو، لەبەر ئەوە بەبێ رەزامەندیو مۆڵەتدانی ئەوانیش دەبیات، وەك ئەوەی مافی خۆی بێت لەوەدا ←

بەڵام ئەگەر تیاچوونەکە بەهۆی هۆکارێکی دەرەکیەوە بوو پاش مردنی راسپاردنکار، ئەوا دەگوێزرێتەوە بۆ خستنەبری (قەرەبوو)، بەهەمان شێوە راسپاردنەکەش دەگۆڕێت بۆ جێگرەوە (بدل)ی لە تیاچوونی مەعنەویدا، هەروەك ئەوەی لە دەستبەسەراگرتنی بە بەرانبەری ئەوەی کراوەتە راسپاردن لەلایەن دەوڵەتەوە بەزۆر و بێ گوێدانە ویستی راسپاردن بۆکراو.

بەڵام ئەگەر ئەوەی کراوەتە راسپاردن بەشێکی هابەش بوو لە میراتیەکە، ئەوا راسپاردنەکە هەمووی بەتاڵ نابێتەوە بەتیاچوونی هەموو میراتیەکە نەبێت، بەڵام هەرکاتێ بەشێك لێی تیاچوو ئەوا راسپاردن بۆکراویش بەپێی پشکەکەی خۆی لەو پشکە هاوبەشەدا لەپشکەکەی کەم دەکاتو، راسپاردن بەتاڵ نابێتەوە ئەگەر ئەوەی کراوەتە راسپاردن جۆرێك بوو لە ماڵی راسپاردنکار کەبەناو یان ئاماژە دیاری نەکردبوو، ئەم جۆرەش تیاچوو لەکاتی راسپاردنەکەدا، پاشان هەمان جۆر جێگەی گرتەوە پێش مردنی راسپاردنکار[1].

یاسادانەری عێراقیش دانی ناوە بەم هۆکارەداو بەیەکێك لەهۆکارەکانی بەتاڵ بوونەوی راسپاردنی[2] داناوە، بەهەمان شێوە یاسای وڵاتە عەرەبیەکان[3].

---

لەوماڵەدا، جا هەرکامیان تیاچوو ئەوی دیکە بەشدار نابێت بەمافەکەی خۆی تێیدا، هەروەك ئەوەی راسپاردن بۆکراو پشکەکەی خۆی بردبێتو بەدەستی خۆیەوە تیاچووبێت پاش وەرگرتنی".

[1] لە (التاج المذهب) (٤/٣٧٤)دا هاتووە: "ئەگەر مەڕەکانی تیا بچن کەسێ یەکی کردوونەتە راسپاردن یان لەخاوەندارێتی ئەم دەرچوون ئەوا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، مەگەر پێش مردنی ببێتە خاوەن مەڕی دیکە ئەو کاتە راسپاردنەکە دروستە تێیاندا، ئەگەر پێشتر دەربڕینەکەی ئەوەی نیشان نەدابێت کەلەمەڕەکانی پێشووی مەبەست بووەو، مەبەستی مەڕی تری نەبووە، لە (البیان)دا گێڕاوەیەتەوەوئەمەش بژاردەیە".

[2] مادە (٤/٧٢) باری کەسیی: "راسپاردن بەتیاچوونی راسپاردن کراوەکە بەتاڵ دەبێتەوە یان بەبەکارهێنانی لەلایەن راسپاردنکارەوە".

[3] وەك تونسی فەصلی (١٩٧): "بەتیاچوونی ئەوەی دیاریکراوە کراوە بەراسپاردن لەلایەن راسپاردنکارەوە". ئەم دەربڕینەش وردبینانەترە لەدەربڕینەکەی عێراقی، چونکە ئەوەی کراوەتە راسپاردن بە (المعین) دیاریکراو وەسف کردووە، چونکە بەکارهێنانی لەلایەن راسپاردنکارەوە ئەوە
←

٨- مافداری ئەوەی کردویەتیە راسپاردن:

ئەگەر دەرکەوت مافداری هەندێك یان هەموو ئەوەی نیە کەکردویەتیە راسپاردن با پاش قبولکردنو وەرگرتنیشی بێت راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێت، چونکە مەرجێك لەمەرجەکانی دروستی تێدا نەهاتۆتە دی کەئەویش ئەوەیە راسپاردنکار لەکاتی راسپاردنکردندا خاوەنی ئەوە بێت کەدەیکاتە راسپاردنو راسپاردنکردنیش بەشتێك کەخاوەنی نەبێت بەتاڵە، چونکە کەسێك خاوەنی شتێك نەبێت ناتوانێت بی بەخشێت.

بەڵام بەبۆچوونی من ئەمە بەئاشکراکردنی نادروستی راسپاردنەکە دادەنرێت، بەجۆرێك لەراستیدا بەتاڵ بووەو پاش ئەوەی دەرکەوت ئەوەی کردویەتیە راسپاردن خاوەنی نیە بەتاڵیەکەی ئاشکرا بووە، ناتوانرێت بوترێت دروست بوو پاشان بەتاڵ بوویەوە، چونکە ئەو قسەیە پێچەوانەی واقیعە، چونکە دانانی شایستەبوون لەروانگەی هۆکارەکانی هەڵوەشاندنەوەی راسپاردنەکەوە دروستە. [1]

شایانی باسە کە راسپاردن بە مافداری (استحقاق) بەتاڵ دەبێتەوە تەنها بەرادەی ئەوەی مافداری لەسەری نیە، تەنانەت ئەگەر راسپاردنی کرد بەسێ یەکی دیاریکراوی ماڵەکەی گوێزراوە بێت یان خانووبەرە، پاشان شایانی دوولەسەر سێی بوو، سێ یەکی ماڵەکەی لەوانەبوو بکاتە سێ یەکی ئەو ماڵەی مابوو لێرەدا راسپاردنەکە جێبەجێ دەکرێت.

---

دەگەیەنێت پاشگەزبۆتەوە بەکرداریی لەراسپاردنەکەی، ئەمەش دووبارەبوونەوەی برگەی یەکەمی هەمان ماددەیە (٧٢).

[1] لەبەر ئەوە یاسادانەری عێراقی لەو مادەیەدا کە روونکردنەوەی هۆکارەکانی بەتاڵبوونی لەخۆ گرتووە فەرامۆشی کردووە.

**٩- دەرچوونی راسپاردنکراوەکە لەخاوەنداریتی راسپاردنکاردا بەر لەمردنی:**

بۆ نمونە ئەگەر خانوویەکی کردە راسپاردن، پاشان خاوەندارێتیەکەی پێش مردنی گوێزرایەوە بۆ کەسێکی دیکە، ئەمە دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی راسپاردنەکەی با پاش ئەوەش خاوەندارێتیەکەی جارێکی دیکە بۆ بگەڕێتەوە، ئەگەر هاتوو راسپاردنەکە نویێ نەکاتەوە جارێکی دیکە پاش گەڕاندنەوەی خاوەندارێتیەکەی بۆی بەپێچەوانەی هەندێك لەزانایانەوە[1] کە بەگەڕانەوەی خاوەندارێتیەکەی بۆی دەست بەجێ راسپاردنەکەش دەگەڕێتەوە.

ئەمە ئەگەر هاتوو ئەوەی کرابووە راسپاردن ماڵێکی دیاری کراو بوو لەوسامانەی هەیەتی، چونکە راسپاردنی ئەو کەسە بەتاڵ نابێتەوە کە سێ یەکی ماڵەکەی کردۆتە راسپاردن بۆ کەسێك، پاشان هەموو ماڵەکەی دەفرۆشێت، چونکە ئەوەی لەرۆژی مردنیدا هەیە جێی بایەخە ئیدی زیادی کردبێت یان کەم جیاوازی نیە، راسپاردن وەك خۆی دەمێنێتەوە لای زۆرینەی زانایانی شەریعەت[2].

**١٠- ئەو کەسەی راسپاردنی بۆ کراوە سوود لەماڵێک وەریگرێت ببێتە خاوەنی ماڵەکە:**

ئەگەر سوودلێوەرگرتنی ماڵێك (ماڵ)ی بەرەهایی یان بۆ ماوەیەکی دیاریکراو کردە راسپاردن بۆ راسپاردن بۆکراو، پاش مردنی راسپاردنکار راسپاردن بۆکراو بووە خاوەنی ئەو ماڵە کە کرابووە راسپاردن بۆی سوودی لێوەربگرێت، لێرەدا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە، چونکە سوودلێوەرگرتنەکە گۆڕاوە بۆ خاوەندارێتی بەرێگەی بوونە خاوەنی ماڵەکە، ئەگەر راسپاردنی کرد بۆ کەسێك کەلەخانووەکەیدا نیشتەجێ ببێت، پاشان راسپاردن بۆکراو ئەو خانووەی راسپاردنکراوە بۆی تێیدا نیشتەجێ ببێت بکرێت، ئەگەر کڕینەکە پێش دەستپێکردنی بابەتی نیشتەجێ

---

[1] وەك مالیکیەکان، بروانە الخرشي ١٧٣/٨.

[2] الخرشي، سەرچاوەی پێشوو ١٧٤/٨.

بوونەکــە بێــت ئــەوا راســپاردنەکە بــەتاڵ دەبێتــەوە، ئەگــەر لــەکاتی سوودلێوەرگرتنەکەشدا بوو ئەوا بۆ ئەو ماوەیـەی کەلـە راسـپاردنەکەدا هاتووەومـاوە راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

١١- بەکۆتاییهاتنی ماوەی راسپاردنی سوود لێوەرگرتن:

راسپاردن ئەگەر بەسود لێوەرگرتنی شت (الاعیان)بوو ماوە دیاریکردنی تێدا نیـە، هەموو مەرج دانانێکی کات لەراسپاردن بەسـوودی شـت (عـین) خەوشـدار (فاسـد)ە، لێرەدا راسپاردنەکە دروستەو مەرجەکە بەتاڵە، بەڵام راسپاردن بە سوود لێـوەرگرتن‌و موچەیەك، ئەمـەیان دیـاریکردنی مـاوەی تێـدا دەکرێـت، هـەروەها دەکرێـت‌و رەهـاو هەمیشــەیی بێــت، بــەم پێیــە ئەگــەر راســپاردنکار راســپاردنەکەی بــۆ ماوەیــەك کەکۆتاییەکـەی دیـار بـوو کـرد، ئیـدی سـەرەتاکەی دیـاری کردبێـت یـان نـا، ئـەوا راســپاردنەکە کۆتــایی دێــت‌و بەتــەواوبوونی ئــەو ماوەیــەش لــەژیانی راســپاردنکاردا راسپاردنەکە کۆتایی دێت، بـۆ نمونـە ئەگـەر نیشـتەجێ بـوون لەخانووەکەیـدا کـردە راسپاردن بۆ زەید لە ١٩٨٧ەوە تا کۆتایی ١٩٩٠، پاشان ئەم ماوەیـە کۆتـایی هـات‌و هێشتا راسپاردنکار لەژیاندا بوو، لەم حاڵەتەدا راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە.

١٢- بەمردنی راسپاردن بۆکراو لەراسپاردنی سوود لێوەرگرتندا:

ئەگـەر راسـپاردنی کـرد بـۆ کەسـێکی دیـاریکراو کـەپاش مردنـی لەخانووەکەیـدا نیشتەجێ ببێت بەرەهایی یاخود بۆ هەمیشـە یـان بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو، پاشـان دەست بەجێ دەستکردن بەسوود لێوەرگرتنی ئەوەی کراوەتـە راسـپاردن بـۆی ئـەو کەسەی ئەم راسپاردنەی بۆ کـراوە مـرد، لێـرەدا راسـپاردنەکە بـەتاڵ دەبێتـەوەو بـۆ میراتگرەکانی راسپاردن بۆکراوەکە ناگوێزرێتەوە، ئەگەر شتێکی نەوتبێت پێچەوانەی ئەمە بگەیەنێت.

ئەمەش بەپێچەوانەی راسپاردنکردنە بە (اعیان)، کە هۆکارێکە لەهۆکارەکانی بەدەستهێنانی خاوەنداریتی ئەو ماڵەی کراوەتە راسپاردن بۆی بەرەهایی‌و خاوەنداریتیەکەی پاش مردنی دەگوێزرێتەوە بۆ میراتگرەکانی.

**١٣- راسپاردن بۆکراو راسپاردنکار بکوژێت:**

ئەگەر راسپاردن بۆکراو هەستا بەکوشتنی راسپاردن کار بەشێوەیەکی دوژمنکارانەی ئەنقەست، راسپاردنەکە بەتاڵ دەبێتەوە ئیدی راسپاردنی پێویست بێت یان ئارەزومەندانە وەك میراتی، ئەگەر راسپاردنکار پاش بریندار‌بوونی بە لێدانێکی بکوژانە لەلایەن راسپاردن بۆکراوە پێش مردنی راسپاردنکار لێی خۆش بوو، لەبەر ئەوەی لێخۆش بوونەکەی راسپاردنەکە راست ناکاتەوە پاش ئەوەی بەتاڵ بوویەوە، هەروەها بەبەتاڵ دادەنرێت ئەگەریش میراتگرەکان پاش مردنی راسپاردنکار رێگەیان پێدا.

راسپاردنەکەش ناگەرێتەوە مەگەر بەدیاریکردنی پاش تاوانەکەو پێش مردنی دەست درێژی کراوە سەر، بۆچوونی زۆرینەی زانایانی شەریعەت لەسەر ئەمە جێگیر بووە.

هەندێکیشیان وتوویانە: ئەگەر راسپاردنکار زانی ئەوەی دەستدرێژی کردۆتە سەر راسپاردن بۆکراوەکەیە راسپاردنەکە بەتاڵ نابێتەوە[1].

---

[1] الخرشي ٨/١٧١.

# پاشكۆ

# مافی گوێزرانەوە

## (یان بەدەستهێنانی مافی هەڵس و
## کەوت بەهۆی مردنەوە)

## حق الانتقال
## ( أو كسب حق التصرف بسبب الوفاة )

بەپێویستم زانی مافی گوێزرانەوەش کەدەکەوێتە ژێر حوکمەکانی یاسا بۆ خوێندنی مافی میراتی کەدەکەوێتە ژێر حوکمی شەریعەتی ئیسلامییەوە زیاد بکەم، ئەمەش لەبەر پەیوەندی بەتینی نێوانیان و سەرەڕای گرنگی بابەتەکە بەتایبەت لەوڵاتەکەماندا (عێراق) کەچی زۆر کەس ئاشنا نین بەچۆنیەتی گوێزرانەوە، ئەم باسەش پێویستی بەپێشەکیەکی پوخت هەیە کە مانای زەوی میری (امیری) و مافی گواستنەوەو گوێزرانەوەو گەشەکردنی لەخۆ بگرێت.

## سەرچاوەی زەوی میری (زەوی کشتوکاڵی):

زەوی میری کەلەم سەردەمەدا پێی دەوترێت (زەوی کشتوکاڵی) سەرەتا پاش فتوحاتی ئیسلامیو دوای تەرخانکردنی زەوییەکان بۆ بەرژەوەندی گشتی بەبڕیارێکی گەورەمان عومەری کوڕی خەتتاب (ﷺ) کە هاودەنگی هاوڵاتی لەسەر بوو دەستی پێکرد.

پاشان زانایانی شەریعەت زاراوەی (زەویە وەقف کراوەکان – الأراضي الموقوفة)یان لێنا، بەهۆی ڕاگرتنیان بۆ بەرژەوەندی بەیتولمال (دارایی گشتی) دەوڵەتی ئیسلامی[1] ، دوا ئەوە زاراوەی (زەویە میریەکان – الأراضي الأميرية)ی لێنرا لەسەردەمی عوسمانیدا[2]، پاشان بۆ چەند بەشێك[3] دابەشکرا لەوانە:

---

[1] بڕوانە: الخراج لأبي يوسف (يعقوب بن ابراهيم صاحب الإمام ابي حنيفة) المطبعة السلفية ل٣٥ و دواتر.

[2] دەوڵەتی عوسمانی کەلەسەدەی هەشتی کۆچیدا دامەزرا یەکەمجار حوکمەکانی شەریعەتی ئیسلامی لەسەر بنەمای زەوی کشتوکاڵ تایبەت بۆ بەرژەوەندی گشتی سەلماند، پاشان دابەشیان کرد بۆ سێ جۆر: یەکەمیان تایبەت ئەمەش بۆ سوڵتان و ئەمیرەکان و، دووەم (زەعامە) بۆ سەرکردەکانی سوپا بوو، سێیەمییان (تیمار) بۆ سەربازەکان بوو، لەگەڵ ئەوانەی بەشێوەیەکی دروست یان نادروست وەقف کراون و بەوجۆرە... . بڕوانە: شرح قانون التسجيل العقاري رقم (٤٣) لسنة ١٩٧١ ل١٥ ودواتر، مامۆستا مصطفى مجيد.

[3] شرح القانون المدني (المواد الخاصة بالحقوق العينية المتفرعة عن حق الملكية) ل١٣ و دواتر.

– ئەوانەی بەتەواوەتی زەوی میرین‌و زەویەکەی‌و سوودەکەی بۆ دەوڵەتە.

– ئەو زەویە میریانەی دراونەتە تاپۆ، ئەمانەش لەبنەڕەتدا بریتیە لەزەویە میریەکان، پاشان دەوڵەت مافی هەڵسوکەوتکردن تێیاندای داوە بەخەڵکانێك لەبەرانبەر بەرانبەرێکی پێشخراودا (بدل معجل).

– ئەو زەویە میریانەی دەست بەسەردا گیراوە (المفوضة باللزمة) [1].

– ئەو زەویانەی وەقف کراون بەشێوەیەکی ناڕاست [2].

## مافی بەکارهێنان:

بریتیە لەمافی سەرپشککردنی خاوەنەکەی لەبەکارهێنانی ئەو زەوییە میریانەی کەدراونەتە تاپۆ [3] یاخود ئەو زەویە میریانەی کەدەستیان بەسەرداگیراوە یان ئەوانەی بەشێوەیەکی ناڕاست وەقف کراون.

---

[1] ئەمەش بریتیە لەو زەویانەی کەمافی هەڵسوکەوت کردن پێیانەوە درایە خەڵك بەپێی حوکمەکانی یاسای یەکلاکردنەوەو پەیوەستبوون (قانون التسويه واللزمه) ژمارە (٥١)ی ساڵی ١٩٣٢ کە دواتر بەیاسای ژمارە (١٥٣)ی ساڵی ١٩٥٩ بەتاڵکرایەوە، واتای راستەقینەی (اللزمـە)ش دەست بەسەراگرتن‌و داگیرکردنی زەویە میریەکانە، چونکە ئەم زەویانە تەنها سەرۆك‌و کەسانی عەشیرەتەکان بەریان کەوت کەئەوانە پارچەی گەورەیان لەو زەویە ئەمیریە هەڵس‌و کەوت پێکرلوانە داگیرکربووو بۆ ماوەیەك سوودیان لێ وەرگرتبوو.

[2] بریتیە لەوانەی کەلەبنەڕەتدا زەوی میرییە هەڵس‌و کەوت تیاکرلوەکان بوون کە مافی هەڵس‌و کەوت تیایاندا یاخود داهاتەکەی یان دەیەکی یاخود هەمووی لەلایەن سوڵتانەکان یان کەسانی ترەوە بەرەزامەندیان وەقف کرابوو بۆ لایەنە خێرخوازی‌و ئاینیەکان لەگەڵ پاراستنی مافی خاوەندارێتی زەویەکە بۆ دەوڵەت، بەرانبەر بەوە وەقفی دروست هەبوو کەزەویەکەو بەروبوومەکەشی پێکەوە بۆ لایەنە خێرخوازییەکان وەقف کرابوون.

بڕوانە: شرح قانون التسجيل العقاري المرجع السابق ل١١٨ ودواتر.

[3] لەسەردەمی عوسمانیەکاندا هەروەك باسمان کرد زەوییە میرییەکان کرابوونە سێ جۆر:

جۆری یەکەم: تایبەت ئەمەش تەرخان کرابوو بۆ سوڵتانەکان خۆیان‌و ئەمیرەکان‌و سەدری ئەعزەم‌و وەزیرەکان.

دووەم: (زەعامە) ئەمەش تایبەت کرابوو بەسەرکردەکانی سوپا.

←

لەمادە (١١٦٩)ی یاسای مەدەنی بەرکاردا هاتووە کە خاوەن مافی بەکارهێنان هەموو دەستەڵاتەکانی خاوەندارێتی تایبەتی لە مافی دەستداری (حیازە)و هەڵسوکەوت پێکردنو بەکارهێنانو بەکاربردن (استغلال)ی هەیەو لەهەموو بارەکاندا خودی زەویەکی خاوەندارێتیەکەی بۆ دەوڵەتە.

## گەشەکردنی مافی گوێزرانەوە:

سیستەمی گوێزرانەوەی مافی هەڵسو کەوت بۆ میراتگر بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕ بووە گرنگترینیان ئەمانەیە:

١. لەبنەڕەتدا زەویە کشتوکاڵیەکان دەبێت خودی زەویەکەو سوود لێوەرگرتنەکەی بۆ بەیتولمال (خەزێنەی گشتی وڵات) بێت، پاشان بەشێك لەو زەویانە درایە ئەو کەسانەی توانای وەبەرهێنانیان هەبوو، بەرانبەر پێدانی باج (خەراج) یان بەخشینی یەك لەدە یان نیوەی یەك لەدەی ئەوەی لەزەویە میریەکەدا بەرهەمی هێناوە دەدایە خەزێنەی گشتی، پەیوەندی هەڵسوکەوتکردن بەزەوییەکان لەسەر ئەم شێوازە بەردەوام بوو، بەڵام ئەم مافی هەڵسوکەوتە نەدەگوێزرایەوە بۆ میراتگرەکانی لەپاش مردنی، پاشان دەوڵەتی عوسمانی سەیری کرد ئەو کەسەی زەویەکە بەکاردێنێتو لەژێر رکێفیدایە تاپەیوەندی بەزەوییەکەوە زیاتر بێت بەرووبووم زیاتر دەبێتو بەوجۆرە باری ئابووری باشتر دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایە مافی هەڵسو

---

سێیەم: (تیمار) ئەمەش تایبەت کرابوو بەجەنگاوەرانی سوپا لەبەرانبەر راژەی جەنگیدا، لەسەر خاوەنەکەی پێویست دەکرا لەکاتی پێویستدا بەشداری جەنگ بکات.

دەرچوونی یاسای تاپۆ لە ٥/ جەمادی دووەم/١٢٦٢ی کۆچی کە رێو شوێنیە رووکاریەکانی هەڵسوکەوت بەزەویوزاری رێکدەخات جێگای تیماری گرتەوە. وشەی (تاپۆ) لەبنەڕەتدا لەوشەی (طابوق)ی تورکی کۆنەوە هاتووە کەبەمانای ملکەچیو گوێڕایەڵی دێت، پاشان ناوی فەرمانگەی تایبەتمەند بەتۆماری خانوبەرە بەیاسای ژمارە (٤٣)ی ساڵی ١٩٧١ لەتاپۆوە گۆڕدرا بۆ تۆماری خانوبەرە.

کەوتکردنی کردە مافێکی هەمیشەیی بۆ بەکاربەری زەوی‌و زاری میری، ئەمە لەکاتێکدا کە پێشتر مافێکی لاواز بوو هیچی لەمافی کرێکار زیاتر نەبوو، سەرەڕای ئەوە ئەم مافە تەنها بۆ خودی بەکاربەرەکە بوو بەتەنها، لەسنوورێکی زۆر کەمدا نەبێت نەدەگوێزرایەوە بۆ میراتگرەکانی [1].

٢. گوێزرانەوەی مافی بەکاربردنی زەوی‌و زاری میری لەنێرینەوە پاش مردنی تەنها بۆ نێرینە لەکوڕو نەوەکانی [2].

٣. پاشان فراوان بوو [3] ڕێگەدرا مافی زەوی‌و زاری نێرینە بگوازرێتەوە بۆ منداڵەکانی بەنێرو مێیانەوە بەشێوەیەکی یەکسان (واتە بەبێ لەبەرچاوگرتنی بنەمای بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ) وەك ئەوەی لەمیراتیدا هەیە.

٤. پاشان فراوان بوونێکی [4] دیکەی بەسەر مافی گوێزرانەوەی بەهۆی مردنەوە بۆ میراتگران هات، گوێزرانەوەی لەنێرو مێوە بۆ منداڵەکانیانی گرتەوە بەکوڕو کچیانەوە، بەیەکسان لەنێوانیاندا بەش دەکرا بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان نێرو مێدا.

٥. پاشان دایك‌و باوکیش زیادکرا بۆ ڕیزی میراتگران [5].

٦. پاشان گوێزرانەوەی ئەو زەوی‌و زارانەی بەشێوەیەکی نادروست وەقف کرابوون گرتەوەو هەمان حوکمی زەوی‌و زاری میریان پێدرا لەگوێزرانەوەی بۆ

---

[1] الأستاذ عبدالرحمن خضر، تعليقاته على مواد القانون المدني الخاصة بحق التصرف والإنتقال، ص٦٧ وما بعدها.
أحكام الأراضي: أستاذنا شاكر ناصر، ص٦٤ وما بعدها.
حقوق التصرف وشرح قانون الأراضي/ الأستاذ لبراهيم ناجي، ص٢٦ وما بعدها.

[2] بەپێی فەرمانە سوڵتانیەکان.

[3] بەپێی(الإرادة السنية) کە لە ٧/جەمادی یەکەم/ ١٢٦٣کۆچی دەرچووە.

[4] بەپێی یاسای سوڵتانی لە ٢٣/ڕەبیعی یەکەم / ١٢٦٥ کۆچی.

[5] بەپێی هێڵی همایونی لە جەمادی یەکەم ١٢٧٤ کۆچی، و یاسای زەوی‌و زاری دەرچوو لە ٢٣/ شەوال/ ١٢٧٤ کۆچی.

میراتگران[1].

٧. دواتر گوێزرانەوە فراوانتر بوو بەجۆرێك جگە لەو میراتگرانەی باسكران نەوەو براو خوشك (هی دایكو باوكی یان باوكی یان دایكی)ی و منداڵەكانیان و ژن و مێردیشی بەرەهایی گرتەوە[2].

٨. دوای ئەوەش فراوانبوونێكی دیكەش[3] رویداو گوێزرانەوەكە باپیرەكان و داپیرەكان و لقەكانیشیان لەمامەكان و پورەكان (خوشكی باوك) و خاڵەكان و پورەكان (خوشكی دایك) و منداڵەكانیان و بەرەوخوارتریشی بەنێرومێوە گرتەوە.

٩. پاشان یاسادانەری عێراقی ئەوەی لەو هەشت خاڵەی پێشتردا هات لەیاسای مەدەنیدا[4] بەمادەكانی (١١٦٩–١٢٤٨)ی فەصلی یەكەم لەبابی دووەم رێكی خست.

## رووكارەكانی لێكچوون و لێكجیایی لەنێوان میراتی، گوێزرانەوەدا:

لەم نێوان ئەم دوو مافەدا رووكاری لێكچوون و رووكاری لێكجیایش هەیە.

أ- رووكارەكانی لێكچوون:

١- هەردوو مافەكە لە پایەكان و مەرج و رێگریەكانی میراتیدا یەكن، هەروەك پێشتر لەباسكردنی حوكمەكانی میراتیدا بەپێی حوكمەكانی شەریعەتی ئیسلام لێی دواین.

دیارە یاسادانەری عێراقی لەیاسای باری كەسیدا[5] خۆی لەقەرەی رێگریەكانی میراتی نەداوە، لەكاتێكدا لەیاسای مەدەنیدا لە مادده ١١٩٨ هاتووە كە:"زەوی

---

[1] هەروەها بەپێی(الإرادة السنية) كە لە ١٢٧٤ كۆچی دەرچووە.

[2] بەپێی یاسای فراوان كردنی گواستنەوە كە لە ١٧/محرم ١٢٨٤ كۆچی دەرچووە.

[3] بەپێی یاسای گواستنەوەكان كە لە ٢٧/ رەبیعی یەكەم/ ١٣٣١ كۆچی دەرچووە.

[4] ژمارە (٤٠)ی ساڵی ١٩٥١.

[5] ژمارە (١٨٨)ی ساڵی ١٩٥٩.

کوژراو ناگواستریتەوە بۆ بکوژ یان هاوکاری بکوژەکە"[1].

لـەمادە ١١٩٩ی هـەمان یاسـادا هاتووە:"مـافی گوێزرانـەوە ناسـەلمێت لـەنێوان ئەوانەی ئاینییان جیاوازەو لەنێوان عێراقیو بیانیدا".

سەرەڕای ئەوە یاسای مەدەنی هەنـدێ حـوکمی هاوبەشـی نێـوان میراتـیو مـافی گوێزرانەوەی بەئاشکرا تێیدا هاتووە کەلەیاسای باری کەسیدا باسی نەکردووە، لەوانە ئەوەی لەمادده ١١٩٥دا هاتووە:"ئەگەر لـەنێوان ئەوانـەی خـاوەن مـافی گوێزرانـەوە بوون کەسێکی دووگیان هەبوو گوێزرانەوەکە تا کاتی لەدایکبوونی دوا دەخرێت".

٢- مـافی گوێزرانـەوە هـەموو ئـەو شـتانە دەگرێتـەوە کـەمافی میراتـی لـەخۆی گرتووە لەهۆی خزمایەتیو هاوسەرگیری لەگەڵ جیاوازیێ لە وردەکاریاندا.

ب- رووکارەکانی لێکچیایی:

١. یەکسـانی لـەنێوان نێرومێـدا لەگوێزرانـەوەدا لەکاتێکـدا لەمیراتیـدا وانیـە، لەگوێزرانەوەدا کوڕو کچ وەك یەك بەشیان دەکەوێت بێ جیـاوازی، خوشـك وەك برا بەشی دەکەوێت، دایك هەمان بەشی وەك باوك بەردەکەوێت، داپـیرەش وەك باپیرە بەش دەبات، پور (خوشکی باوك) وەك مام، پـور (خوشـکی دایـك) وەك خـاڵ بـەش بـەبێ جیـاوازی دەبـەن، منداڵـەکانی کـچ هـەمان بەشـی دایکـە مردووەکـەیان دەکـەوێت، هـەروەك چـۆن منداڵـەکانی کـوڕ هـەمان مـافی باوکـە مردووەکەیان بەر دەکەوێت.

٢. راسپاردنی پێویست لەمافی گوێزرانەوەدا وەك ئەوەی لەمیراتیدا هەیە جێبـەجێ ناکرێت، منداڵی کوڕ پشکەکەی باوکیانو منداڵی کچ پشکەکەی دایکیان دەکەوێت بەیەکسانی وەك یەك، ئیدی زیاتر بێت لەسێ یەك یان کەمتر جیاوازی نیە.

---

[1] بەڵام یاسادانەر جۆری کوشتنە رێگرەکەی دیاری نـەکردووە، ئـەوەی باسـنەکراوە لـە (م٦٨/٢)ی یاسـای باری کەسیی سەبارەت بە راسپاردنکار.

٣. دابەشکردنی میراتگرەکانی تێدا نیە بۆ خاوەن پشکی دیاریکراوو خزمانی پشتو خزمانی سك، وەك ئەوەی لەمەزهەبەکانی سووننەدا هەیە، بەڵکو دابەش کراون بۆ چەند پلەیەك کەنزیکە لەو دابەشکاریەی لەمەزهەبی ئیمامیدا هەیە کە بۆ سێ پلە بەش کراون بەکەمێك جیاوازییەوە، بەڵام یاسا دەربڕینی پلە (الدرجە)ی لەبری ریزبەند (المرتبە) بەکارهێناوە، بەڵام راست تر دەربڕینی دووەمیانە واتە (المرتبە) تا هەر مەرتەبەیەکیان بۆ چەند دەرەجەیەك دابەش بکرایە وەك ئەوەی لەفیقهی ئیمامیدا هاتووە، هەروەها لەدابەشکاری خزمانی پشت بەنەفس (العصبات بالنفس)ی فیقهی سوونی دەکات بۆ (کوڕێتیو باوکێتیو برایەتیو مامەیەتی) لەو رووەوە کە هەموویان وەك خزمانی پشت بەخود (العصبات بالنفس) دادەنێن جگە لەدایكو باوكو ژنو مێرد.

٤. سەبارەت بە ونبو گوێزرانەوە جیاوازە لەمیراتی، بەشی ونبووەکە لەمیراتیدا دەپارێزرێت تائەو کاتەی سەرئەنجامی روون دەبێتەوە، بەپێچەوانەی گوێزرانەوەوە کە ونبوو هەمان حوکمی مردووی هەیە، لەمبارەیەوە لەماددە ١١٩٦دا هاتووە: "ئەگەر یەکێك لەخاوەنانی گوێزرانەوە دیارنەمابوو دیار نەبوونێکی هەواڵ بڕاو بەجۆرێك نازانرێت کەمردووە یان زیندووە، بەشەکەی دەدرێت بەو کەسەی پاش ئەم شایستەی مافەکەیە، بەڵام ئەگەر لەماوەی سێ ساڵدا لەبەرواری بەمردوو دانرانەکەیەوە هاتەوە یاخود لەو ماوەیەدا دەرکەوت کەزیندووە، ئەوا بەشەکەی لەو کەسە وەردەگرێتەوە کەپێی درابوو".

٥. منداڵ تەنها دەبنە بەشبڕی منداڵەکانی خۆیان نەك منداڵی ئەو براو خوشکەکانیان یان ئەوەی لەوان دێت، بۆ نمونە ئەگەر هەڵسو کەوتکار مردو پاش خۆی کوڕێكو کوڕی کچێکی (کەکچەکەی مردووە) بەجێما، لێرە ئەو کوڕەی کەدایکی مردووە بەهۆی کوڕی هەڵسوکەوتکارەوە بەشبڕ ناکرێت، بەڵکو پشکەکەی دایکی بەردەکەوێت کەئەویش نیوەی زەویەکەیە، بەپێچەوانەی میراتیەوە، کە منداڵ دەبێتە بەشبڕی منداڵی منداڵ ئیدی هی خۆیان بن یان نا، هیچیان لە

میراتیەکە بەرناکەوێت لەرێگەی راسپاردنی پێویستەوە نەبێت ئەمەش بەهۆی بەشبڕ کرانیانەوە لەلایەن منداڵەوە لەکوڕو کچ.

٦. برای باوکو دایك بە برای باوکی بەشبڕ ناکات، وەك ئەوەی لەمیراتیدا بەشبڕی دەکات، چونکە براو خوشکەکانی هەڵسوکەوتکارە مردووەکە دەچنە جێگای باوکە کۆچکردووەکەیان یان دایکە کۆچکردووەکەیان کەپێش مردنی هەڵسوکەوتکار مردووە، ئەو پشکەی بۆ باوکەکە هەبوایە کە لەژیاندا بوو دەدرێتە منداڵەکانی لەهەر ژنێکی بێن، ئەو پشکەی دایکە مردووەکەش ئەگەر لەژیاندا بمابایە بەری دەکەوت دەگواسترێتەوە بۆ منداڵەکانی ئیدی لەم مێردەی بن یان لەمێردی دیکە بەیەکسانیو وەك یەك.

## پلەکانی ئەوانەی مافی گوێزرانەوەیان بۆ هەیە:

یاسای مەدەنی عێراقی بەرکار ئەوانەی مافی گوێزرانەوەیان بۆ هەیە دابەشی کردوون بۆ سێ پلە هەروەها ژنو مێرد:

پلەی یەکەم: منداڵەکانیو منداڵی منداڵەکانیو بەرەوخوارتر بەنێرو مێیانەوە.

پلەی دووەم: دایكو باوکی راستەوخۆو براو خوشکەکانو منداڵەکانیان.

پلەی سێیەم: باپیرەو داپیرەکانو منداڵەکانیان (مامەو پورەکانو خاڵەو پورەکان)و منداڵەکانی ئەوانە.

هەرپلەیەك پلەکانی پاش خۆی بەشبڕ دەکات، جگە لەدایكو باوكو ژنو مێرد، کەبەهۆی هیچ کەسەوە بەشبڕانی بێبەشکرانیان ناکرێت، بەڵام بەهۆی خاوەن مافەکانی گوێزرانەوەی پلەی یەکەمەوە بەشبڕی ناتەواو دەبن، هەریەك لەباوكو دایك یان هەردووکیان شەش یەکیان بۆ هەیە، بۆ هەریەك لەژنو مێردیش چواریەك هەیە، مافی گوێزرانەوەکەش بەسەر ئەوانەدا کەشایستەینی بەش دەکرێت بەیەکسانیو بێ

جیاوازیکردن لەنێوان نێرومێدا [1] لەگەڵ رەچاوکردنی هەردوو مادەی (١١٩٢و١١٩٣)ی پەیوەندار بەباوکودایكو ژنو مێردەوە هەروەك لێرەدا دەیخەینە روو:

**یەکەم: حوکمەکانی گوێزرانەوە بۆ پلەیەك:**

١. لەپلەی یەکەمدا خاوەنانی مافی گوێزرانەوە بریتین لە لقەکانی مردووەکە لە منداڵەکانیو منداڵی منداڵەکانیو بەرەوخوارتر، نێر وەك مێ بەبێ جیاوازی بەشی دەکەوێت.

٢. گوێزرانەوەکە یەکەمجار بۆ منداڵەکانی دەبێت پاشان بۆ نەوەکانیان ئەوانەی جێگایان دەگرنەوە لەنێرو مێ، هەر منداڵێك دەبێتە بەشبری منداڵەکانی خۆی تا لەژیاندا زیندوو بێت، هەر کچێکیش دەبێتە بەشبری منداڵەکانی خۆی، نابنە بەشبری منداڵەکانی ئەو خوشكو برایانەی دیکەیان کەمردوون.

٣. ئەگەر پێش مردنی هەڵسوکەوتکار کوڕ یان کچی مردن، ئەوا منداڵی ئەوانە دەچنە جێگایانو پشکەکەی ئەوانیان بەر دەکەوێت بەهەمان شێوەی راسپاردنی پێویست، بەڵام ئەو چارەسازییانە جیاوازە لەراسپاردنی پێویست لەو رووەوە کە ناکرێتە کۆت لەسەری کەنابێت لەسێ یەکی میراتیەکە زیاتر نەبێت، بۆیە هەرکەسێك پاش خۆی کوڕێكو کوڕی کچێکی یان کچی کچێکی یان کوڕی کوڕێکی بەجێما، ئەوا مافی گوێزرانەوە لەنێوانیاندا وەك یەك بەش دەکرێت، هەروەها لەوەشدا لەراسپاردنی پێویست جیاوازە کەبەهۆی مامەیەوە (کوڕی کەسە مردووەکە) یان پوری (کچی کەسە مردووەکە) کەزیندووە بەشبر ناکرێت، بەپێچەوانەی راسپاردنی پێویستەوە، کە منداڵی منداڵەکان کاتێك لەگەڵ منداڵی

---

[1] لەدەقی م(١١٨٧)ی یاسای مەدەنی بەرکاردا هاتووە کە: "ئەگەر ئەو کەسەی زەوی میری بەکاردێنێت مرد، ئەوا زەویەکەی بەبێ بەرلنبەر دەگوازرێتەوە بۆ خاوەن مافەکانی گواستنەوە بەپێی ریزبەندی پلەکان بەو شێوەیەی کەلە ماددەکانی دواتردا روونکراوەتەوەو هەرپلەیەك پلەی دوای خۆی بەشبر دەکات کەلەخوار خۆیەوەیەتی بەبێ لادان ".

کەسە مردووەکەدا دێن بەهۆی ئەوانەوە بەشبڕ دەکرێن بەڵام پشکەکەی باوکیان یان دایکیان وەردەگرن کە پێش مردنی هەڵسوکەوتکارەکە مردووە بەجۆرێ نابێت لەسێ یەکی میراتیەکە زیاتر بێت.

٤. ئەگەر هەڵسوکەوتکارە مردووەکە چەند منداڵێکی هەبوو، هەموویان پێش خۆی مردن، ئەوا بەشی هەموو ئەوانە دەگواسترێتەوە بۆ منالەکانیان پلە بە پلە، ئەگەر مردو پاش خۆی منالی کوڕێکی مردووی‌و منالی کچێکی مردووی بەجێما، ئەوا مافەکە لەنێوان هەموو ئەو منالانەدا بەیەکسانی دابەش دەکرێت، نیوەی بۆ منالی کوڕە مردووەکەی دەبێت‌و نیوەکەی دیکەش بۆ منالی کچە مردووەکەی بەبێ جیاوازی لەنێوان نێرو مێدا.

٥. ئەگەر یەکێك لەمنالەکانی هەڵسوکەوتکارەکە پێش خۆی مرد کەهیچ منالی نەبوو، ئەوا مافی گوێزرانەوەکە تەنها منالەکانی دیکەی هەڵسوکەوتکارەکە یان لقەکانیان دەگرێتەوەو ئەو منالەی کەمردووەو هیچ منالی نەبووە وەك نەبوو دادەنرێت [1].

٦. ئەگەر دایك‌و باوك لەگەڵ لقەکانیان یان نەوەکانیان (منالی منالیان) هات ئەوا شەش یەکی بۆ هەیەو ئەوەی دەمێنێتەوە (٦/٥) بەسەر لقەکانیان یان منالی لقەکانیان بەیەکسانی دابەش دەکرێت، ئەگەر بەیەکەوە هاتن ئەوا بۆ هەریەکەیان شەش یەك هەیە بەیەکسانی‌و ئەوەی دەمێنێتەوە بۆ لقەکانیانە یان منالی لقەکانیان، ئەگەر کەسێك مردوو پاش خۆی باوك‌و دایك‌و پێنج کچ یان پێنج کوڕ بەجێما، بابەتە گریمانەکراوەکە (٦)و بە (١٢) راست دەکرێتەوە، شەش یەکی بۆ دایك‌و باوکەکەیە (١٢/٢) بۆ هەریەکەیان بەشێك‌و بۆ هەر کچ یان کوڕێك دوو بەش (١٢/٢). [2]

---

[1] مادە ١١٨٨ مەدەنی عێراقی بەرکار.

[2] مادە ١١٩٢ مەدەنی عێراقی.

٧. ئەگەر ژن‌و مێرد یەکێکیان لەگەڵ لقەکانیان‌و منالّی لقەکانیان هات، ئەوا چواریەکیان (٤/١) بۆ هەیەو ئەوەی مایەوە (٤/٣)بەسەر منالّەکان یان منالّی منالّەکان بەیەکسانی دابەش دەکرێت [1].

٨. رێسای گشتی گوێزرانەوە ئەوەیە کە منال‌و منالّی منال‌و بەرەوخوارتر وەك خۆیان خزمی پشت بن لەمیراتیدا دادەنرێت هەموو مافی هەڵس‌وکەوتەکە یان ئەوەی مایەوە پاش بەشی دایك‌و باوکەکەو یەکێکیان لەژن‌و مێردەکە بەیەکسانی لەنێوانیاندا دابەش دەکرێت. ئیدی تەنها نێر بن یان تەنها مێ بن، یاخود نێرو مێ بن بەیەکەوە، منالّی بن یان منالّی منالّی یان منالّی بن لەگەڵ منالّی منالّیدا بێن، کەباوکیان یان دایکیان پێش مردنی هەڵس‌وکەوتکارەکە مردبێت، لەحالّەتی نەبوونی یەکێك لەدایك‌و باوکدا یان یەکێك لەژن‌و مێرد بنچینەی بابەتە گریمانەکراوەکە لە (٦)ەو لەجێی بەشی یەکێك لەدایك‌و باوك یان هەردووکیان، لەگەڵ یەکێك لەژن‌و مێردەکە لە (٤) دەبێت بەرانبەر بەشی یەکێکیان، ئەوەی کەمایەوە بەسەر هەموو ئەوانەی لەپلەی یەکەمدان لەمنالّەکانی‌و منالّی منالّەکانی‌و بەرەوخوارتر، ئەگەر یەك نەبنە بەشبڕی ئەوانی دیکە.

**جێبەجێکردنەکان:**

| **میراتگرەکان:** | کوڕ | کچ |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان | ١ | ١ |

| **میراتگرەکان:** | کوڕی (کوڕی مردووەکە) | کچی (کچی مردووەکە) |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

---

[1] مادە ١١٩٣ مەدەنی عێراقی.

| میراتگرەکان: | کوڕ | کچ | کوڕی کچی مردووەکە | کوڕ (کوڕی مردووەکە) |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٤/١ | ٤/١ | ٤/١ |
| پشکەکان | ١ | ١ | ١ | ١ |

| میراتگرەکان: | باوکودایک | مناڵەکانی یان مناڵی (کوڕی مردووەکە)(٥) یان کچان(کچی مردووەکە) (٥) |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٦/١ | ٦/٥ |
| پشکەکان | ١ | بۆ هەریەکەیان بەشێك (٦/١) |

**میراتگرەکان:**

| باوکودایک | کوڕ | کوڕی (کوڕە مردووەکە) | کچ | کوڕی (کچە مردووەکە) | کچی (کچە مردووەکە) |
|---|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | | | | | |
| ٦/١ | ٦/١ | ٦/١ | ٦/١ | ٦/١ | ٦/١[1] |
| پشکەکان: | | | پێش ڕاستکردنەوە | | |
| ١ | ١ | ١ | ١ | ١ | ١ |

| میراتگرەکان: | مێرد (یان ژن) | کوڕ | کچ | کوڕی کچی مردووەکە |
|---|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٤/١ | ٤/١ | ٤/١ | ٤/١ |
| پشکەکان | ١ | ١ | ١ | ١ |

[1] بنچینەی بابەتەکە (٦) و ڕاست دەکرێتەوە بە (١٢) چونکە پشکی هەریەك لەدایكو باوك یەك پشکە (٦/١)و دابەش کردن بەسەریاندا قبوڵ ناکات، لەبەر ئەوە لەگەڵ بنچینەی بابەتەکە لەیەك دەدرێن (٢×٦=١٢) بۆ هەریەك لەدایکوباوك ١٢/١، بۆ هەریەك لەوانەشی مانەوە ١٢/٢.

**دووەم: خاوەن مافەکانی گوێزرانەوەی پلە دوو:**

ئەوانەی لەپلەی دووەم (میراتگرەکان لەمافی گوێزرانەوە)دا دێن بریتین لە دایك‌و باوکی هەڵسوکەوتکارو براکانی‌و خوشکەکانی‌و منداڵەکانی ئەوانە بەنێرو مێیانەوەو بەرەخوارتر، دایك‌و باوك لەگەڵ هەردوو پلەی یەکەم‌و دووەمدا دێن، لەراستیدا ئەو دووانە بەهەمان شێوەی ژن‌و مێرد لەپلەکاندا دانانرێن.

بەپێی ئەم پێوەرو ڕێو شوێنانە مافی گوێزرانەوە بۆ میراتگرانی پلە دوو ئەنجام دەدرێت:

١- ئەگەر دایك‌و باوك لەگەڵ لقەکانیان (براو خوشکەکانی هەڵسوکەوتکارو منداڵەکانیان) هاتن، ئەوا دایك‌و باوکەکە دەبنە بەشبەری لقەکانیان، وەك ئەوەی کوڕو کچ لقەکانی خۆیان بەشبەر بکەن لەکاتێکدا کەخۆیان لەژیاندا بن‌و، مافی گوێزرانەوەکە تەنها خۆیان دەگرێتەوەو بەیەکسانی دابەشی دەکەن.

| **میراتگرەکان:** | باوك | دایك | برا یان خوشك یان منداڵەکانیان |
|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ | ب |
| پشکەکان | ١ | ١ | هیچ |

٢- ئەگەر دایك‌و باوك یەکێکیان پێش مردنی هەڵسوکەوتکار مردو لق یان لقی لقی نەبوو، ئەوا هەموو پشکەکەی دەگواسترێتەوە بۆ ئەوەی دیکەیان کەلەژیاندایە، ئەمە ئەگەر ژن‌و مێرد یەکێکیان لەگەڵی نەهاتبوون، ئەگەر هاتبوو ئەوا بۆ مێرد یان ژن نیوەی پشکەکەیەو ئەوەی دیکە بۆ دایك‌و باوکەکە ئەوەیانە کەلەژیاندا ماوە.

٣- ئەگەر هەڵسوکەوتکار مردو پاش خۆی باوك یان دایك بەجێماو هیچ میراتگرێکی پلە یەکی نەبوو، مردووەکەش لەدایك‌و باوکەکە هیچ لق یان لقی لقی نەبوو، ئەوا مافی گوێزرانەوەکە تەنها بۆ ئەو دەبێت.

٤- ئەگەر هەڵسوکەوتکار مردو پاش خۆی مێرد یان ژن لەگەڵ باوکی یان دایکی بەجێماو هیچ میراتگرێکی پلە یەکی نەبوو، مردووەکەش لەهیچ کام لەدایكو باوکی لق یان لقی لقی نەبوو، ئەوا بۆ ژنو مێردەکە یەکێکیان نیوە هەیەو ئەوەی مایەوە بۆ دایك و باوکەکە ئەوەیانە کەلەژیاندایە.

| میراتگرەکان: | مێرد یان ژن | باوك یان دایك |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان: | ١ | ١ |

٥- ئەگەر باوكو دایکی هەڵسوکەوتکارەکە یەکێکیان پێش خۆی مردو لق یان لقی لقی هەبوو، ئەواپشکەکەی بەتەواوەتی دەگواسترێتەوە بۆی، ئەگەر ژنو مێرد یەکێکیان لەگەڵیدا هەبوون، ئەوا نیوەی بۆ هەیە.

| میراتگرەکان: | باوك | کوڕ یان کچی دایك کەمردووە |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان | ١ | ١ |

| میراتگرەکان: | ژن | دیكو کوڕ یان کچی باوك کەمردووە | |
|---|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | م | وەك یەك |
| پشکەکان | ١ | ١ | |

بنچینەی بابەتەکە (٢)ەو راست دەکرێتەوە بە(٤)، بۆ ژنەکە (٤/٢)و، بۆ دایکەکە (٤/١)و، بۆ ئەو لقەی مردووەکە کەلەباوکەوەیە (٤/١).

٦- ئەگەر دایكو باوکی هەڵسوکەوتکار مردن لەکاتێکدا ئەم لەژیاندا بوو، هەردووکیان یان یەکێکیان لقی هەبوو، ئەوا پشکەکەیان دەگواسترێتەوە بۆ لقەکەیان یان لقی یەکێکیان کەئەوانیش براو خوشکەکانی هەڵسوکەوتکارەکەن یان منداڵەکانیانن نێر بن یان مێ.

| میراتگرەکان: | برا | خوشك |
|---|---|---|
| پشکەدیاریکراوەکان: | ٢/١ | ٢/١ |
| پشکەکان | ١ | ١ |

**میراتگرەکان:** ژن خوشك یان برا

پشکەدیاریکراوەکان: ۲/۱ ۲/۱

**میراتگرەکان:** مێرد کوڕی برا. کچی خوشك

پشکەدیاریکراوەکان: ۲/۱ م بنچینەی بابەتەکە(۲)

پشکەکان ۲ ۱ ۱ راست دەکرێتەوە بە(٤)

۷- لقی هەرکەسێك کەمردووە پێش مردنی هەڵسوکەوتکار دەچێتە جێگەکەیو ئەو پشکەی ئەو ئەگەر لەژیاندا بمایە شایستەی بوو پاش مردنی هەڵسوکەوتکارەکە بەم دەدرێت.

**میراتگرەکان:** کوڕی (برا مردووەکە) کوڕی (خوشکە مردووەکە)

پشکەدیاریکراوەکان: ۲/۱ ۲/۱

پشکەکان ۱ ۱

**میراتگرەکان:** ژن کوڕی کچی

(خوشکە مردووەکە) (خوشکە مردووەکە)

پشکەدیاریکراوەکان: ۲/۱ م بنچینەی بابەتەکە ۲

پشکەکان: ٤/۲ ٤/۲ راست دەکرێتەوە لە٤

بۆ هەریەکەیان یەك ٤/۱

۸- لەوەی خرایە روو دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دایكو باوکی مردووەکە سێ حاڵەتیان هەیە:

أ- ئەگەر هەردووکیان کەسیان لەگەڵ نەهاتبوو ئەوا هەموو ماڵەکە (مافی گوێزرانەوەکە) دەبەن، ئەگەر بەتەنها یەکێکیشیان مابوو ئەوا هەمووی بەردەکەوێت.

ب- ئەگەر لەگەڵ لقی هەڵسوکەوتکارەکە یان لقی لقیدا هاتن، ئەوا شەش یەکیان بۆ هەیە بەیەکسانی لەنێوانیاندا بەش دەکرێتو، ئەوەی مایەوە

دەدرێتە لق یان لقی لق، ئەگەر تەنها یەکێکیشیان لەگەڵیان هات ئەوا بەتەنهاش هەر شەش یەکی بۆ هەیەو ئەوەی مایەوە بۆ ئەوانەی دیکەیە.

ت- ئەگەر لەگەڵ ژن و مێردا هاتن، ئەوا پاش بەشی ئەوان ئەرەی کەمایەوە بەریان دەکەوێت کەئەویش نیوەیە، نیوەی ئەوەی مایەوە بەیەکسانی لەنێوانیاندا بەش دەکرێت، ئەگەر یەکێکیشیان لەگەڵ ژن و مێرد یەکێکیاندا هات ئەوا سامانەکە لەنێوانیاندا وەک یەک دابەش دەکرێت[1].

رب زدني علماً وألحقني بالصالحين

[1] م١١٩٢ مەدەنی.

# سەرچاوەکان


١- قورئانی پیرۆزو تەفسیرەکانی.

٢- فەرموودەکانی پێغەمبەرو راڤەکانی.

٣- فقهی ئیسلامی:

*** فقهی جەعفەری:**

أ- الإختيار لتعليل المختار، للإمام أبي عبدالله محمد بن مودود بن محمود أبي الفضل مجدالدين الموصلي (ت-٦٨٣هـ)

ب- بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع للعلامة الفقيه علاء الدين ابي بكر بن مسعود الكاساني الحنفي (ت-٥٨٧هـ). مطبعة الإمام، القاهرة.

ج- رد المحتار لخاتمة المحققين محمدأمين الشهير بإبن عابدين، على الدر المختار شرح تنوير الأبصار. الطبعة الثانية- مطبعة مصطفى البابي ١٩٦٦م.

د- شرح فتح القدير للإمام كمال الدين محمد بن عبدالواحد السيواسي، ثم السكندري المعروف بابن الهمام الحنفي (ت-٦٨١هـ) على الهداية شرح بداية المبتدي لشيخ الإسلام برهان الدين علي بن أبي بكر المرغيناني (ت-٥٩٣هـ). مطبعة مصطفى البابي/ القاهرة.

*** فقهی مالیکی:**

أ- الخرشي على مختصر سيدي خليل مع هامشه حاشية الشيخ العدوي، دار صادر/ بيروت.

ب–المنتقى شرح الموطأ إمام دار الهجرة سيدنا الإمام مالك بن أنس (رحمه الله)، تأليف القاضي ابي الوليد سليمان بن خلف بن سعد بن أيوب بن وارث الباجي الأندلسي (٤٠٣–٤٩٤هـ). الطبعة الأولى ١٣٣١هـ. مطبعة السعادة/ القاهرة.

ج– بلغة السالك لأقرب المسالك للشيخ أحمد الصاوي وشرح الصغير للشهير سيدي أحمد الدردير، توزيع دار الفكر/ بيروت.

د– حاشية الدسوقي للشيخ محمد عرفة والشرح الكبير لأبي البركات سيدي أحمد الدردير، ط ، عيسى البابي الحلبي.

هـ– الشرح الصغير للقطب الشهير سيدي أجمد الدردير مع بلغة السالك لأقرب المسالك، للشيخ أحمد الصاوي، توزيع دار الفكر/ بيروت.

* فقهى شافيعى:

أ– المهذب للإمام أبي اسحاق ابراهيم بن علي بن يوسف الفيروز آبادي الشيرازي. مطبعة عيسى البابي.

ب– الأنوار لأعمال الأبرار للعالم الفاضل والإمام يوسف الأردبيلي/ مؤسسة الحلبي/ القاهرة.

ج– مغني المحتاج إلى معرفة معاني الفاظ المنهاج، شرح الشيخ محمد الشربيني الخطيب، على متن المنهاج لأبي زكريا يحيى بن شرف النووي. مطبعة مصطفى محمد/ القاهرة.

* فقهى حەنبەلى:

– المغني لأبن قدامة الإمام أبي محمد عبدالله بن أحمد بن محمد بن قدامة (ت ٦٣٠هـ) على مختصر أبي القاسم عمر بن حسين بن عبدالله بن أحمد الخرقي. نشر مكتبة الجمهورية العربية.

* فقهى جەعفەرى:

أ– كتاب الخلاف في الفقه للشيخ الإمام أبي جعفر محمد بن الحسن بن علي الطوسي. مطبعة تابان/ طهران.

ب- الروضة البهية شرح اللمعة الدمشقية للشهيد السعيد زين الدين الجبعي العاملي.

ج- ايضاح الفوائد شرح اشكالات القواعد، للشيخ أبي طالب محمد بن الحسن ابن يوسف الحلي، ط/١٣٨٩هـ.

*** فقهى زەيدى:** - التاج المذهب.

*** فقهى ئەبازى:**

- شرح النيل وشفاء العليل للشيخ محمد بن يوسف اطفيش، المطبعة السلفية.

*** فقهى زاهري:**

- المحلى للإمام أبي محمد علي بن أحمد بن سعيد بن حزم (ت-٤٥٦هـ) منشورات المكتب التجاري للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت.

**٤- ياساكانى بارى كەسيى:**

أ- قانون الأحوال الشخصية العراقي رقم (١٨٨) لسنة ١٩٥٩ وتعديلاته.

ب- قانون الوصية المصري رقم (٧١) لسنة ١٩٤٦ النافذ وشرحه للأستاذ محمد الحسيني حنفي.

ج- قانون الأحوال الشخصية السوري رقم (٣٤) لسنة ١٩٧٥ النافذ.

د- مجلة الأحوال الشخصية التونسية لسنة ١٩٥٦ النافذ.

هـ- مدونة الأحوال الشخصية المغربية لسنة ١٩٥٧ النافذ.

و- مشروع القانون العربي الموحد للأحوال الشخصية.

**٥- ياساكانى مەدەنى:**

أ- القانون المدني العراقي النافذ رقم (٤٠) لسنة ١٩٥١.

ب- مشروع القانون المدني العراقي الجديد.